# مکیافیللی

## سێبەری شەیتان لەسەر زەوی

## ژیاننامە ، مەدرەسە و کارەکانی بە کتێبی میرەوە



**و. خالید هەرکی**

# مکیافیللی

سێبەری شەیتان لەسەر زەوی

ژیاننامە ، مەدرەسە و کارەکانی بە کتێبی میرەوە

نوسینی : ئەحمەد ناسیف ، مەجدی کامل

وەرگێرانی : خالید هەرکی

## پێشەکی

نیکۆلای دی بیرناردۆ مکیافیللی، ئەو نوسەرو هزروانەی بۆ یەکەم جار ئەو راستیانە دەکاتە برواو هزری سیاسی کە لە ئەرزی واقع بونەتە رێنماو خەلکی پیادەیان دەکا بەلام دانیان پێدانانێ ، لە پێنا و وتنی ئەو راستیانە ، ئەو پیاوە بە پیاوێکی خۆپەرست وستەمکار وچاوچنۆک بۆ کورسیی دەسەلات دەناسرێ ، هەرکاتەی کەسێک لە پێناو مانەوەی یا گەیشتن بە کورسیی دەسەلات کارێکی نارەوا و نایاسایی ئەنجام دا ، بێ سێ و دوو دەڵێن تۆ کەسێکی مکیافیلیستی ، دیارە ئەو خەلکە هەمویان بەهەلەدا نەچونە ئەوەتا ئەم سیماو خەسلەتە بەهۆی ئەم گوتە بەناوبانگەی بەسەریەوە دەبێتە ماڵ کە لە کتێبی میر دا دەڵێ (ئامانج پاساوی رەفتارە ) واتە لە پێناو گەیشتن بە ئامانج ، جا هەر ئامانجێک بێت بەلام لێرە مەبەستی ئامانجی گەیشتن بە دەسەلاتە یا مانەوەی لەسەر دەسەلاتە، لەم پێناوەدا هەر رەفتار وکردەیەک ئەنجام بدەی ئامانجەکەت بۆت دەبێتە پاساوی بە شەرعیکردن و بە یاسایی کردنی  رەفتارەکانت ، لەم میانە کاری کوشتن و ستەمکاری، کاولکاری، نادادپەروەری، بەشێک دەبن لەو رەفتارانەی  گەیشتن بە ئامانج  بۆیان دەبێتە پاساو.

هەر بۆیە  بە دڵنیایەوە هەموو ئەوسەرکردانەی ئەمرۆ لە رۆژهەلاتی ناوەراست لەسەر دەسەلاتن ، کتێبەکەی میریان ئەزبەر کردوە، نەک جارێک بەلکو چەندین جار بە وردی خوێندویانەتەوەو جێبەجێی دەکەن ، بەلام بە ئاشکەرا نە بە نهێنی ، بەر لەوانیش پادشاو دکتاتۆرەکان ئەوانەی بە ستەم و زۆرداری حوکمیان بردوە بەرێوە ئەم کتێبەیان بە نهێنی خوێندۆتەوەو  خۆیان لە خەلک کردوە بە فریشتە ، لەکاتی کوشتنی هەردوو پادشای فەرەنسا هنریی سێیەم و هنریی چوارەم ئەم کتێبەیان لە گیرفاندا دۆزیوەتەوە ،هیتلەر دەڵێن هەموو شەوێ بەر لە نوستنی بەشێکی لەم کتێبە دەخوێندەوە و لە تەک پێخەوەکەی دادەنا ، مۆسۆلینی لە 1924 نامەی دکتۆراکەی لەسەر مکیافیللی بوە ، ناپۆلیۆن ئەم کتێبەی لە ناو کتێبخانەکەی خۆی لە ناو هەزار کتێبە بە نرخەکاندا داناوە ، ستالین ، فردریکی  مەزن پادشای بروسیاو ریشیلیۆ و  چەندین فەرماندە سەرکردەی دونیا ، بە هەمان شێوە خەلکانی

ئێمەش ئەم کتێبەیان بەدەست سەرکردەکان ولە ماڵی ئەوانیان بینیوە ، راستەوخۆ یا ناراستەوخۆبێ ئەم کتێبەی میر رێنماو یاسای پیادەپێکراویان بوە .
دەبێ ئەم کتێبە چی تیابێ لای هەندێک ئەوەندە رەواج و لای هەندێک بێ ئابروە؟
من دەڵێم ئەگەر مکیافیللی بروای بەم گوتانە هەبێ کە خۆی ووتویەتی و کردونی بە هزرو بیردۆزی سیاسی، دەکرێ بۆچونی دوەممان لا پەسند بێ، بەلام ئەگەر مەبەستی ناساندنی ئەو خەلکەو خەسلەتەکانی پادشاو دەسەلاتدار بێ ئەوە واقعێکی پێ ناساندوین کە مەرج نیە پێمان خۆش بێ بەلام بونی هەیە ، بەلکو ئەوکات بۆ خەلکە ئاسایی وبێدەسەلاتەکە سودی هەبێ، بۆ ئەوەی لەو مەترسی و خەسلەتە قێزەوەنانە بە ئاگابێ کە دەبنە هۆکاری گەیشتن بە دەسەلات وپێپەست کردنی مافی زۆرینە و چەوساندنەوەیاون. لەو حالەتەدا دەڵێین بۆچونی یەکەم مان پەسندە، ئەگەر بۆ ئەو مەبەست بێ منیش دەڵێم خوێندنەوەی ئەم کتێبەی میر بۆ خەلکە چەوساوە و هاولاتیان پێوسیتە، تا لەو رەفتارانە شارەزابن و بزانین دەسەلاتدار حاکم یا پادشا چۆن دەبێتە حاکم وپادشاو لە دەسەلات دەمێنێتەوە ؟ نەک بۆ جێبەجێ کردنی هزرو بیردۆزەکانی بەلکو بۆ وەرگرتنی پەند لەم رەفتارانە .
لەم کتێبەدا کە پوختەی بەرهەم و هزرو بیردۆزەکانی مکیافیللی دەخاتە روو لەگەل کورتەیەک لە ژیاننامەی ، بە بەراورد کردنی هزر و بۆچونەکانی لەگەل هزرو بۆچونی زاناو هزروانانی بواری سیاسەت ومێژوو سەربازی چ ئەوانەی لەو سەردەم ژیاون چ ئەوانەی دوای ئەو هاتون و تانەیان لە بۆچونەکانی داوە یا بروایان پێی هێناوەو لەسەر هەمان رێچکە نوسیویانە .
کاتێک ئەم کتێبە وەردەگێرمە سەر زمانی کوردی مەبەستم ئەوە نیە نەوەی نوێمان بەم مەدرەسەیە پەروەردە بکەم و نیشانیان بدەم کە ئەم رێچکە هزرە رێچکەیەکی باشە بۆخزمەتکردن بە نەتەوەو گەیشتن بە پۆستی بەرپرسیارێتیی باڵا ، نەخێر بەلکو زیاتر مەبەستم ئاشنا کردنی رۆلەی داهاتوی میللەتەکەمە بە حیلەو چەواشەکاری ئەو بەرپرسانەی لەم رێگەیەوە بە پۆستی بەرپرسیارێتی بالا گەیشتون ،بە سیماو روخسار لەبەر چاومان فریشتەو سومبولی نەتەوایەتین ،پێیان بڵێم، مەرج نیە وێنەکان راست بن و خوێندنەوەکەمان لە جێی خۆیان بن. چونکە لە دیوێکی تری وێنەکان دەکرێ وێنەی تر هەبن مەبەست وئارەزوی تر حەشار درابن کە بە پێچەوانەی دیمەنە دیارەکانبن .

خالید هەرکی ..هەولێر / 31/ئابی 2014
Email : xalidherki@serben.com FB : Xalid Herki

**پێشکەشە**

**بەوکەسانەی بەدەستی سەرکردەکانیان، بونە قوربانیی سیاسەتی ئەم کتێبە،**

**بەشی یەکەم:**

## مکیافیللی .. کاروانی ژیان و پێگەیشتنی

---------------------------

نیکۆلای دی بیرناردۆ مکیافیللی لە 3ی ئایاری 1469 لە شاری فلۆرەنسا لە ناوەراستی ئیتالیا لە دایک بوە، رەچەلەکی بۆ خانەوادەیەکی مێژین و ناوداری ئیتالیا دەگەرێتەوە بەناوی( تۆسکانی) ، سەرجەم ئەندامانی خانەوادەی لە پلەو پۆستی بالای سیاسەت لە فلۆرەنسا کاریان کردوە، بەم هۆیەوە شوێنە هەستیارەکان و بنکە بریاربەدەستەکانیان بینیوە، بۆیە هەردەم لە نێو بینەو بردەی سیاسەتدا بونە ، تەنانەت خانەوادەی باپیرەشی بەهۆی کاری سیاسیەوە لە ساڵی 1260 لەو شارە دورخراونەتەوە، یەکێک لە نەوەکانی ئەو خانەوادەیەش ژیانی لە زیندان بردۆتەسەر ، بەر لە هاتنی مکیافیللی بۆ دونیا باری ئابوری ئەو خانەوادەیە نەختێک تێک دەچێ و ئەمەش کاردەکاتە سەر رەوشتەکانی مکیافیللی، ئەوەتا لە داهاتوو ئەم کارتێکردنە بەدی دەکرێ .

مکیافیلی له باوەشی سیاسەت و رەوشەنبیریدا پەروەردە دەکرێ و گەورە دەبێ ، باوکی پارێزەرێکی ناسراو بوو ، دایکی شیعری دە هۆنیەوە ، هەرچەندە زانیاریی تەواو لەسەر ژیاننامەی منداڵێتیی ئەم پیاوەمان لەبەردەستدا نیە تا لە روی رەوشەنبیرییەوە تیشکێک بخەینە سەری ، بەلام ئەوە دەزانین کە بۆ ئەو سەردەم پلەیەکی باشی لە خوێندن بریوەو زانیاری و زانستێکی باشی وەدەست هێناوە، ئەوەتا یاساو مێژوو دەخوێنێ و تەواویان دەکا ، لە تەمەنی حەوت سالییدا فێری لاتینی دەبێ کە ئەوسا زمانی زانست و رەوشەنبیری بوە ، لە سەرەتای گەنجێتیدا مەیلی رەوشەنبیریی کۆن و نوێی هەبوە ، بۆیە گوتارەکانی گوتاربێژی ناسراوی رۆمانی (شیشرۆن) (43 پێش زاینی) هەروەها کتێبەکانی ئەرستۆ لەگەل ئەو نوسین و کتێبانەی پێشەنگی رێنسانسن ((دانتی) 1265.1321 )) و (بترارک) 1374..1304)) دەخوێنێتەوە .

بەلام لە راستیدا مەدرەسەی مکیافیللی، شەقامەکانی فلۆرەنسا بوو کە چەندین زاناو بلیمەتی بەو دونیایە بەخشی لە نمونەی (دانتی، لیوناردو داڤنشی ، مایکل ئەنجللۆ) و هیتریش.

ئەم شارە ئەو جیاوازیەی هەیە لەگەڵ شارەکانی تری ئیتالیا کە خاوەنی چالاکیی سیاسیی بەرفراوان بوە ، تەنها نوخبە تێیدا بەشدار نەبوە بەلکو سەرجەم خەلکەکە لەو چالاکیانە بەشدار بونە هەروەکو بوندقیە وابوە، بە گوتەی مێژوو نوسێک:

(لەم شارە سەرجەم خەلکەکە لە کاری سیاسەتدا بەشدارن ) . هەرواش بوو شەقامەکانی ئەم شارە چەندین روداوی سیاسیی یەک لە داوی یەک بەخۆوە بینی بوو کە لە بیری ئەو خەلکە نەدەچونە دەر، رۆژانە لەسەر زمانیان باس دەکران.

**رەوشتی مکیافیللی**

------------

خاوەنی جوتێک چاوی بریقەداری دوربین بوو ، بەژن و باڵایەکی مامناوەند و جوتە لێوێکی تەنک بە پێکەنینەکانی ئەم لێوانەی هەلگێر و وەرگێر دەکردن ، ئا بەم شێوەیە سەرچاوەکان پێناسەی سیماو شێوازی دەرەوەی مکیافیللی دەکەن ، ئەمەش پشت بە گوتەی ئەو کەسانە بەستراوە کە لەو سەردەم لەگەڵیدا ژیاون، لەگەل ئەو تابلۆو پۆستەرانەی لە وێنەی ئەو کێشراون یا نیگار کێشیان بۆ کراوە ،

لە پشت ئەم دیمەنە دونیایەک لە نەریت ورەوشتی شاراوە هەبون ، مکیافیللی بەوە ناسرابوو کە بەخێرا راستیەکان دەستنیشان دەکا ودەیان ناسێتەوە، کارتێکردنی خێرای لەسەر گوێگرانی هەبوەو رەوانبێژی و خۆش گوزەری لە سیفاتەکانی بونە ، سازانی لەگەل هەموو توێژەکان هەر لە دارفرۆشەکانی گوند و ئەمیری ئیتالیاوە تا دەگاتە پادشاکانی ئەوروپا هەبوە، هەموو هەول و تێکۆشانی بۆ ئەوە بوون تا لە بەر چاوی خەلک خۆشەویست و ئێسک سوک بێ .

بۆ دۆستایەتی وهەڤالانی پر خۆشەویستی ودلسۆز بوو، ئەوەی لە توانایدا بوایە بۆ ئەوانی دەکرد ، لە ژیانیدا زۆر لە کاری توند و تیژییەوە دوور بوو، دلی بە هەموو جۆرە قوربانیەکەوە بو، ئەمە بە رونی لە نامەکانیدا دەردەکەون ، لەروی راگەیاندنی بەناوبانگیەوە، کەسێک لە سەردەمی خۆی لە روی بلیمەتی وبەناوبانگیەوە پێی نەگەیشت .

لەگەڵ ئەمانە هەمویدا، کەسێکی راراو دوودڵ و بەگومان بوو ، جارێک خۆی پێناسەی خۆی دەکا ودەڵێ:

( بەهۆی ئەوەی بە هەژاری لەدایک بوم ، بەر لەوەی فێری خۆشگوزەران بم فێری پێویستی بووم ) ئەوەتا خۆشگوزەران بە تێگەیشتنێکی ئیتالیانە پێناسە دەکا ، ئەو زۆر ژیانی خۆش دەویست ، کەسێکی دەست کراوە بوو قەرس نەبوو ، ئەوەی لەدەستیدا بوایە لە خۆی و برادەرانی خەرج دەکرد.

هەرچەندە شەیدای ژن و ئاشقی جوانی بوو بەلام هیچ کاتێک لە داب و نەریتەکان دەرنەدەچوو ، هیچ کاتێک رێگەی بە هیچ کەسێک نەدەدا سیستەمی ژیانی خێزانیی بشێوێنێ، خوشەویستیەکی جوانی بەسەر مندالەکانیدا رەنگپۆش کردبوو، هەروەها بۆ هاوسەرەکەشی ریز و خۆشەویستی و خاوەندارێتی و وەفاداری تایبەتیی دەنواند ، ئەم خۆشەویستی و ئومێدانەی بەتەواوەتی لەگەل بلیمەتی وزیرەکی و دلسۆزیی بۆکارەکانی دەهاتنەوە .

ئەمانە بونە مایەی ئەوەی مکیافیللی ببێتە کەسێکی نامۆ لە نێو ئەو کۆمەلگایەی، پاشماوەی هزری دەرەبەگایەتیی ئەوسادا بەتایبەتی تاکرەوی و دوزمانیی ئەو سەردەم کە بەسەر هزری زۆربەی هزرمەند وبیرمەندانی ئەوسادا زاڵ بوو سیمای خەلکو یاسای ژیان بونن.

خەلکانی نەفس نزم چاویان بریبوە پێگەو توانای، بۆیە هەردەم لە رێگەی زمانلێدان و دروستکردنی کێشە سەرئێشەیان بۆ دروست دەکرد، زمانیان لێی دەداو چاویان بریبوە تواناکانی، کەسێک لە برادەرو دۆستانی بەدلسۆزی بەدەوریەوە نەمابو، بەتایبەت ئەوکاتەی کە دوردەخرێتەوە بۆی دەردەکەوێ کە کەسێکی ئەوتۆ

دلسۆزی نیە ، تەنها ئەوانەی وەکو ئەو بیردەکەنەوە نەبن ،یا ئەوانەی رەوشتی بەرزیان رێگەیان پێنادا لە ئاست بیرکردنەوەکانیاندا نەبن، لە سەروی هەمویان مێژوونوس کویچاردینی و دیپلۆماتکاری فلۆرەنسی فرانسیسکۆ فیتۆری، هەروەکو ا.ک.جیفیلیکۆ ی مێژوونوس سەبارەت بە مکیافیللی دەڵێ :
خۆی تاقانە بوو لەم بوارە ، بەلام تاقانەیەکی لەوان بەرزتر .
ئەوانەی چاویان بریبوە مکیافیللی سودیان لە راشکاویی ئەو دەکرد بۆ ناوزراندن وشکاندنی پێگەی ، ئەوەی راستیش بێ ئەو نەیدەتوانی راوبۆچونەکانی بەرانبەر بە کەسانی تر بشارێتەوە ، سیماو روخسارە پێکەنیناویەکانی هەردەم دەربری بێگەردی و دلپاکی بون ، بۆیە لەم روەوە ئەو بە تاق و تەنیا و جیاواز بوو وەکو هاو شێوەکانی نەبوو ، لەبەردەم بەرپرسان بە چاوچنۆکی و بە سوک و رسوایی بناورێتەوە یا ماستاویان بۆ سارد کاتەوە ، ئەوکاتەی ویستی ئەوجۆرە کەسانە رسوا بکا کە خۆیان بە رکابەری ئەو دەبینی و لە راستیشدا کەسانی نزم وبێ ئابروو بوون ، دەنوسێ دەڵێ :
( ماوەیەکی زۆرە ئەوە نالێم کە بیری لێ دەکەمەوە ، هەرگیزیش بیر لەوە ناکەمەوە کە دەیلێم ، ئەگەر ئەمە رویدا جارێک لە جاران راستی بلێم دەبێ بە چەند درۆو دەلەسەیەک پەردە پۆشیان بکەم نەبادا بگاتەوە دەست پیاوە مەزنەکان) .
بە گالتەجاریان تاوانبار کرد کە لەراستیدا بەس وا نەبوو ، بە گوێرەی ناساندنی یەکێک لە مێژوو واسان ، تەنها دەربرینی بروابونی ئیماندارێکە بەو روالەتەی کە بروای پێهەیە ، ئەو هیچی لە ناخدا حەشار نەداوە ئەگەر هەر شتێکیشی حەشاردابێ ئەوا جوانی و بێگەردیی حەشارداوە بۆیە ئەو نیانی و باشیەی کە هەیەتی لای خەلک بە راستی نابینرێ ).
هەردەم ئەوانەی چاویان بە بەرهەمو تواناکانی مکیافیللی هەڵنەهاتوە پەنایان بۆ شێوازی نابەجێ و دور لە نەریتەکان بردوە، بۆئەوەی کەسایەتیی مکیافیللی پێ بشکێنن و ناوی پێبزرێنن . بە چلێس و چاوبرسی ناویان دەبرد چونکە بۆ مارەکردنی ماریا کورسینی هاوسەری پارەی بەخشی بوو ، چونکە ماریا ژنێکی خاوەن سامان و دەولەمەند بوە، ئەوەیان بۆ بۆ هەلبەستبوو کە چاوی لە سامانی ئەو بوە بۆیە ئەوەندە پارەی داوە تا شوی پێبکا ، ئەمە لە کاتێکدا بوو کە خۆشەویستی و وەفاداری مکیافیلی و ماریا گەیشتبوە ئاستێک وەکو نمونە ناویان دەبر، تەنانەت بەر لە مردنی، مکیافیللی وەسیەت دەکا بەشێکی زۆر لە سامانی بدرێتە ماریای هاوسەری، دیسان لە نامەکانیدا ئەوە دەردەکەوێ کە مکیافیللی لەکاتی سەفەردا چەند بە پەرۆش دەبێ زوو بگەرێتەوە بەتایبەت لەبەر دیدەنی

ماریای هاوسەری کە گەلێک جار وەکو ناوی نازاندن بە ( فەرماندەمان ) ناوی دەبا .
سەرەرای ئەوسەرکەوتنانەی بە پراکتیکی وەدەستی هێناون بەتایبەتی لە بواری دبلۆماسی ، هەندێک کەس ویستویانە گومان بخەنە سەر سەرکەوتنەکانی ، بەلام ئەم هەولانەی بۆ شاشکردنی کارەکانی دران بێ هودە بوون .
ئەم هەلوێستە ناجوامێریانەی لە لایەن هەندێک لە هاوەڵ وناسیاوانیەوە وەرگیران ، لەگەل هەندێک لە کێشە تایبەتیەکانی بونە مایەی پەیدا بونی رەشبینی بۆ مکیافیللی . بە بروای ئەو چاوتێبرین وحەسادەت حەز و رەفتارێکی جێماوەی مرۆڤە، لەگەل سروشتی مرۆڤ سەریان هەڵداوە، رەوشتی مرۆڤە سوکایەتی بە کارەکانی یەکتر بکەن ، مکیافیللی خۆی لەم جۆرە کەسانە نەبوە بەلام ئەم رەشبینیە وای لێ کردوە وا بیر بکاتەوە، ئەو تەنها لە پێناو چاکە گەیاندن بە گشت کەسێک، هەوڵی داوەو تێکۆشاوە.
بۆیە دەبینین مێژوو راست دەلێ و حوکمێکی راست دەدا کاتێ چاوچنۆکەکانی دەورو بەری مکیافیلی ئەستێرەیان لە ئاسمان دەکوژێتەوەو تەنها ئەستێرەی مکیافیللی لە ئاسمانی ئیتالیا دەدرەوشێتەوە و ناوی لە بۆنە ومەحافلە سیاسیەکان بە زیندویی دەمێنێتەوە ، ئەوەتا دوای مردنیشی تا ئەمرۆ لەگۆرەکەیدا حوکم و دەسەلاتی بەسەر سیاسەتەکاندا دەرواو راو بۆچونەکانی خۆی بەسەر سیاسەتمەداراندا دەسەپێنێ و ئەوانەی برسیی کوریی دەسەلاتن عەودالی هزر وبیردۆزەکانینە .
سەرەرای تواناو هزرە کاریگەریەکانی ، مکیافیللی لە زووەختانێکی گونجاودا شوێنی شایستەی خۆی لە نێوەندی سیاسیی فلۆرەنسا پێ نەگیرا ، هۆکارەکەشی بۆئەوە دەگەرێتەوە کە ئەو فاکتەر و ئامرازی گونجاوی نەبوە پێی بگاتە سەر شانۆی روداوەکان ، ئەوکاتەی پێیشی دەگات تەمەنی دەبێتە 29 سالان، دیارە بەر لەو کەسانی تر پێیگەیشتون واتە ئەو نەختێک دوا کەوتوە.
لەگەڵ ئەمەشدا مکیافیللی توانیویەتی بە ئاسایی پێگەیەک لەم میانە بۆخۆی وەدەست بێنێو دواتر ئەم پێگەیە توند بکاو خۆی بچەسپێنێ و بەخێرایی بەسەر رەوشەکەدا بسەپێنی ، هەروەکو خۆی باس لە خۆی دەکا و دەڵێ:
( ئەم پیاوە وا دەرکەوتوە کە نە باس لە دروست کردنی قوماش بکا نەلە رستن و چنین نەلە قازانج و زیان ، بەلکوو تەنها باس لەیەک بابەت بکا ئەویش پرسەکانی دەولەت بن )، بۆیە لەکاتی راگەیاندنی سیستەمی کۆماری لە فلۆرەنسا پلەی سکرتێری ئەنجومەنی بیست کەسیی پێدەسپێرن لە حوزەیرانی 1498 تواناو

بەهرەمەندی وبلیمەتی خۆی لە پۆستە وەدەر دەخا بە شێوەیەک کەسێک لە هاوەڵەکانی بە ئاستی ناگەن .
مکیافیللی بەر لە وەرگرتنی ئەو پۆستەی نە نوسراوی بۆ سەروی خۆی بەرزکردبۆوە ،نە راپۆرتی تایبەتیی نوسیبوو، بەلام لەگەڵ ئەوەشدا دارشتن ونوسین و رێنوسی یەکەم نوسراوی وەکو ئەوە وابوو کە خاوەنی ئەزمونێکی دورو درێژ بوبێ لەم بوارە ، کەچی ئەمە یەکەم جاری بوو دەست لەم کارە بدا .
وەنەبێ ئەرکە پێسپێردراوەکەی ئاستێکی نزمی هەبێ، چونکە ئەنجومەنە بیست کەسیەکە سەرپەرشتی کاروباری سەربازی و پەیوەندیەکانی دەرەوەی کۆماریی دەکرد، بەتایبەت لەوکاتیشدا ولات بە قۆناغێکی ناسک وهەستیار تێدەپەری بەهۆی بەگژیەکداچونی پەیوەندیەکانی نێوان کۆماری فلۆرەنساو حکومەتی شارەکانی ئیتالیا ، دیارە بەهۆی چاوتێبرینی دەولەتان لە خاک و سامانی یەکتر لەو سەردەم چەند بەیەکداچون و روبەروبونەوە لە نێوان ئیسپانیاو فرەنسا ، لەسەر کێشە نەتەوایەتیەکان رویان دا ، ئەوکاتەی بیرۆ سودورینی ، یەکێک لە هەڤالانی مکیافیللی دەبێتە سەرۆکی ئەنجومەنەکان زیاتر پێگەی بەهێز دەبێ و سیاسەتەکانی مکیافیللی پیادە دەکرێن و دەبێتە یەکێک لە دارێژەرانی سیاسەتی کۆمار.
مکیافیللی ماوەی پانزە سال لەم کارەی بەردەوام دەبێ، لەم ماوەیەدا بە 24 بیست وچوار نێردەی دبلۆماسی هەلساوە ، لەم رێگەیەوە دەرفەتی ئەوەی بۆ دەرەخسێ پەیوەندیەکی باش لەگەل کەسایەتیە ئیتالی و ئەوروپیەکان ببەستێ لەوانە پاپا و پادشای فرەنسا و ئیمپراتۆری ئیمپراتۆریەتی رۆمانیی پیرۆز .
لەم میانە و بەهۆی ئەم سەردانی و نێردەیانە مکیافیللی شارەزاییەکی باشی لە بواری پەیوەندیەکان، نهێنیە شاراوەکانی نێوان دەولەتان پەیدا کرد، گەلێک شتی شاراوەشی لە بواری حوکمرانی بۆ دەرکەوت و فێری بوو ،هەر بەتەنیایی چوار جار سەردانی کۆشکی فرەنسی دەکات ، چەند مانگێکی خایاند تا لە داب و نەریتی فرەنسیەکان بگاو لە تەلەو فرت و فێلەکانی کۆشکی فەرەنسی شارەزابێ ، ئەمەو چەندین ئەزمونی تر کە نوسینەکانی خۆی پێ دەولەمەند کرد ، هەر لە میانی ئەو سەفەرانەیدا مکیافیللی گەیشتە ئەو راستیە کە دوو شت هەن دەبێ لە ئاستیان بوەستێ ئەوانیش ئومێد و گەیشتن بە راستیەکانە .
ساڵی 1512 رژێمی حوکم لە فلۆرەنسا دەروخێ ، بە پشتیوانی سوپای ئیسپانیی داگیرکار خانەوادەی (میدیچی) دەگەرێتەوە سەر حوکم، بەهۆیەوە (سودورینی) دەست بەسەر سامانەکانی عوسمانیدا دەگرێ و پیاوەکانی تری حوکمرانیش

رادەکەن ، دیارە مکیافیللی زۆر هەوڵ دەدا تا رژێمی حوکم نەروخێ بەلام هەولەکان بە فیرۆ دەچن.
مکیافیللی دوای روخانی رژێم لە کار دوردەخرێتەوە، لە سەرەتای ساڵی 1523 بەتۆمەتی بەشداری لە پیلانی سەرنگون کردنی رژێمی حوکمی میدیچی تاوانبار دەکرێ و زیندانیی دەکەن، ئەو ماوەی لە زینداندا دەبێ شەش جاران روبەروی ئازار وئەشکەنجەیەکی زۆر دەکرێتەوە ، تا ئەوکاتەی پاپا میدیچیی نوێ (لیو ی دەیەم) لێبوردنێکی بۆ دەردەکاو ئازاد دەکرێ ، ئیتر مکیافیللی روو لە شاری سان کازینۆ دەکا کە دەکەوێتە نزیک فلۆرەنسا ، لەوێ ماوەی خانەنشینی خۆی بە نوسین بەسەر دەبا .
لە نامەیەکیدا بۆ (فرانسیسکۆ فیتوری) کە لە بەرواری سیانزەی سەپتەمبەری 1513 نوسراوە ، بە شێوەیەکی سەرنج راکێش مکیافیللی باس لە و ژیانە دەکا کە لەو ماوەیە بەسەری بردوە ، دوای ئەوەی مکیافیللی هۆکاری نوسینەوەی کتێبی (میر) لە ونامەیە باس لێوەدەکا دێتە سەر ژیانی تایبەتی خۆی و خانەوادە و دراوسێکانی ، دەنوسێ و دەڵێ :
کاتێک ئێوارە دادێ دەگەرێمەوە ماڵ و دەچمە ژوری نوسینگە کەم ، دوای ئەوەی جلە لادێیانیەکەم دادەکەنم کە بە خۆڵ و خاشاک داپۆشراوە ، جلی پادشایەتی وپێشوازی دەکەمە بەرم ، بەم شێوەیە شێوازێکی جوان و پۆشتە دەپۆشم ئینجا دەچمە نوسینگەکەم تا لەتەک هەڤالانم ئەوانەی بە کتێبەکانیان کتێبخانەیان دەولەمەند کردوم ، دادەنیشم ، تا بە سیمایەکی شایەستە بێمە بەرچاو، بەمشێوەیە چاوپێکەوتنیان لەگەڵدا دەکەم و دەست دەکەم بەو خواردنەی کە تەنها بۆ من ئامادە کراوە .منیش بێ دودڵی روبەرویان دەبم و پرسیار بارانیان دەکەم لەسەر چۆنیەتی گوزەران وبەرێوە چونی کارەکانیان ، ئاوەها بۆ ماوەی چوارساڵ دور دەبم لە هیچ مەترسی ودودڵی ودڵەراوکێیەک، بێ سێ و دوو پرسیار لە هەموو شتێک دەکەم بێ ئەوەی بیر لە هیچ ترس و مردنێک بکەمەوە.
لە گەورەیی ئەو زانایانە دەحەپەسێم، چونکە (دانتی) دەڵێ ( ئەو زانستەی لە رێگەی فێربونەوە وەریدەگری، لای فێرخواز دەمێنێتەوە ) گەلێک وتەو نوسینی بەنرخم لەم چاوپێکەوتنانە وەرگرتن و بۆ نوسینەوەی کتێبەکانم سودم لێیان وەرگرت، لەم میانە کتێبی ( میرنشینەکان)م لەم زانیاریانە دانا . بۆیە هەوڵ و تەقەلاکانم لەم بوارە چر کردنەوە ، لە هەموو پرسەکانی میرنشینەکانم کۆڵیەوە، بۆچی دامەزراون؟ بۆ لەناو دەچن؟ بەرێوە بردنیان چۆن دەبێ ؟ .

بەلام سەبارەت بە کتێبی (میر) کتێبێکی نوێیە ، دڵنیام جێی برواو دلخۆشی ئێوە دەبێ ، بۆیە ئەم کتێبەم پێشکەش بە جەنابی (جۆلیانۆ) کردوە ئێستا لە ژێر پاکسازی و گولبژێریدایە پاش ئەوەی کە تەواو دەبێ (فیلیبو کازافتشیو) بۆی دەنێرێ .
کتێبی (میر) بەر لەوەی ئەم سەقامگیریە بەخۆوە ببینێ، بە چەندین گۆرانکاریدا تێدەپەرێ ، بۆ هەر هۆیەک بێ ئەم کتێبە کرایە دیاری بۆ (ئەللورنزو ئال دی مدیچی) لەگەڵ ئەوەی کە مکیافیللی خۆی ئەم پرسەی لەگەل کازافیچیو باس کردوە کە ئایا خۆی بۆی بەرێ یا ئەو ؟ ، تا ئێستا رون نەبۆتەوە (لورانز) ئەم کتێبەی بەدەست گەیشتوە یان نا ؟ یا تەنانەت خوێندویەتیەوە ؟ ئەوەی رونە ئەوەیە کە پەنای بۆ تواناکانی مکیافیللی نەبردوە و مکیافیللیش خۆی ئەم پەرتوکەی بلاونەکردۆتەوە ، لەگەڵ ئەوەشدا تائێستا یەکلا نەبۆتەوە ئاخۆ ئەم کتێبە دەستکاری کراوە یان نا؟ بەلام بە دڵنیاییەوە دزراوە.
مکیافیللی بەم چەند ووشانە کۆتایی بە نامەکەی دەهێنێ کە بۆ (فتوری) دەنوسێ :
(سەبارەت بەم کتێبە بچوکە ،خوێنەر کاتێک دەیخوێنێتەوە بۆی دەردەکەوێ کە من لە ماوەی ئەو پانزە سالەی لە باوەش پادشاکانم بردۆتە سەر، لە بواری سیاسەت و بەرێوە بردنی دەولەتدا درێغیم نەکردوەو تەمبەلیش نەبومە)
بەرلەوەی مکیافیللی لە نوسینی کتێبی (میر ) تەواو بێ دەستی لە باس وخواستەکانی دەیەی یەکەمی (تایتۆس لیفیۆس) وەرداوە، کە دەبێ هاوکات لەگەل کتێبەکەی میر بخوێندرێتەوە ، بەم شێوەیە لە جینۆ بە نوسینی کتێبەکانیەوە خەریک دەبێ تا سالی 1518 تا ئەوکاتەی ئەرکی چاودێریکردنی هەندێک بازرگانیی پێدەسپێرن ، لە ساڵی 1519حوکمرانە فلۆرەنسیەکانی مەدیچیون دەسەلاتی سیاسیان بە هاولاتیەکلنیان دا ، ئیتر بەپێی دەستوری نوێ مکیافیللی و هەندێکی تر لە کاتی هێنانەوەی ئەنجومەنی مەزن دەبنە راوێژکار .
لە ساڵی 1520 مکیافیللی دەخزێتەوە ناو کۆمەلگای ئەدەبیی فلۆرەنسا ، ئەمە ئەو سالە دەبێتە سەرەتای بەرهەمهێنانی کتێبی (جەنگ) ، لە داوایەکدا کاردینال دی میچی داوا لە مکیافیللی دەکا کتێبێک لەسەر مێژووی فلۆرەنسا بنوسێ ، بەهۆیەوە تا ساڵی 1525 بەم ئەرکەوە خەریک دەبێ .
کاتێک لە نوسینەوەی کتێبی مێژووی فلۆرەنسا تەواو دەبێ ، هەلدەستێ بە بردنی بۆ خزمەت پاپا جولیو دی میچی کە بە پاپا (کیلنت ی حەوتەم) ناسرابوو ، ئەم کتێبەشی پێشکەش بە سەرلوتکەی خانەوادەی میچی کردبو ، لەهەمان ساڵ شەرێک لە بافیا روو دەدا ، هەموو سامان و مومتەلەکاتی فەرەنسا لە ئیتالیا

تێكشكێندراو لەناو چوو (فرانسیس ی یەكەم بە دیلی گیرا كەوتە ژێر دەست و دلۆڤالی چارلزی پێنجەم ، بەهۆیەوە میدچیەكان دووبارە لە فلۆرەنسا دەركران ، ئەوكات مكیافیللی لە فلۆرەنسا نەبوو بەلام زۆر بە خێرایی هەولی گەرانەوەی دا بۆ ئەوەی پۆستەكەی وەكوو راوێژكار بپارێزێ ، بەلام بەگەیشتی كت و پر نەخۆش دەكەوێ و بەهۆیەوە لە 1527/6/22 گیان لەدەست دەدا.

## كتێب و دانەر ... قەدەغەن !

----------------------

كتێبی (میر)ی مكیافیللی بە رەزامەندی پاپا كلیمەنتی حەوتەم بە جوانترین ورازاوەترین كتێبی سەدەی شانزەهەم و بەتایبەتیش هی ساڵی 1531 دادەنرێ، لەكاتی دەرچونی هەركتێبێكی مكیافیللی چ لە ئیتالیا یا لە فرەنسا یا ئەلمانیا یا ئیسپانیا یا بورتوگال وبەریتانیا ، هەرایەک دروست دەبوو كە پرۆتستانەكان تیایدا بەشدار دەبون ، ئەمە بوە هۆی ئەوەی لە ساڵی 1559 سەرجەم كتێبەكانی مكیافیللی بخرێنە لیستی كتێبە قەدەغەكراوەكانەوە ، دیارە ئەمەش لە ئەنجامی لێتێنەگەیشتن لە كتێبەكانەوە دێ، هەر ئەم بریارەش بوە مایەی ئەوەی دادگا بریار لەسەر پشكنین و سوتاندنی ئەو كتێبانە بداو دواتریش كۆمەلگای (ترنت ئەلكسی) یش سەبارەت بە كتێبەكانی هەمان هەنگاو بنێ .

بەلام بۆ رەتكردنەوەو قەدەغەكردنی بەرهەمەكانی مكیافیللی پاساوی خۆیان هەبون ، چونكە كتێب وا بەئاسانی ناخرێتە لیستی قەدەغەكراوەكانەوە ، تەنها بە بونی هەندێک نوسینی دژ بە داب و نەریت و ئاین نابێتە مایەی قەدەغەكردنی كتێب و كتێبەكانی نوسەر بەگشتی ،بەلام دیارە كە ئەو كتێبانە هەندێک جار بەلای ململانێ و ناكۆكە كانیشدا دەچن ، خوێندنەوەیان ئازار و ئاژاوە بەدوای خۆیدا دێنێ ، وا بلاو بۆوە كە مەبەستی مكیافیللی لە نوسینی ئەم كتێبانە بەتایبەتی كتێبی (میر) دیاری كردنی شێوازو رێنما بۆ پادشاو حوكمرانەكانە، چۆنیەتی دەستگرتن بە

جلەوی دەسەلات وکۆنترۆلکردنی خەلکی چەوساوە و هەژاری میلەتەکەیان و حوکمرانی کردنیان بە زەبری ئاگر وئاسن و زۆرەملێ، ئەم کتێبە بریتی بوو لە رێنماو یاسای حوکمرانی کە چۆن بتوانن جێ پێکانیان بچەسپێنن؟ چۆن دەتوانن بەسەر خەلکدا زاڵبن؟ بەلام لەراستیدا ئەمە هەموی راست نیە ئەم تێگەیشتنە هەندێکیان بە شێوەیەکی تر لێکدانەوەی بۆ دەکرێ کە سودی بۆ لایەنێک هەیە، ئەویش ئەوەیە کە زۆرلە حاکم و دەسەلاتدارانی ئەوسەردەم و دواتر سودیان لەم کتێبانە وەرگرتوەو لێی فێربونە ، چۆن بتوانن خزمەت بە نیشتمانەکەیان بکەن لەوانە پادشای ئیسپانیا (شارلی پێنجەم) و (کاترین دی میش) ی هاوسەری هنریی دووەمی پادشای فەرەنسا و وەزیرەکانیان کە سۆزی زۆریان بۆ ئەم کتێبە هەبوو، هەرئەوان بون هانی چاپکردن و بلاوکردنەوەیان دا کە بەهۆیەوە لە سەرتاپای ولات بلاوکرایەوە .

دەبێ ئەمەش بلێێن کە گەلێک لەو حاکمە ستەمکارانەی بە زەبری ئاگر و ئاسن حوکمرانیان دەکرد سودیان لەم کتێبەی(میر) وەرگرتوە ، لەوکاتەی (توماس کۆجەر) کە لە هەرە گەورە وەزیرەکانی هنریی هەشتەم بوو ئەم کتێبەی هێناو کاری پێکرد ، ناوبراو لە لایەنگرانی نوسینەکانی مەدرەسەی مکیافیللی بوو و راستەوخۆ بەرپرسی ئەم پرۆسەی پیادەکردنی بیردۆزەکانی مکیافیللی دەبێ ، لەوکاتەوە پادشا توانیی تاکرەوانە حوکمی ولات بکا و دەست بەسەر سەرجەم کەنالەکانی دەولەت و کەنیسەدا بگرێ ، ئەمەش دەگەرێتەوە بۆ سود وەرگرتنی لەو کتێبە (میر).

لەکاتی کوشتنی هەردوو پادشای فەرەنسا هنریی سێیەم و هنریی چوارەم ئەم کتێبەیان لە گیرفاندا دۆزیوەتەوە ، ئەمەو کاردینال ریشیلیۆ کە بە مەزنترین ستەمکارلە مێژوی فرەنسا دادەنرێ لە سەردەمی پادشا لویسی سیانزەهەم یەکێک بوە لە لایەنگرانی ئەم کتێبە .

هەروەها ئەم کتێبە کاری کردۆتە سەر سیاسەتی فریدریکی مەزن پادشای بروسیا و دامەزرێنەری ئەلمانیای نوێ ، لە گەنجێتییدا ئەم کتێبەی خوێندۆتەوەو لایەنگری بوە بەلام لە دواییدا دژی وەستاوەتەوە هەروەک لە کتێبە بەناوبانگەکەیدا بەناوی ( من دژی مکیافیللیم) بە رونی دەریخوستوە.

ئەمەو ناپۆلیۆن بۆناپرت ئیمپەراتۆری فەرەنسا کتێبی میری خوێندۆتەوەو لە یەکێک لە هەزارکتێبە باشەکانی دونیا داناوە کە وەکو کتێبخانەیەکی گەرۆک ئەو هەزار کتێبەی دەستنیشان کردوە ، هەروەها نزپۆلیۆنی سێیەم هەمان سیاسەتی پیادە کردوە کە لەم کتێبەدا هاتوە .

یەکێک لەو کەسانەی دژی ئەم کتێبە وەستانەوە لویس جولی بوو، کتێبێکی بۆ ئەم مەبەستە دانا دژی کتێبەکەی (میر)ی مکیافیللی وەستاوەتەوە و رەخنەیەکی توندی لێ گرتوە ، ناوی لەو کتێبە ناوە (دیالۆگێک لە دۆزەخ لە نێوان مۆنتسکیۆ و مکیافیللی) ، بە دیدی ئەو ئەم کتێبە سەرچاوەیەکی سەرەکیە کە حاکمە زایۆنیزمەکان سودیان لێ وەرگرتوەو پشتیان پێی بەستوە لە پیادە کردنی حوکمرانیەکەیاندا، دانەر لە کتێبەکەیدا ئاماژە بەوە دەکا کە لای مکیافیللی ئاساییە ئەگەر کودەتایەکی سەربازی لە ولاتێک روبداو سەرنگونی دیموکراسی بکاو بۆ حوکمێکی دیکتاتۆری وەریبگێرێ ، بە پاساوی دەستگرتن بەسەر دونیادا .

گومانی تێدانیە، ئەو برگەو بنەمایانەی مکیافیللی دایرشتون بۆ دەستگرتن بەسەر جلەوەکانی دەسەلات ، هیتلەر برگە بە برگە جێبەجێی کردون ، هەرچەندە لە راستیدا ئێمە نازانین ئاخۆ هیتلەر کتێبەکەی جولیی خوێندۆتەوە یان نا، بەلام ئەوە دەزانین کە کتێبەکەی بنەماکانی حوکمرانی زایۆنیزمی خوێندۆتەوە کە لە راستیدا شیکردنەوەیەکی دروستی گوتاری مکیافیللیە ، ئەم راستیە لە کتێبی ( خەباتەکەم) دا هیتلەر بە رونی دانی پێداناوە .

هەروەها (رۆشنج) بەردەوام کتێبەکەی (میر)ی لە رۆخ پێخەوەکەیدا داینـاوە،

ئەوەی شیاوی باسە ئەو کتێبەی (باربیر) لە ساڵی 1929 لەسەر مکیافیللی دەریدەکا تیایدا راو بۆچون و بیردۆزەکانی مکیافیللیی روندەکاتەوە بە دیاری پێشکەش بە پادشای ئیتالیا (ڤیکتۆر عەممانۆئێل ی سێیەم ) دەکا و دەڵێ :
( مکیافیللی نمونەی بەرزی ئیتالیای نوێیە) .

بەناوبانگی ئەم کتێبە بۆ ئەوە دەگەرێتەوە کە بە قەوارە بچوک و لە برگەکانیشدا دەولەمەند وفرە بابەتە ، دەبێ ئەمە هۆکاری ئەوەبێ کە بەم خێراییە وەرگێردرێتە سەر چەندین زمانی بیانی ، دواتر چر و پری برگەکانیشی هۆکارێکە ببێتە کتێبێک لە نێو کتێبەکانی بەرنامەی خوێندن لە زانکۆ بەناوبانگەکانی دونیا لە بواری هزرە جیهانیەکان و ئەدەب و سیاسەت .

دواتر ئەوەی چاو بخشێنێتە سیاسەتی دەولەتان دەبینێ کە ئەم کتێبە بە دەستوری ستەمکار و چەوسێنەران و ئەو دەولەتانەی هەمان رەفتاریان هەیە ، دادەنرێ .

زۆر لە هزرمەندانی دونیا کتێبەکەی مکیافیللی و راو بۆچونەکانیان لەسەر سیاسەت بە بەردی بناغەی سەقامگیری و ئارامی دونیا داناوە و بە بنەمای زانستی سیاسەتی هاوچەرخ دەزانن . ئەم هزر وبۆچونانەی مکیافیللی هەراو شۆرِشێکی لە دونیا نایەوە :

بەهۆی ئەوەی لە كۆت وبەندەكانی سەردەم دەردەچێ و بیركردنەوەیەكی نوێ دەهێنێتە كا جیا لە وهزرو بروایانەی ئەوسا كە باو بون، لەوانە فەلسەفەی رەوشتی ئەوساو فەلسەفە ئاینیەكان ، كە بانگەشەی مەزهەبیان دەكرد ، سەردەمی ژیانی مكیافیللی ، سەردەمی سەرهەڵدانی هزرو فكرە نوێكان بوە ، لە شێوەی شۆڕسێكی نوێی سەردەمانە كە دەرەنجامەكەی چاكسازی ئاینی و رێنسانسی لێ دەردەكەوێ ، سەرەرای ئەوەی كە لە ئەنجامی ئەم سەرهەلدانانە مارتن لۆسەر كینگ دەردەكەوێ ، هەروەها نویتن و گالیلۆ و چەندی زانا وبیرمەندی تر لە بواری هزری جیهانی دەنگ هەڵدەبرن ، بەلام بیركردنەوەكانی مكیافیللی جیا دەبن لەگەل ئەو بیركردنەوانەی دەوروبەر و سەردەم، بۆیە لەو چەرخ بیركردنەوەكانی مكیافیللی قەدەغە دەكرێن ورەت دەكرێنەوە و لە لیستی كتێبە قەدەغەكراوەكان دادەنرێن، تا كۆتاییەكانی سەدەی نۆزدەهەم هەر بە قەدەغەكراوی دەمێننەوە.

مكیافیللی بەدرێژایی چوارسەدە و تا ئەو كاتەی كۆچ دەكا جگە لە جنێو و سوكایەتی پێكردن هیچی تر وەدەست ناهێنێ ، تا ئەو كاتەی دەبێتە بەشێک لە ئەدەب و سیاسەت لە ئەوروپا. بەلام ئیتالیا كە ولاتەكەی خۆیەتی كاتێک لە 1896 یەكیەتی نەتەوەیی وەدەست دێنێ، لە یادی لەدایک بونیدا ئاهەنگێک دەگێرن، بە یەكێک لە پالەوانی یەكگرتنی نەتەوایەتی ئیتالیای دەژمێرن و هزرو بیرەكانیشی بەوە دەناسێنن كە پێش سەردەمی خۆی كەوتون .

## بەناوبانگترین کارەکانی

----------------------------

مکیافیللی زیاتر لە 30 کتێبی داناوە، بەناوبانگترینیان کتێبی (میر) و کتێبی ( گوتارەکان، لە دە کتێبە بەراییەکەی تیتۆس لیفیس ) ن ، کتێبی (هونەری جەنگ) کە تیایدا باس لە هونەری جەنگ و رێنما وپێداویستیەکانی دەکاو ئاماژە بە ناوی بەناوبانگترین فەرماندەی سوێدی دەدا، لەوانە (جوستاف ئەدلفوس و موریس و چەند فەرماندەیەکی تر ) ، ئەمەو مکیافیللی چەند کتێب و هەڵبەست و گوتاری تریشی هەن لەوانە :

**کتێبی (میر)**

ئەم کتێبەی لە کاتی دورخستنەوەییدا لەساڵی 1513 نوسیوەتەوە و پێشکەشی لورینزو دی مدیتشی کردوە ، تیایدا باس لە ئەزمونی سیاسی و کۆمەڵێک ئامۆژگاریی حوکمرانی دەکا، وێرای ئەمە کتێبەکە لە ناوەرۆکدا هەڵگری هزر وبیر و بۆچونەکانی خۆیەتی، دیارە مەبەستی بوە لە رێگەی ئەم کتێبەوە رەزامەندی و دۆستایەتی حاکمەکان وەدەست بێنێ، بەلام لەمەیان شکستی هێناوە، ئەوەتا لە تاراوگە بە دورخراوەیی دەمێنێتەوە ، گرنگترین خەسلەتەکانی (میر) بە دیدی مکیافیللی لەم کتێبە ئەمانەن کە باسی لێوە دەکا :

- له روی رەوشتەوە: دەبێ مرۆڤ لە رەوشت ونەریتە چەواشەکاریەکانی ئاینی کریستی خۆی دەربازکا ، بەتایبەتی خەسلەتی خاکی و سەرنواندن بۆ حاکم ودەسەلاتداران و بەکارهێنانی ئاین بۆ وەدەست هێنانی سۆزو لایەنگریی جەماوەر.
- له روی سیاسەتی ناوەخۆوە: یەکانگیر کردنی تۆقاندن وخۆشەویستی خەلک بۆی .
- لەروی سیاسەتی ئابورییەوە : دەبێ هەوڵی یەکسانی ودادپەروەری ئابوری بدا، داهاتەکان بەیەکسانی بەسەر خەلکدا دابەش بکا، چونکە بونی چینێکی هەژار و برسی دەبێتە مایەی سەرهەڵدانی نارەزایی و دواتر هەلگیرسانی شۆڕش دژی حاکم .
- لەروی سیاسەتی دەرەوە: خۆی فێرکاو رابێنێ لە خۆدەرباز کردن و پاشگەز بونەوە لەو پەیمان ورێککەوتنانەی دەبنە بارێکی قورس بەسەریەوە ، بەکار هێنانی هێز لە کاتی پێویست دوودڵیی لێ نەکان.
- له بارەی جەنگەوە: مکیافیللی جەختی لەسەر بونی سوپایەکی شەرکەر کردۆتەوەکە نیشتمانپەروەر و بەهێز بێ ، ئەو سوپایەی لە کرێگرتەکان دروست دەکرێ سودی نابێ ، چونکە کرێگرتەکان دلسۆزیان تەنها بۆ پارە هەیە نیشتمان و نیشتمان پەروەری لای ئەوان هیچ ناگەیەنێ.

هەروەها مکیافیللی لە کتێبەکەیدا دەڵێ:

(ئالێرە پرسیارەکە دێتە پێش، ئاخۆ سەرکردە دەبێ خۆشەویست بێ یا بە سام و ترس ؟ گەل دەبێ لێی بترسێ ، یا خۆشیان بوێ ؟ )
وەلامەکە بەوە تەواو دەبێ کە گەل دەبێ خۆشیان بوێت و لە هەمان کاتیشدا لێی بترسن، بەلام کاتێک کارێکی ئاسان نەبوو هەردوکیان یەکانگیرکەیت ولە یەک سۆزدا کۆیان کەیتەوە ، ئەوکات دەتوانی بژاردەی لێترسان هەلبژێری لەوەی خۆشەویستی .
لەسەر خەلک بە گشتیش دەڵێ :
( ئەوان بێ وەفا و بێ نانومەکن ، راران، زۆرچاوبرسین و مەیلی خۆدورخستنەوەیان لە ترس و خەتەرناکی هەیە، تا ئەوکاتەی پێویستیان پێت بێ و سودت لێوەرگرن و تۆ وەکو سەرچاوەی رزق و داهاتی ئەوان بیت ،خۆشیان دەوێیت و بۆت دلسۆزن ، بەلام کاتێک بارت لار دەبێ، دژت دەوەستن وشۆرشت لە دژ هەلدەگیرسێنن و چارەنوسی میر بە کۆتایی دێنن ،

دۆستایەتی کە لە سەر بنەمای کرین و فرۆشتن بنیات دەنرێ ، دۆستایەتیەکی بێبنەماو مایە پوچە، چونکە لەسەر بنەمای خۆشەویستی و جوامێری بنیات نەنراوە ، ئەوکەسەی خۆی خۆشەویست دەکا هەموو کاتێک ژیانی لە مەترسیدایە ، بەلام ئەوەی لەسەر بنەمای ترس و تۆقاندن خۆی نیشان دەدا خەلک بە دوودلی دژی دەوستێ چونکە لێی دەترسێ لەوەی دەستیان لێ نەپارێزێ .
هەروەها دەلێ خۆشەویستی لەسەر چەند رێنماو بنەمایەک دادەمەزرێ بەلام ئەم بنەمایانە ئەگەری هەلوەشانەوەیان زۆرە چونکە ئەم خەلکە خۆپەرست و بەرژەوەند پەرستن ، بەلام ئەگەر لەسەر بنەمای ترس بوو ئەوان لە تۆلە دەترسن زاتی ئەوە کەمتر دەکەن دژت بوەستنەوەو خەراپەت لەگەلدا بکەن ) .
ئەوەی زانراوە کە کتێبی (میر) بابەتی نامەی دکتۆراکەی (بنیتو مۆسۆلینی) ی حاکمی فاشیزمی ئیتالیا بوو .
ئا لێرەوە دەستەواژەی ( تۆ کەسێکی مکیافیللیستی) بەو کەسانە دەوترا کە پیادەی بروا سەرەکیەکەی مکیافیللیان دەکرد، کاتێک دەلێ ( ئامانج پاساوی شێوازە یا رەفتارە ) ، ئەمەش بەناوبانگترین گوتەو خەسلەتی شێوازی مکیافیللیە کە لە پێناو گەیشتن بە ئامانجێکی پاک و جوامێرانە ئاساییە هەر شێوازێک یا رێگەیەک بگریتە بەر ئەگەر ئەم رێگەیە رێگەی توندو تیژ و بەکارهێنانی کاری نابەجێش بێت ، تەنانەت ئەگەر ئەم رێگەیە زالمانەو توندو بێ ویژدانانەش بێت ، چونکە ئاستی پاراستنی رەوشت لە جێبەجێکردن رەچاو ناکا ، مەبەست تەنها گەیشتن بە ئامانجە . ئەمە ئەو ئامۆژگاریەبوە کە مکیافیلی لەو کتێبەیدا هەمیشە دووپاتی کردۆتەوەو و بروای پێبوە .
کتێبی (میر) تا پێنج سال دوای مردنی مکیافیللی بلاو ناکرێتەوە ، هەر بۆیە ئەو خەلکە لێی تێنەگەیشتن و هەر زوو هێرشیان کردۆتە سەر تا وایان لێکرد ناوی مکیافیلی هاوتابوو لەگەل کرداری شەر و خەراپەکاری و خۆپەرستی ، تەنانەت لە هونەرە مللیەکانیش وا باوە، یەکەم کەس کە هێرش دەکاتە سەر مکیافیللی (کاردینال پولس) بوە کە بوە مایەی ئەوەی ئەم کتێبەی قەدەغەو حەرام بکرێ ورێگە بە بلاوکردنەوەشی نەدرێ ئەمجۆرە فکرانە بلاوببنەوە ، هەر بەم شێوەیە جانتێ لە کتێبێکی قەوارە مەزندا رەخنە لە هزرو بیردۆزەکانی مکیافیللی دەگرێ ، دیسان رۆما لە سالی 1559 ئەم کتێبە دەخاتە ناو لیستی کتێبە قەدەغە کراوەکانەوە و سەرجەم دانە چاپکراوەکانیش دەسوتێنێ.

بەلام کاتێک روناکی رێنسانس لە سەرتاپای ئەوروپا شەوق دەداتەوە، هەندێک لەوانەی بەرگری لە مکیافیللی دەکەن، کتێبەکەی وەردەگێرن و بە چاپی دەگەیەنن ، لە سەدەی هەژدەهەم لە هەموو کاتێک زیاتر ئاستی مکیافیللی بەرز دەبێتەوە، ئەوکاتەی جان جاک روسو مەدح و سەنای دەکا هەروەها فیختەو هێگل بە زانای دەناسێنن ، بەم شێوەیە مکیافیللی بە ستونێکی بنەرەتی دادەنرێ لە دروست بونی چەرخی روناکی لە ئەوروپا .

مۆسۆلینی کتێبی (میر) بۆ نامەی دکتۆراکەی هەلدەبژێرێ ، هەروەها هیتلەر ئەم کتێبەی خوێندۆتەوە رۆژانە بەر لە نوستنی پێیدا چۆتەوەو چەند لاپەرەیەکی لێ خوێندۆتەوە ، ئەمە وجگە لەو پادشا و ئیمپراتۆرانە ی نمونەی، فردریک وبسمارک و کریستینا و هەموو ئەوانەی چاویان بریبوە دەسەلات.

## مکیافیللی و بورجیای میری ..سێبەری شەیتان لەسەر زەوی

---

لەوانەیە زۆرکەس ئەوانەی کتێبی میریان خوێندۆتەوە ئەو راستیە نەزان کە هەموو خەسلەتەکانی ( میر) کە لەو کتێبەدا هاتون لە رەفتارە توندو تیژیەکان و کوشتن و زولم و ستەمکاری و تۆقاندن و دەربەدەر کردن هەموو شێواز ورەفتارە ستەمکاریەکان کە بۆ چەسپاندنی دەسەلات وپێگەی حوکم بەکار هاتون، مکیافیللی لە کەسایەتیی بورجیای قەیسەری وەرگرتون، چونکە مکیافیللی بە فەرماندەیەکی نمونەیی زانیوە ، کاتێک لە پێناو مانەوەی دەسەلاتدا هەرچی رێگاو شێوازی نابەجێ هەیە دەیانگرێتە بەر، ئیتر بەهۆی رەفتارە نادادپەروەر ونابەجێکانیەوە دەبێتە پالەوانی کتێبەکەی( میر).

ئەم میرە ( سیزار بورجیا ) لە سالەکانی (1475-1507) ژیاوە، یەکێک بوە لە میرەکانی چەرخی رێنسانس لە ئەوروپا.

سەردەمی پاپایەتی بورجیا بە خەراپترین سەردەم دەژمیردرێت لە سەدەکانی پێشوو کە ئیتالیا بەخۆیەوە بینیبێ ،یەکێکە بوە لە پاپا داوێن پیسەکان ، ئەو کاتەی لە نێوان سەدەی پانزەهەم و شانزەهەم دا خانەوادەکەی دەسەلات دەگرنە

دەست ، ئیتردەبێتە سەردەمی گەندەڵی و کارەسات بۆ ئیتالیا ، سەیرە بەراستی پاپاکان بە پاکی و بێگەردی ناسراون ئەوەی تا ئێستا لە وێنەی پاپاکان دەبینرێ و ماوەتەوە میهرەبانی وپاکییە ، سەرچاوەی ئامۆژگاری و پێدانی زانست و رێنیشاندەری خەڵک بونە، کەچی بورجیا بە پێچەوانەی ئەوان دەبێ ، دیارە ئەوان ( خانەوادەی بورجیا ) ئەوکات لە هەموو داب و نەریتێکی ئاینی و کۆمەلایەتی دەرچونە هەموو ئەوانەی سومبولی ئاین و ویژدانن پشتگوێیان خستون.

خانەوادەی بورجیا بۆ ماوەیەکی زۆر ناوو ناوبانگی فاتیکان و پاپایەتیان شێواند و لەبەر چاوی خەڵکیان رەش کرد، وێنەیەکیان نیشانی خەڵک دا کە بەتەواوەتی بە پێچەوانەی رابردوو بوو ، ئەمەش بەهۆی کارە نابەجێکان و داوێن پیسی وگەندەڵی لە بەکار هێنانی سامانی دەولەت و کەلیسا و ناداد پەروەری کارەکانیانەوقە بوو ، یەکێک لە بنەماکانی ئاینی کریستی بۆ پاپاکان ئەوەیە کە تا لە ژیان ماون دەبێ بە رەبەنی بژین ، نابێ پرۆسەی هاوسەرگیری پێک بهێنن ، کەچی ئەوان گوێیان بەم یاسایانە نەداو لە کۆشکی فاتیکان ژیانێکی شێتانەیان دەبردە سەر دورلە داب ونەریت ورێنماو یاساکانی ئاین .

بۆ سەلماندنی راستیەکان بەنمونە،( کاردینال رودونیو بورجیا) بەنهێنی ئاشقێکی هەبوو، کە دواتر منداڵێکی لێی بوو، ئەم منداڵە بوو بە جوانترین کچی سەردەم بەناوی (لوکریسیا) جگەلەمەش منداڵێکی کوڕیشی لێ بوو، دواتر ئەمیش دەبێتە یەکەم تاوانبارو درندە، نەک تەنها لەو سەردەم بەڵکو لە مێژوی ئیتالیا بە گشتی ئەگەر تەنها (نیرۆن) ی لێبەدەربێ کە دایکی خۆی کوشت و دواتر تەرمەکەی سوتاند ، کەواتە ناوی ئەو تاوانکارە (سیزار بورجیا )بوو کە بابەتی ئێمەیە لەم بەشە نوسینەدا .

(سیزار بورجیا) لە رێگەی پەنا بردن بۆ ئەم و ئەوو خزم خزمێنەوە دەبێتە کاردینال، چونکە مامەکەی لە نێوان ساڵەکانی 1455-1458 کە پاپایەکی گەندەل و داوێن پیس دەبێ ئەویش لەرێگەی برازاکەیەوە دەبێتە پاپا کە ناوی ئەسکەندەری چوارەمی بورجیا بوو لە ساڵی 1492 .

کچە جوانەکەی، باوکی ناچار دەکا سێ جاران ژن بهێنێ و دواتر دەستیان لێ هەڵگرێ، ئەمەش بۆ مەبەستی پەیدا کردنی سامان و سەروەت بوە ، هەرجارەشی لەگەل بنەماڵەیەکی ناوداری ئیتالیا خزمایەتیی دەکرد، دواجار هاوسەرگیریەکی سیاسیانە پێکدەهێنێ کە دوردەبێ لە هەست و سۆزی خۆشەویستی ، بەلام کێشەکە لەوەدابوو کە دەگەرێتەوە سەر هاوسەری دوەمی و

کورێکی لێ دەبێ ، لەوەش سەیرتر ، دواجار ناچاری دەکا لەو هاوسەرەشی دورکەوێتەوە چونکە خانەوادەیەکی تری پایە بەرزتر دەیانەوێ خزمایەتیی لەگەلدا بکەن و هاوسەرگیری لەگەڵ کچەکەیان ئەنجام بدا، بەلام کاتێک کچەکەی رێگەی پێنادا واز لە مێردەکەی بێنێ ، پاپا فەرمان بە سیزاری تاوانکار دەدا هاوسەری خوشکەکەی لەناو بەرێ و لێی نەجاتی بێ .

ئەوەی زانراوە کە تاوانکار سیزار سلی لە هیچ تاوانێک نەدە کردەوە هەرچەندەی ئەو تاوانە مەزنیش بوایە ، ژیانی تاوانکاریی ئەم تاوانبارە لە کوشتنی براکەیەوە دەستپێدەکا بە بیانوی ئەوەی چاوی بریوەتێ، جا ئەوەی دەستی بچێتە برای خۆی دەتوانێ هەموو تاوانکانی ئەم دونیایە ئەنجام بدا .

لە پیلانێکی بۆ تیرۆرکردنی هاوسەری خوشکی کۆمەڵێک جەردەو پیاو کوژ بە تاریکی شەو دەنێرێتە سەر رێگای گەرانەوەی بۆ مالەوە ، خۆشبەختانە لەکاتی دەستدرێژیەکە خەلکانێک چاویان لێی دەبێ و بەدەم هاواریەوەدەچن نایەلن بیکوژێ ، بەهۆیەوە برینداری دەکەن و لە مردن رزگاری دەبێ . کاتێک دەیبەن بۆ نەخۆشخانە وپاپا بەمە دەزانێ کە ناوبراو نەکوژراوە، شێت و هار دەبێ بۆیە فەرمان دەردەکا کە تەواوی بکەن چونکە رێگرە لەبەردەم ئەنجامدانی پرۆسەی هاوسەرگیریەکە.

ئەوەبوو پیاوکوژەکان دەچنەسەری لە نەخۆشخانەکە کاتێک هاوسەری برینداڕەکە کەدەکاتە خوشکی پاپا چاوی پێیان دەکەوێ ، هاواردەکاو خۆی بەسەر هاوسەرەکەیدادەدا تا نەیکوژن ، بەلام ئەمان هەرەشەی لێدەکەن و براکەی خەنجەری لێدەردەکاو دەڵێ ئەگەر لەم ژورە نەچیتە دەر بەم چەقۆیە دەتکوژم ، ناچار دەردەکەوێ ئیتر پیاوکوژەکانیش دەکەونە گیان برینداڕەکە هەر بە دەست دەیخنکێنن.

سیزارا بورجیای تاوانبار لە جەنگێکیدا کەلەتەک پادشای بافاریا جەنگی دەکوژرێ.

نوسەرە بەرابیەکان بەوە رەخنەیان لە مکیافیللی گرتوە کەنمونەی لەسەر تاوانبارێکی وەکو بورجیز هێناوەو کوردویەتی بە سنبولی شاکارەکەی لە کتێبی (میر) ، مکیافیللی لەژیانیدا سێ جار بە کاری دبلۆماسی سەردانی ئەم تاوانکارەی کردوەو، ئەوەی ئەم کاری لێ کردوە هیچ کام لە پادشاو سیاسەتمەدارێک کە دیداری لەگەل کردبن یا ژیاننامەی خوێندبێتەوە کاریان لە هزرو بیری نەکردوە .

له کتێبی (میر)دا مکیافیللی سەرجەم ئەو بەسەرهات و نوکتەو وردە روداوانەی لەسەر سیزار بورجیای خوێندۆتەوە کە بونەتە فاکتەری مانەوەی لەسەر حوکم ئاماژەی پێداون ونمونەی لەسەر هێناون، ئەوکات سیزار بورجیا لای مکیافیللی نمونەی بەرز و سومبولی ئەزمونەکانی بوە، وای دەبینێ کە هەموو خەسلەتە چاکەکان لەپێناو گەیشتن بە ئامانجی خزمەتکردن ، لای سیزار بونیان هەبوە ، بۆیە بەدیدی مکیافیللی کە لە (میر) ئاماژەی پێداوە دەبێ سەرکردە خۆی لەو چاکانە دورخاتەوە کە دەبنە مایەی لاوازبونی ، رەوشتی باشی لاساییکراوە کە نابنە مایەی مانەوە لە حوکم دەبێ خۆیان لێ دورخاتەوە ، چونکە دلخۆشی میللەت بەقەدەر مانەوەی حاکم مەبەست نیە ، دیارە بە بروای خۆی ئەوە سەلمێندراوە کە ئەو چاکانەی میللەت دلخۆش دەکەن ودەبنە مایەی خێرو خۆشی بۆ خەلک دەسەلات لاواز دەکەن و لە کۆتاییدا سەرنگومی دەکەن، بۆیە دورکەوتنەوە لەو کارە باشانە باشترین رێگە چارەیە بۆ مانەوەی حاکم لە دەسەلات.

بە دیدی مکیافیللی حاکم یا (میر) ێکی وەکو سیزار دەبێ دەست کراوە نەبێ، باشترە بۆئەو رەزیل یا چاو تەنگ بێ، تەنها ئەوکاتە حاکم دەستکراوە بێ لە کاتی هێرش و جەنگەکاندا ، ئەوکات دەبێ لەگەل سەربازەکانی دەستکراوە بێ، ئەمەش لەسەر حیسابی خۆی نا بەلکو لەسەر حیسابی ئەو ولاتە یا شارەی داگیری دەکەن، واتە بە مولک و سامانی تالان و دەستکەوتوو. هەروەها باشترە حاکم تۆقێنەرو سامناک بێ توندو سزادەر بێ ، بۆئەوەی هەم لایەنگرانی هەم دوژمنانی لێی بترسن ، باشترە لەوەی نیان و خۆشەویست و بەخشندە بێ ،نەبادا دەستدرێژیی لەسەر بکەن ، دواجار دەلێ لەهەمویان زەرورتر ئەوەیە حاکم یا میر فێلباز و درۆزان بێ بۆئەوەی بە هەر هۆکارێک بێ ئامانجەکانی خۆی بپێکی و بەمەبەست بگا، لەهەمان کاتدا وێنەیەکی نیان و دلنەرم و دلۆڤان ومرۆڤدۆست و بروادار بە ئاینەوە خۆی نیشانی گەلەکەی بدا .

## کتێبی مێژووی فلۆرەنسا

-------------------------

لەگەڵ ئەوەی کەمێک لە مێژوی ژیاننامەی مکیافیللیمان لەبەردەستە ، بەلام دەتوانین درک بەو کەش و هەوایانەی فلۆرەنسا ئەوکات بکەین، لە سەردەمی ژیانی مکیافیللی کە هاولاتیان چۆن چۆنی ژیاون ، چونکە فلۆرەنسا وا پێناسە کراوە کە شارێکی جیاوازە بۆ زیندەگی هاولاتیان، خۆی دوو شێوازی ژیانی لێ بەرێوە دەچو، هەردوکیان جیاوازیان لەگەل ئەویتردا هەبوە : یەکێکیان لە لایەن سافوناروﻻ ی توندرەو دەبردرا بەرێوە، ئەویتریان لەلایەن لورنز دی میتشی دەربردرا بەرێوە .

کتێبی (مێژووی فلۆرەنسا)ی مکیافیللی ، وێنەیەکمان پێ دەبەخشێ کە بریتیە لە ژیانی ئەو گەنجانەی لەگەلیدا ژیاون لە فلۆرەنسا ، بۆیە دەڵێ:( ئەوان لە روی جل وبەرگ و رابواردن و لەخۆخەرج کردنەوە، لە باوکیان ئازادتر بوون ئەوان زیاد لە پێویست لە بەژن و باﻻ و رابواردن و یاری و کچاندا خەرج دەکرد ، هەموو ئامانجیان ئەوەبوو بە کەشخە و بە شیکی بێنە بەرچاو، لە قسەکردنیشدا زمانزان وزیرەک بێنە بەرچاو، زیرەکی لای ئەوان برینداز کردنی هەستی خەلکی بوو ، ئەمە نیشانەی ئازایەتی وحەکیمایەتی بوە ، لە نامەیکیدا کە بۆ جویدوی کوری دەنێرێ ، دەڵێ زۆر زەرورە ماوەی گەنجایەتیت بە خوێندنەوەو خۆ زیرەک کردن بەریتە سەر ، ئەمە نیشانەی

ئەوەیە کە لە تەمەنی گەنجێتییدا زۆر سەرقال بوە ، خۆی ماندوکردوە ، مکیافیللی دەڵێ نامەکەتم بەدەست گەیشت زۆر پێێ دلخۆش بووم بەتایبەت کە دلنیابوم لەوەی چاکبویتەوە ، بۆمن هیچ هەواڵێک لەمە خۆشتر نیە ، خوا ئەم دەستکەوتەی بە تۆو بەمن بەخشی، ئومێدم وایە ببیتە پیاوێکی بە وج لەداهاتوو ئەگەر ئامادەبیت گوێم بۆ راگری.

درێژە بە نامەکەی دەدا دەڵێ ئەمە بۆتۆ زۆر باشە بەلام لەسەرتە تۆ باش بخوێنی چونکە هیچ بیانویەک نەما تۆ بگریتە بەر تا نەخوێنی ، ناتوانی نەخۆشی بکەیتە بیانوو، دواتر ئەمەشت پێبڵێم کە پادشا نامەکان دەخوێنێتەوەو هەولێ فێربونی مۆسیقا دەدا ئەمەش بۆ تۆ شەرەفێکی مەزنە من ببمە خاوەن ئەم دەستکەوتە ، کورەکەم ئەگەر دەتەوێ دلخۆشم کەی و خۆشت ببیتە خاوەن ئابروو و ناوبانگ ئەوا دەرسەکانت بەباشی بخوێنە تا سەرکەوی چونکە بەمەیان هەموو یارمەتیت دەدەن ئەگەر تۆ یارمەتی خۆت بدەیت .

مکیافیللی دژی سیاسەتەکانی دەرەبەگایەتی وپاپایەتی وەستاوە، چونکە بە دیدی ئەو رێگرە لەبەردەم پرۆسەی یەکگرتنی سیاسی ، پێیوابوە کە زانست وفێربونی کەلیسەکان کارێکە زیاتر تێکدەرانەیە لەوەی داهێنان بێ، بەهۆیەوە خەلک لە چالاکی دەکەوێ ، بەلام ئەمە ئەوە ناگەیەنێ کە مکیافییلی دژی ئاین بوبێ ،بە پێچەوانەوە پێیوابوە کە دەکرێ ئاین ببێتە فاکتەرێکی گۆرانکاری سیاسی لە ژیانی مرۆڤایەتیدا ، هەروەها رەخنەی توندی لە سیستەم ورژێمی سەربازی ئەوسای ولات گرتوە ، بەهۆی ئەوەی بۆ بەرگری کردنی خاکی ولات پشتی بە کرێگرتە خەراپکارەکان بەستوە ، پێی وابوە ئەمان لەم کۆمەڵگایەدا کەسانی بەرەللاو بێ جەمسەرن ، کاری ئەوان تەنها تالانکردنە ، پێیوابوو دەبێ ولات سوپایەکی رێکخراوی هەبێ، پشت بە سوپای گەنجان ببەستێ کە وەکو ئەرکێکی نیشتمانی سەرجەم گەنجان بەم ئەرکە هەڵسن ، بانگەشەی بۆ بەبەرنامەکردنی دەزگاکانی حکومی بکرێ و سوپاو پۆلیس لە یەک ئۆرگاندا رێکبخرێن ویەکبخرێن ، دەبێ دەوڵەت خۆی لە دروست کردنی میلیشیا دورخاتەوە چونکە ئەوان تێکدان و گەندەلی بەدوای خۆیاندا دێنن، بۆیە دەبێ (میر) فەرمانرەوای دکتاتۆر پشت بە سوپایەکی رێکخراوی گەنجان ببەستێ تا بەرگریی لێبکەن و سەروەریەکانی ولات بپارێزن، مکیافیللی خەونی بەو سوپایەوە دەبینی کە وەکو مێگەل هێرش دەبەن لە پێنا وپاراستنی سەروەری ولات وئامانجە نیشتمانیەکانی ئیتالیا .

راو بۆچونە سیاسیەکانی مکیافیللی کاری زۆری کردبوە سەر پەرە پێدانی دیراساتە مێژوییەکان و بیردۆزەکانی . توێژینەوەکانی هەنگاوی زۆریان بەرەو پێش نابوو ، مەزەندە نەدەکرا بەم شێوەیە درک بە روداوی پێشوەخت بکا ، بە دیدێکی روالەتی سەیری دەولەت ویاساکانی دەکرد ئەم دیدانەی هەلقولاوی ئەزمونەکان و توێژینەوەکانی لاهوتی و بیردۆزی راستی خواوەندی بون لە حوکم رانی .

هەروەها بروای بە حەتمیەتی روداوە مێژوییەکان و پەیوەندیی نێوانیانەوە هەبوو ، بەدەر لە را هاوبەشەکانی کە بە پێچەوانە بیریان دەکردەوە ، خۆیشی گەیشتبوە بروایەک کە لەوپەری بایەخدا بوو، بریتی بوو لەوەی ( ململانێی سیاسی بزوێنەری بنەرەتی مێژوە، گەلێک جار ئەم ململانێیە سیمایەکی کۆمەلایەتی یا چینایەتی لەخۆ دەگرێ بەلام لە راستیدا سیاسییە) هەندێک جاریش ئەم ململانێیانە دەبنە دژایەتی وململانێی بێ سود لە نێوان بەرژەوەندیەکانی گەل و مولکدارەکان.

لەو کتێبە قەوارە مەزنەیدا (مێژووی فلۆرەنسا) باس لە خەباتی جەماوەر وئورستوکراتەکان دەکا، بەلام ئەوەی ناوبانگی مکیافیللی زراند کەلیسا بوو ، کە دژایەتیی دەکرد بەهۆیەوە کتێبەکانی قەدەغە کران، لە کاتێکا ئەم کتێبەی (مێژووی فلۆرەنسا)ی لەسەر داوای پاپا خۆی نوسیوەتەوە . لەوەش زیاتر مێژوو نوسە بۆرجوازەکان کارەکەیان لێ قورس کرد، کاتێک رەخنەی توندیان لێ گرت، هەروەها کۆمەلناسەکانیش بەهەمان شێوە رەخنەیان لەو بیردۆزە گرت کە دەربارەی دەسەلاتی دکتاتۆریی رەها بوو ، ئەمەو بێدەنگیان بەرانبەر بە هزرەکانی لەسەر رژێمی کۆماری کە بە باشترین سیستەمی حوکمی زانیوە چونکە لە ژێر سێبەری ئەو رژێمە یاسای توناسازی دانراوە .

ئاماژەکان بۆئەوەن کە مکیافیللی خاوەنی مەوداو بەرهەمێکی زۆری ئەدەبیە لە سرود و پەخشان و نامە و هەلبەست، تیایدا رەخنەی لە نەریتی بالیەو کەم و کوریەکانی کەلیسا گرتوە ، بەم بەرهەمانەی ئەدەبی ئیتالیای دەولەمەند کردوە بەهۆیەوە فرە رەنگی بەخۆوە بینیوە ، بە هەلەدا ناچین و لەم روالەتە دورناکەوینەوە ئەگەر بلێین مێژونوسی ئەم چەرخەی رێنسانسی مەزن شایانی ئەو وشانەن کە لەسەر گۆرەکەی لە فلۆرەنسا بەبۆنەی زیندوراگرتنی یادی هەلکەندراوە **( من بە خاوەن ستایش دەلێم ، ئەم ناوە بە مافی شیاوی خۆی بگا ).**

مکیافیللی تاقە راگەیاندنکار نەبوە کە بەروی واقعدا هاتۆتەوە ، بەلکو گەلێک لە مرۆڤ دۆستی ئەو سەردەمی رێنسانس بەشداریان کردوە.

## کتێبی گوتارەکان

-------------------

مکیافیللی زانستی سیاسی نوێی بە چاکی چەسپاندبوو ، وەکو زانستێکی سەرزەمینی دەبینی، دوور لە ئاین و رەوشت و بەجیا مامەلەی لەگەڵدا دەکرد ، ئەمەشی لەم کتێبابەنەیدا بەرونی دەریخستوە ( میر ، باس و خواستەکانی سەر لیفیس یا گوتارەکان) کە تیایاندا ئاسۆی سیاسەتی بە رونی نەخشە بۆ کێشاوە. هەرچەندە وەکوو میرێک ناوبانگی پێ وەرنەگرتوە .
گرنگی ئەم کتێبە لەوەدایە کە مکیافیللی بە رونی دیدی خۆی لەسەر هەلسانەوەی میلەتان و تێکشکاندنیان روونکردۆتەوە، هەروەها رۆلی ئاین و فەرماندەو زانستی هونەرو ئەدەب لە پێشکەوتنی کۆمەلگا و روخانیدا شیکردۆتەوە. لەم کتێبەیدا مکیافیللی کاروباری کۆمارەکان و رۆل و مافی هاولاتیی چارەسەر ودیار کردوە، ئەمەش لە رێگەی پەنا بردن بۆ هەموو رێگە چارەکانی ئابرومەند و بێ ئابروو ، بەنمونە دامەزراندنی حزب ورێکخراو بۆ چارەسەری کێشەو داخوازیەکان یا پەنا بردن بۆ جەماوەرو خۆ دورکردنەوە لە هاوکاریەکانی بێگانە ، کە چۆن دەتوانی بۆخۆت میرنشینێک دامەزرێنی و لە هەمو هەرەشەو مەترسیەکانی دەرەکی بیپارێزی؟ ، لەم روەوە چەند دەستەواژەیەک دەکاتە نمونە کە دەبێ حکومەتەکان پیادەیان بکەن بۆ ئەوەی ئارام و سەقامگیر بێ و لە هەرەشەو ئاژاوە پارێزراو بێ ،جا ئەمە

ئەگەر کۆماری بێ یا میرنشین بێ ، هەر لەم کتێبەیدا چەند  بنەمایەک ئاماژە پێدەکا کە دەکرێ بۆ کۆماری بەکاربێن یا بۆ میرنشین ، لەم میانە بەراوردیشیان لە نێواندا دەکا، لەم روەشەوە رژێمی کۆماریی پێ باشترە جگە لە حالەتی داگیرکاری و هەلوێستی رژێم لەگەل هاولاتیانی داگیرکراو کە لە حالەتی شەردان دەبێ یاسای تایبەتی لەگەلیاندا پیادە بکرێ .

ئەگەر مکیافیللی لە کتێبی (میر) باسی لە فەرماندەکانی ولات نەکردبێ ئەوا لە کتێبی ( گوتارەکان) بە رونی باسی لە ئەرک و فەرمانی ولات کردوە بەرانبەر بە فەرماندە سەربازیەکانی، هەروەها چۆنیەتی مامەلەکردنی فەرماندە سەربازیەکانیش لەگەل حکومەت و سەربازەکانیان .

لە بەشی دوانزەهەمی کتێبی یەکەمی (گوتارەکان) مکیافیلی باس لەو بنەما و رێنمایانە دەکات کە دەولەت لە گەندەلی دەپارێزێ، لەم روەوە یەکەم بنەما ئاینە ، ئاین مەبەستی ئاینێکی دیار نیە بەلکو هەر ئاینێک بێ واتە ئاین بە شێوەیەکی گشتی .لەمەشیان وا پێناچێ کاتێک باس لە ئاینپەرستی دەکا مەبەستی کۆمەلێک خواپەرستی بێ ، بەلکو مەبەستی ژێرخانە بنەرەتیەکەی ئاینە .

مکیافیللی بۆ ئەمە دەڵێ:

میرو حوکمرانە کۆماریەکان ئەوانەی دەیانەوێ خۆیان لە گەندەلی بپارێزن دەبێ بەر لە هەموو شتێک دەست بە داب و نەریتەکانی ئاینەکەیانەوە بگرن ، کە خۆی لە گەندەلی بێبەش دەکا ، دەبێ ریز لەم نەریتە بگرن ، چونکە ئاشکەرایە کە هیچ کاتێک کاولبونی دەولەتێک مەزنتر نەبوە لە سوکایەتی کردن بە خواپەرستی ، ئاسانیشە کاتێک مرۆڤ مەبەستیبێ بزانێ ئاخۆ ئەم ئاینە لەسەر چ بنەمایەک دروست بوەو سەرچاوەی هێزی لەکوێیە . هەموو ئاینێک لەسەر ستونی بنەرەتی بنیاتنراوەو کە تایبەتە بە خۆی، بەنمونە ژیانی ئاینی (وەسەنی) لەسەر بنەمای ئاماژەی زاناو پێشبینزانەکان بنایت نرابوو، ئەوانەی لە غەیب بە ئاگا بوون. بۆیە داب ونەریتە خواپەرستیەکانیان لەسەر ئەم بنەمایە بوون ، لای ئەوان ئاسان بوو بروا بەوە بکەن کە خوا لە هەموو چاکەو خەراپەیەکی داهاتوو بەئاگا و بە توانایە لەسەر روودانی.

بۆیە خواوەندیەکانیان خواپەرستییان بریتی بوە لە بەرز راگرتنی پێگەی خواو مەزنی وتوانایی ئەو شکۆدارە ، ئەمە بنەمای برواکانی زانا(دیلۆس و پیاوە ئاینیەکانی پەرستگای جوبیتر وامون ) بون بە سەرجەم پەرستگاکانی تر کە هەموو بستێکی پرکردبو ، کاتێک زاناو پێشبینزانەکان سەریان بۆ پادشاکان دانواند و کەوتنە بەر کاریگەری خواستە نارەواکانیان و خواستەکانیان خستە

قالبی خواوەندی ، بۆ ئەوەی خەلک بێدەنگ بن و سەریتان بۆ شۆرکەن، ئەوکات بۆیان دەرکەوت کە فەرمایشتەکانیان هەمووی درۆو دەلەسەن بۆیە لە دژیان وەستانەوە.

واتە ئەوەی حوکمرانی کۆمار یا میرنشینی دەکا دەبێ بە دلسۆزی وئەمانەتەوە مامەلە لەگەل برگەکانی ئاین بکا و بۆ بەرژەوەندیەکانی خۆی لار یان نەکاتەوە ، ئەگەر لەوە سەرکەوتن کە هەموو کارەکان بە ئاینەوە ببەستنەوەو بە وردی برگەکانی ئاین پیادە بکەن ، ئەوا لە مانەوەیان لەسەر دەسەلات سەرکەوتو دەبن، ئەگەر زانیاریشیان لەسەر زانستی سروشت هەبوو پابەندی روداوەکان بون و بە دروستی مامەلەیان لەگەلدا کردن و لەگەل روداوەکانی ئاین هاتنەوە ئەوا مانەوەیان مسۆگەرتر دەبێ و سەرکەوتو تر دەبن لە حوکمران.

دەبینین کە مکیافیللی بەمانای ووشە پیاوێکی ئەوەندە ئاین پەرست و پیاوی ئاین نەبوە، کەچی زۆر پابەندی داب ونەریتەکانی ئاینەو کاولبونی ولات بەوە دەبینێ کە پابەندی بنەماکانی ئاین نەبی، هەردوکیان بەیەکەوە دەبەستێتەوە و مەرجی مانەوەی دەسەلات بە دەستگرتن بە ئاینەوە دەبینێ ، مەسەلەکە لای مکیافیللی راستی و ناراستی ئاین نیە ،بەلکو پرسەکە ئەوەیە کە خۆبەستنەوە بە بیردۆز و پرەنسیپێک تاچەند کاریگەری بەسەر یەکپارچەیی و سەقامگیری ولاتەوە هەیە، بەهۆیەوە چۆن کۆمەلگا یەک دەخرێ ودەخرێتە ژێر سیستەم ویاسایەکی کۆمەلایەتی ، دیسان لای ئەو گرنگ نیە کە ئەو معجزەو توانا وپێشبینیانە راست بن بەلام دەبێ حاکمەکان مامەلەی لەگەلدا بکەن وەکو ئەوەی کە راستن و بروای ئەوخەلکەشی لەسەر مکوم بکەن ، دەبێ بروابون بە شتی نادیارەوە ببەستیتەوە، بەدەر لەوەی ئەو بروابونە راستە یان نا ، چونکە هەروەکو هەندێک لە هزرمەندان دەڵێن ئاینێکی ساختە باشترە لە بێ ئاینی .

# هزرو راکانی مکیافیللی

----------------------

مکیافیللی لە ناودارەکانی چەرخی رێنسانس دەێتە ئەژمار، ئەوانەی بەشداریان لە رەوشەنکردنی کۆمەڵگای ئەوروپیدا کردوە، هزرەکانی لە هزرە سەرەتاییەکانی فکری رۆژئاوای نوێن لە بواری سیاسەت ، ناودارەکانی تری داهاتوی رێنسانس ئەوە ناشارنەوە کە لە ژێر کاریگەری فکر وهزرەکانی مکیافیللیدان و ریزیان بۆی هەیە ، ئێستاش باس لە هەندێک لە و هزرو بەرنامە سەرەتاییانەی دەکەین :

## مکیافیللی و پەیرەوی فەلسەفیی

---------------------------------

مکیافیللی هەولیدا شێوازێکی نوێی جیا لە شێوازەکانی پێشو بێنێتە کا، وێرای ئەوەی کە خۆی فەلسەفەو روالەتی خوێندوە بەلام ئەم بوارە وازلێدێنێ و روو لە مێژوو دەکا ، سەرەتای هزرەکانی ئەوە بوون کە بروای وابوو رەفتارەکانی هەموو مرۆڤێک دەیان گەیەننە هەمان ئەنجام ، مکیافیللی هەولی داوە هۆکار و ئەنجام و دیراسە شیکاریەکانی پشتبەستو بە مێژوو لەیەکیان ببەستێتەوە .لەسەر ئەم بنەمایە توێژینەوەکانی مکیافیللی بەم شێوەیە بون :

- پەنا بردن بۆ مێژوو تا راستی روداوەکان بزانین و لە ئەنجامەکانیان بگەین وبە ئەگەری دوبارە بونەوەیان ببەستینەوە ، واتە لە هەولی زانینی پێشبینی دابین.
- هەولدەین لە کاتی دووبارە بونەوە روداوەکان گشتگیر کەین، بۆئەوەی بگەینە چەند بنەمایەکی گشتی تا ئاسانکاریەک لەبەردەم حوکمرانەکان دا هەبێ بەهۆیەوە کارئاسانیان بۆ بکەین لە حوکمرانیدا و ئەوانیش هەلوێستیان بەهۆیەوە دیار بێ .
- گەران بەدوای رێگەیەک بتوانین بەرلەرودانەکان دەستمان پێیان بگا ،دوای ئەوەی هۆکاری رودانەکە دەزانین هەولدەین دەستنیشانی هەنگاوەکانی مامەلەکردن کەین.

ئالێرە بۆمان دەردەکەوێ کە مکیافیللی تا چەند مێژووی لا گرنگ بوەو وەکو سەرچاوەی زانیاری و زانستیی بەکار هێناوە ، دەبینین چەند توێژینەوە مێژوویەکانی بەکار هێناوە بۆئەوەی راستی بۆچونەکانی بسەلمێنێ ، ئەمە هەروەکو لە کتێبی (هونەری جەنگ) و کتێبەکانی تریش بە هەمان شێوە هاتوە، بۆیە مکیافیللی بە یەکێک لە دامەزرێنەرانی شێوازی شیکاری مێژوییی نوێ دێتە ئەژمار.

بەلکوو گەلێک هۆکار هەبن کاریان لە هزری مکیافیللی کردبێ بەلام گرنگترینیان ئەمانەن:

- لاوازی ئەوسای رەوشی دەولەت ، زۆری کێشەی سیاسی لەو سەردەم، پێویست دەکرا رژێمێکی حوکمرانی بەهێز هەبێ تا بتوانێ بە دروستی حوکمی ولات بکا ، جا رژێمێکی حوکمرانی پادشایەتیی توند یا رژێمی کۆماری ، (خۆی لایەنگری رژێم یا سیستەمی کۆماری بوو) .
- ئەوکاتەی مکیافیللی لە حکومەتی فلۆرەنسا دەبێ،( روبەروی ژمارەیەک لە پیلان و تەلەکەبازی دەبێ ).
- کاریگەری وشەیدایی بۆ مێژوو ، بە دیدی ئەو هیچ روداوێک لە بازنەی دوبارەبونەوە بەدەر نیە .

چونکە کرۆکی هزری واقعیی ئەمرۆ کە بنەمای پەیوەندیەکانی نێودەلەتی و رێنمای حوکمرانین، تائێستا تاقی نەکراونەتەوە وهەر لەسەر بنەمای بۆچون سروشتی مرۆڤ دیاری دەکەن جا ئەم سروشتە چاک بێ یا خەراپ ، زۆربەی زاناکان لەوانە مکیافیللیش بروایان وایە کە مرۆڤ لەسەر روالەتێکی توندرەوی دروست بوە و مەیلی چاوتێبرین و چاوچنۆکی و حەزکردن لە دیکۆر و خۆ

بەزل زان و زولمکردن لە خەلک دروست بوە، ئەمانە خەسلەتی مرۆڤن بە جێماوی بۆیان ماوەنەتەوە، بۆیە زۆر زەرور و پێویستە هێزێکی بەتواناو بێ بەزەیی بەسەر ئەم مرۆڤانەدا زاڵ بێ و رێگری لەم رەفتارە ناشیرن ونابەجێیانەی مرۆڤ بکا.

مکیافیللی ئاماژەی بەوە کردوە کە کەسی توێژەری سیاسی و پیاوی دەولەت نابێ وەکو حەز سەیری دونیا بکا، بەلکو دەبێ وەکو کە هەیە لەسەر ئەرزی واقع سەیر بکا ،واتە حساب بۆ ئەو دوریەی نێوان حەزو واقعە بکا ئەوەی دەکرێ لەم سەردەم و حالی حازرە ئەوە بکا ، بۆئەوەی لە هێزی خۆی زیاد بکاو هێزی دوژمن لاواز بکا ،مکیافیللی دەڵێ:

( نەزانترین وگێلترین حاکم ئەوکەسەیە کە دەیەوێ دەولەتە دراوسێکەی بەهێز بکا ، چونکە هەرکاتەی بۆی لوا دەستدەگرێ بەسەر ولاتەکەی و لەناوی دەبا ).

ئەو پێناسەی مکیافیللی بۆ سروشتی تاکی کردوە هەمان خەسلەت بەسەر دەولەتدا جێبەجێ دەبن ، ئەوەتا هەردوکیان حەزیانە زولم و ستەم لە دەوروبەریان بکەن، هەردوکیان چاویان لە سامانی دەورو بەرە ، لە هەمووی سەیرتر ئەوەیە لە نێو ئەو هەموو ولاتانەی دونیا تەنها تاقە ولاتێک یا دەولەتێک نابینی ناوبژیوانی لەنێوان دوو دەولەتدا بکا، واتە ژیانی کۆمەلگای نێودەولەتی کۆمەلگایەکی ئاژاوەگێریە هەروەکو دارستانەکان وایە ،بەهێز پەلاماری لاواز دەدا بیخوا ، دەکرێ حکومەتێکی بەهێزت هەبێ تا بتوانێ کۆنترۆلی میللەتەکەی بکاو رێگە لە پێشێلکاری و زولمکاری بگرێ ، بەلام بۆ دەولەتانی دونیا ئەمە ئەستەمە ناکرێ ولاتێک یا دەولەتێک بەهێزکەیت تا هێزی بەسەر هەموو دەولەتانی دونیادا بشکێ ورێگە لە دەولەتانی تر بگرێ کەس زولم لە ویتر نەکا و بەهەوەستی خۆی بریار و یاسا دەربکا خۆی ببێتە کورەمیر و کەس نەتوانێ دەست بخاتە پێشی بەهۆی ئەوەی لە ئەرکی پاراستنی ئاسایش وئارامی ولاتان دایە .(بەلام لە راستی دا ئەمە دروست بوە .و).

## راو بۆچونە سیاسیەکانی مکیافیللی

--------------------------------------

دەکرێ لە رێگەی ئاشنابون بەو چوار کتێبەی مکیافیللی، شارەزاییەک لەسەر راو بۆچونە سیاسیەکانی پەیدا کەین ، (میر، گوتارەکان،هونەری جەنگ، لەگەل کۆمەلە نامەیەکی کە لە دۆخە تایبەتیەکاندا بۆ دۆست و خزمە جیا جیاکانی ناردون.
میر  بە بچوکترین و بەناوبانگترین کتێبی مکیافیللی دادەندرێ ، لەگەڵ ئەوەی کتێبەکانی تریشی لەم کتێبە بێبایەختر نین بەلام کاتێک ئەم کتێبە دەخوێنیتەوە بەراستی بۆت دەردەکەوێ کە ئەو پانزە سالەی مکیافیللی لە دەسەلات بردویەتە سەر بە فیرۆ نەچونە ، ئەمە خۆیشی وادەڵێ.
لەسەرەتا مکیافیللی بروای وابوە کە سیستەمی کۆماری باشترین سیستەمی حوکمرانیە، بەلام پاش شیکردنەوەوی شێوازی حوکم لە ئیتالیا کە ئەوکات بەسەر پێنج دەولەتدا دابەش ببو، بریتی بون لە ( میرنشینی ناپۆلی لە باشور، میرنشینی میلان لە باکوری رۆژئاوا ، کۆماری بوندوقیەی ئوروستوکراتی لە باکوری رۆژهەلات ، کۆماری فلۆرەنسا و دەولەتی پاپایی لە ناوەراست.) پەیوەندیەکانیان بریتی بوو لە قەدەغە بونی جەنگ و هەر جۆرە ناکۆکیەک لە نێوانیاندا ) ئەم دۆخەی ئیتالیا ئەرزیەتێکی خۆشی خولقاندبوو تا دوژمنانی بە

ئاسانی بتوانن هێرشی بکەنە سەرو داگیری بکەن ، بۆیە مکیافیللی لە کتێبی (میر) گەیشتۆتە ئەو بڕوایە کە بونی حکومەتێکی بەهێز بتوانێ هەموو پارچەکان یەکخاو کەس لە بازنەی یەکێتیەکە دەرنەچێ، باشترین رژێم وسیستەمە بۆ رزگار کردن و یەکخستنی ولات، حکومەتێکی دیکتاتۆر کەس نەتوانێ تەگەرەی بۆ دروست بکا وهیچ بەهایەک بۆ ویژدان وئاین و رەوشت دانەنێ بەرژەوەندیەکانی دەولەت لە سەروی هەموو ئیعتباراتێکەوە بن ، هەموو شێوازەکان بێ سل کردنەوە بەکاربێنێ، هەر لە توندوتیژی و زۆرەملێ و کوشتن و گرتن، تا تیرۆرو سوێندی بەدرۆو پارانەوەو بەرتیلدان و پەنا بردن بۆ فرت و فێل و ساختەکاری وچەواشەکردن بە بیانوو پاساوی گەیشتن بە ئامانجێکی باش بۆ دوارۆژی ولات ، ئەو داوای لە میر دەکرد کە بێ شەرمانە پەنا بۆ ئەم رێگایانە بەرێت چونکە پاساوێکی بەجێی لە پێشە ئەم کار ورەفتارانەی بە شەرعی دەکردن بە بیانوی بەرژەوەندیەکانی ولات ، حاکمی سەرکەوتوو ئەوەیە کە پەنا بۆ رێگەچارەکانی باش دەبا جا ئەم رێگە چارانە مرۆیی بن یا ئاژەلی ، گرنگ ئەوەیە سەرکەوتن بەدەست بێنێ، گرنگ نیە چۆن بەدەست هات ، حاکم دەبێ بزانێ کەی و چۆن فێلەکانی رێوی بەکار دێنێ وکەی وچۆن خورت و درندەیی شێر بەکار دێنێ .

بە پشت بەستن بەم بۆچونانەو بەهۆی ئەوەی حاکمەکان هەلگر و پیادەکاری هزرەکانی مکیافیللی بون کە بەپێی بارو دۆخی گونجاو هەلس و کەوتیان دەکرد ئیتر دەستەواژەی مکیافیلیزم و مکیافیلیست یەکەمیان بەو سیاسەتە دەوترا کە هیچ ریزێک بۆ بەها رەوشتیەکان دانانێ و دوەمیشیان بەو کەسانە دەوترا کە پیادەی ئەو سیاسەتەیان دەکرد. ئەمەش مانای ئەوەنیە لوتکەی سیاسەتە شێوێندراوەکەی مکیافیللی بێ ، نەخێر، مرۆڤ ئەوەیە دەستەواژەی بەرێز بۆ وتەکانی دابنێ و سیاسەت بخاتە چوارچیوەیەکی دیار و رەفتاری پێبکا، میریش دەبێ هەردەم بە کەسێکی دلۆڤان و بەزەیی و چاکەخواز نیشان بدرێ و رەفتار بکا ، خاوەن پەیمان و ووتەی راستی خۆی بێ ، بۆیە دەبێ میر هەمیشە ئەقلی لە ئامادە باشی دابێ بۆ کاری چاکەو رەفتاری باش، تا لەگەل ئاراستەی رەشەبادا بێتەوە، ئەمە خەسلەتەکانی میرن .

مێژوو ئەوەمان نیشان دەدا کە بە درێژایی مێژوو هیچ کاتێک میرێک نەبوە بەدەر بێ لە خەراپە، هیچ کەسێکیش بەم شێوەیە نەبوە، ئەگەر ناچار کرا دەبێ روو لە خەراپە بکا لەپێناو بەرژەوەندی ولات ودرێژەدان بە حوکمرانی ، ئەمە ناوبانگێکە بە مرۆڤەوە نوساوە لەگەلیدا هاوتایە، ئەمە راستیەکانە ئەگەر دانی

پێدابنێین یانا ، ئەگەر پێمان خۆش بێ و ناخۆشبێ ، ئەمە لایەنە مەترسیدارەکە نیە لە راکانی مکیافیللی کە دیدی ئەو لەگەل زاناکانی تر جیایە، هەرچەندە هەردوکیان هەمان شت دەبینن بەلام ناتوانن هەمان شت بڵێن ، ئەوەی مکیافیللی وتویەتی راستیی دۆخەکانە ، ئەو راستیەیە کە دەبێ میر بەو شێوەیە بێ تا لەگەل دۆخ و هەلس و کەوتەکاندا بێتەوە . بەلام کارەساتەکە لەوەدایە کە مکیافیللی لە میری ویستوە ئەویش دلۆڤانی و بەزەیی و چاکە و هەست کردن بە مرۆڤایەتی و پەیماندان ودلسۆزی و ئاینداربیە ، ئەمەش کارێکی سەختە ، زۆر بە دەگمەن زانراوە مرواری لە بیابان دۆزرابێتەوە ، ئەگەر هەموو میرەکان ئەوەیان بکردبایە کە مکیافیللی لە میرەکانی خواستوە ئەوا مێژوی ئەوان بێ لاپەرەی رەش دەبوو .

## مکیافیللی .. سیاسەت یان رەوشت

----------------------------------

پرسی پەیوەندیی نێوان سیاسەت و رەوشت لە کتێبی میر، بە ئالۆزترین پرسی ئەم کتێبە دادەنرێ ، زۆربەی لێکۆلەرەوەکان وای دەبینن کە لەم کتێبەدا هێز وتوندوتیژی بۆتە فاکتەری ئاراستەکردنی هێلەکانی حوکمرانی و هەردەم جەختی لە وەلانانی سنورەکانی رەوشتی کردوەو هەموو شتێکی بە حەلال وئاسایی زانیوە ، دانی بەو کۆت و بەندە کۆمەلایەتیانە نەناوە کە لەپێناو سیاسەت هیچ بەهایەکی بۆ دانانرێ، لەپێناو گەیشتن بە ئامانجەکان هەموو رێگەو رەفتارو شێوازەکانی بە رەوا زانیوە، تەنانەت ئەوانەی نایاسایی و نا شەرعیشن.

ئەگەر پێناسەی سیاسەت بە مانا سادەییەکەی بریتی بێت لە بەرێوەبردنی ئەو کارو بارانەی دەولەت کە سودیان بۆ تاک و کۆمەل هەیە ، کەواتە رەوشت کۆمەلە پابەندی و هەلسەنگاندنێکی نمونەیین، ئەوانەی رەفتارەکانی مرۆڤ ئاراستەی چاکە دەکەن .

ئابەم شێوەیە سیاسەت و رەوشت بە هاوبەشی لە بنیات نانی جۆرێک لە پەیوەندیەکانی مرۆڤایەتی و دۆزینەوەی شێوازێکی هاوبەش بۆ ژیانی مرۆڤ بەشدارن ، بەلام ئەوکاتە لەیەک جیا دەبنەوە کە دەیانەوێ چارەسەری سیاسیانە

یا رەوشتیانە بۆ کێشەیەک ببیننەوە ، لەم روەوە هەریەکەیان بە ئاراستەیەک رەفتار دەکاو بەدوای چارەسەریە تایبەتیە کەی خۆیدا دەگەرێ، کە هەندێک جار ئەوەندە لەیەک دورن تەنانەت بە پێچەوانەی یەکترو بەلکو بە دژی یەکتر دەجولێنەوە ، ئەمەیە کە مکیافیللی و هزروبیرەکانی توشی رەخنەدەکا ، لە کتێبی (میر)، مکیافیللی چارەسەری سیاسیانە دەخاتە بەردەمی میر(پادشا) ، داوای لێ دەکا کە دەبێ لە رەوشت دورکەوێتەوە پاساو بۆ هەمو ورەفتارە بەد رەوشتیەکان دەهێنێتەوە ئەویش پاساوی چارەسەری سیاسیانەی کێشەکانە، کە بۆ میر دەبنە بنەمای رەخنەو دژایەتی کردن، تەنانەت لەلایەن هەندێک لە دۆست و هاورێکانیشی ئەم دژایەتیە دەبردرێ بەرێوە.
کەواتە بە تێگەیشتنی سیاسیانە ، رەوشت بریتی نیە لە چەپکە داب و نەریتێکی باو لە ئازادی و وەفاداری و راستگۆیی کە لە سیاسەت و کاری سیاسیدا بایەخ وئەهمیەتی هەبێ و ببنە بنەمای پەیوەندیەکان ، بە مانایەکی تر چین ئەو بەرەنگاربونەوەو پێوەرە رەوشتیانەی روبەروی سیاسەتمەداران دەبنەوە کاتێک رێگەیەک هەلدەبژێرن و ئەویتر رەت دەکەنەوە ؟ جا ئەم پێوەر یا رێگایانە پشت بە مەبەست دەبەستن یا بە شێوازی چارەسەری یا بە بەها مرۆییەکان ؟
ئەمەیە پرسەکە ، بەلام ئە و شێوەکاریەی کە مکیافیللی دەی وروژێنێ بریتیە لەو گوتەیە :
ئەمە چەند راستە کە دەڵێن (دادپەروەری هەر ئامانجێک لای خاوەنەکەی رەوایەتیی پێدەدا کە سەرفرازبێ لە بەکار هێنانی هەر رێگە چارەیەک لە پێناو گەیشتن بە ئامانج ، تەنانەت ئەگەر داب و نەریت وبەها مرۆییە کانیشیان خستە ژێر پا ؟)
بۆهەندێک رەوایە کاتێک باس لەوە دەکەن کە مکیافیللی ئەو گوتەی تۆلستۆی رەت کردۆتەوە کە دەڵێ :
( چۆن ئاگر ئاگر ناکوژێنێتەوە ئاوەهاش شەر شەر لەناو نابا) ، یا باس لە پێشەنگەکانی ئاشتی دەکا وەکو مهاتم غاندی و مارتن لۆسەر کینگ و نیلسۆن ماندێللا ، کە بە زیرەکی خۆیان توانیان ویژدانی مرۆڤایەتی بەخەبەر بێننەوە وبەرگری لە ستەم و زۆرداری و داگیرکاری بکەن ، ئەوەتا گەلێک کەس دەلێ هیچ کاتێک گەلی هیندی وخواروی ئەفریکا ئەگەر بە پالپشتی ئەو خەباتە سەختە ئاشتیانەی گاندی و ماندێللا نەبوایە ، بە دیموکراسی وئاشتی وئازادی و رزگاری نیشتمانی شاد نەدەبون .

لەبەرامبەردا دەڵێن ، هیتلەر هەردەم لەژێر پێخەفەکەی خۆیدا کتێبی( میر) هەبو وبەر لە نوستنی دەیگرتەدەست وزۆر دلی بەوە گوتەیە خۆش بوو کە دەڵێ:
( ئامانج پاساوە بۆ رەفتار) ، هەمان چیرۆک لەسەر ستالین و فرانکۆ و مۆسۆسلینی وگەلێک دیکتاتۆری تر دەگێرنەوە کە دلْیان بە رەوایەتی دکتاتۆریەت وستەمکاری خۆیان خۆش بوو ، بە بیانوی گەیشتن بە ئامانج ، بەلام چ ئامانجێک لەسەر خوێن وئێسقانی میللەتان بنیات بنرێ بە نارەوا و لەسەر خاک ومولکی خەلکە بێ تاوان و سڤیلەکان .
دەستگرتن بەسەر دەسەلات و مانەوەی لە بەرژەوەندی چەند کەسێکدا یا کۆمەلێکی سیاسی و لەسەر حسابی کۆمەلێک خەلکی بێتاوان و بە نادلْی ئەوان، دەبێ لە رێگەی بەکار هێنانی هەمو رەفتارەکانی توند و تیژی و کوشتن و تالانکردنێکەوەبێ کە خۆیان پرۆپاگەندەی باشی بۆدەکەن، گوایە بۆ بەرژەوەندی خەلکە ، دواتر دێن هەندێک دەستەواژە بە ئارەزوی خۆیان لەسەر ئەوکەسانە بەکاردێنن کە بەرگری لە بەژەوەندیەکانی گەل دەکن وبەرەنگاری ستەم و زۆرداری دەبنەوە، بە ناپاک یا دژی بەرژەوەندیەکانی گەل، تاوانباریان دەکەن، هەر دەستەواژەیەک کە بیانەوێ و بەهۆیەوە شایەستەی لەناوبردن بێ، بێ گوێدانە هیچ یاساو رێسایەکی رەوشتی وکۆمەلایەتی و مرۆڤایەتی، دەیخەنە پال ئەوکەسەی بیانەوێ .
ئەمان جەخت لەوە دەکەنەوە کە نەبونی ئازادی و نەهێشتنی سنورەکان بێگومان پێشەکیە بۆ کوشتنی بنەما مرۆییەکان و رەوشتی مرۆڤایەتی، لە بەرانبەردا چەسپاندنی گرێبەستە کۆمەڵایەتیەکان لەسەر بنەمای دیموکراسی و سەروەری یاساو مافەکانی مرۆڤ باشترین کەش و هەوای تەندروستە بۆ پەیوەندیەکانی نێوان سیاسەت و رەوشت کە هەریەکەیان مافی ئەویتر دەستەبەر دەکاو سیستەمێکی هاوبەش دەخولقێنن، کەوایە سیاسەت ورەوشت دوو روی لەیەک جیان، زۆر ئەستەمە یەکێکیان ئەویتر لە خۆبگرێ، بەلام دەکرێ هەردوکیان یەکخەین و دۆخێکی ئازاد ومامناوەند بخولقێنین، چونکە هیچ کاتێک چاکەی سیاسی و چاکەی رەوشتی لە کەش و هەوایەکی هەڵچونی و توندرەوانە وپێشێلکردنی مافەکانی مرۆڤ و نەبونی دادپەروەری و یەکسانی، نابوژێتەوە.
بیرمەند و زانایان لە سەردەمی ئەفلاتونەوە ئەو جیاوازیەیان بەدی کردوە کە لە نێوان خەلکانی بەدرەوشت و بەدواکەوتوانی حەز وهەوەستە تایبەتیەکانی خۆیان لەگەڵ ئەوانەی وێرای بونی مافی تەواوی سروشتیی سڤیلی و سیاسیی خۆیان کاریان بۆ چاکەو سودگەیاندن بەخەلک کردوە کە دیموکراسیان کردۆتە بژاردەی

یەکەم بۆ بنیاد نانی کۆمەڵگایەکی مرۆڤدۆست و یەکسان، هەروەها کار بۆ چەسپاندنی بنەماکانی رەفتاری سیاسی و رەوشتی مرۆڤایەتی دەکەن و روبەروو بەرەنگاری رەوشتی توندرەوانەو رەفتارە بەربەریەکان دەبنەوە بۆ یەکلایی کردنەوەی کێشە سیاسیەکان.
بەم شێوەیە نیکۆلای مکیافیللی سیاسەتمەداری پراگماتیست ،لە سەدەی شازدەهەم کتێبی (میر) دەنوسێتەوە کە هەموو ئەو بانگخوازانەی مرۆڤایەتی و ئازادی ودادپەروەری بەم کتێبە دەحەپەسێنێنێ و توشی شۆکیان دەکا ، چونکە لەم کتێبەی (میر) ،مکیافیللی رێنماو ئامۆژگاری و بەڵکو دەستور بۆ میری دکتاتۆر دەنوسێ ودادەرێژێ، بەهۆیەوە رەوایەتی و شەرعیەتی بەو کارە درندانەییانەو زولم و ستەمکاریەکانی میر دەدا کە بەرانبەر بەو گەلە بێدەسەلاتە بەکار دێنێ ،دیارە ئەمانەش لەژێر پاساوی پراگماتیزم بەجێ گەیاندنی لە بەرژەوەندی و سەقامگیربونی حوکمرانیەکەیاندا دەبێ .
لەم کتێبەیدا مکیافیللی رق و کینەی لە کەلیساو پیاوە ئاینیەکان دەرکردوە ، زۆر بەرونی باسی لە جیاکردنەوەی ئاین لە سیاسەت کردوە ، ئەمەش ئەوەی لێکەوتەوە کە رەوشت لە سیاسەت جیابکرێتەوە ، بەبیانوی ئەوەی رەوشت، سیاسەت گەندەڵ دەکا ولە کاریگەریەکانی کەمدەکاتەوە بەهۆیەوە پابەندی هیچ رێنماو یاسایەکی رەوشت نەبوە.
بەبۆچونی مکیافیللی رەوشت سوکایەتی بە مرۆڤ دەکا و ئەم دونیایە رادەستی پیاوە ئازاکان دەکا، بۆیە دژایەتیی دەکردو گورزێکی مەزنیشی لە ئاینی کریستیانی وەشاند ، بەهۆیەوە ئاینی وەسەنی ی پێ باشتر بوە لە ئاینی کریستی، چونکە دووەمیا دروشمی خاکی و خۆشەویستیی بەرزکردۆتەوە ئەوەتا حەزرەتی عیسا سلاوی خوای لێبێ دەفەرموێ:
ئەوەی شەقازەلەیەکی دا لە رومەتی راستت، رومەتی چەپی بۆ ئامادەکە تا لەویشیان بدا .
مکیافیللی بۆچەسپاندنی رەوشت دەگەرێتەوە سەر بڕواکانی سۆفستائی و گریکەکان بەگشتی.
ئەم رەوشتەی مکیافیللی دوای بەسەرچونی سەدەیەک تەواودەبێ ئەمیش ئەوکاتەی(توماس هوبر 1588-1679) تەواوی دەکا .
ئەگەر مکیافیللی لە فەلسەفەی گریکی رەوشتی هێزی سۆفستائیی وەرگرتبێ ، ئەم دەستەواژەی( هێز پاساوی رەفتارە) ی خستبێتە سەر، کەوابێ هۆبز بریاری دا لە فەلسەفەی گریکی رەوشتی ئەبیگۆریەکانی بخاتەسەر، ئەوانەی لەسەر بنەماو

بروای خواپەرستی بنیات نرابون کە دەڵێ ( ئەگەر گورگ نەبیت گورگ دەتخوا) واتە رەوشت دەبێ لەسەر بنەمای مادەو سود وەرگرتن و رەوشتی بازار بێ ، بەلام بەرزترین ودیارترین نوێنەری بروادارانی فەلسەفەی،( رەوشتی هێز) لە فەلسەفەی رۆژئاوای نوێ ، فریدریک نیچەیە( 1844-1900) ئەوکەسەیە کە هەموو کەلەپوری فەلسەفەی کۆنی لا کۆببوەوە ، وێرای ئەوەی کە لە ژێر کاریگەری بیردۆزەکەی داروین دابو ئەوەی تایبەتە بە (هەلبژاردنی سروشتی و مانەوە بۆ بەهێزترینیان) (نیچە) خۆی خاوەنی بروای (بەرزترین و بەهێزترین مرۆڤ)بو، ئەمیشی لە فەلسەفەی زەردەشتی وەرگرتبوو و پەناشی بۆ زانستی زیندەوەری داروین بردبوو ، ناپلیۆن و هابس و بسماریکیشی بەدڵ بوو .
ئالێرەوە دەتوانین بڵێین کتێبی (میر) دەروازەیەکە بۆ زانستی سیاسەتی نوێ، مکیافیللی جۆرەکانی دەسەلای بە شێوەیەکی جیاواز پۆلین کردبو وخستبویە روو ، جیاوازیەکەی لە واقعبینانەی توند و بەرەنگاربونەوەو پێداگریی توندی پێداویستیەکانەوە بوو .
بەلام ئەمە ئەوە ناگەیەنێ کە نوسەر لە ژێر کاریگەریەکانی ئەرستۆدا نیە کە سیاسەتی لەلوتکەی زانستە جێبەجێکاریەکاندا داناوە، لە خوار ئەویش ئابوری و رەفتارە کەسیەکان دێن ( دەروونناسی).
ئەرستۆ بایەخی بە لێکۆڵینەوە لەسەر خەسلەتەکانی حکومەتە باشەکان داوە، ئەوانەی بروایان بە ژیانێکی شایەستە هەیە بۆ هاولاتیانیان ، لە کاتێکا مکیافیللی ئەم تەوەرو دەستەواژەیە رەتدەکاتەوەو لێی یاخی دەبێ ، بەوە رازی نابێ ئەم داخوازیانە لە بەراییەکانی حکومەت دا بن ، بە بۆچونی ئەو مسۆگەر کردنی حوکمرانی دەبێ لە بەراییەکانی حکومەتدا بن، حکومەتێکی بەهێز و کاریگەربۆئیتالیا زەرورە کە بتوانێ ئیتالیایەکی یەکگرتوو دەستەبەربکاو لە دەست پیاوە ئاینیەکانیشی وەدەرنێ .
ئا لێرە جەخت لەسەر میر دەکاتەوە، رۆلی میر بەرز دەنرخێنێ، میر دەبێ ئاشناییەکی باشی لەگەڵ سوپادا هەبێ و هەماهەنگیی بکا بۆئەوەی ئەم سوپایە بتوانێ کورسیی دەسەلاتی میر بپارێزێ و لە مەترسیەکانی دوربخاتەوە ، دوای سوپا دەکرێ سیاسەت وەکو هونەرو فاکتەری دلخۆشکەر بەکاربێنێ .
بەلام مەرج نیە هەموو کاتێک دەسەلات لە رێگەی دلخۆشکردنی هاولاتیانەوە پشتیوانی وەدەست بێنێ ،چونکە پرسەکە پەیوەندیی بە حەز و هەوەستی خەلک و شێوەی مامەلەکردنی لەگەلیاندا هەیە ، ئەوکات میر پەنا بۆ هێز دەبا ، نوسەر

ئەوەش ناشارێتەوە کە ئاستی بەکار هێنانی هێز پەیوەندیی بە کەسایەتی میرەوە هەیە .
ئابەم شێوەیەدا مکیافیللی لە کتێبەکەیدا بنەمای زانستی سیاسیی نوێ مان پێدەبەخشێ کە بەشێکی باشیشی لە دەروونناسی و پەروەردەی تێکەوتوە.
بەلام ئەو داوا دەکات کە بۆ پشتگیری میر میرێکی ستەمکار بەکار بێنێ ، ئەو میرەی هەموو شێوازەکانی ستەمکاری و زولم و زۆرداری و توندکاری لەخۆی بەرەوا دەبینێ بەبیانوی یەکگرتنەوەی ئیتالیای پارچەکراو بەسەر شارو دەولەتدا، بۆئەم مەبەستە دەبێ روبەروی کۆمەلێک پادشاو حکومەت ببێتەوە، لە سەروی هەمویان حکومەتی فرەنسا.
لێرە مکیافیللی پێغەمبەرێکی چەکدار(میر) بۆ ئیتالیا بە پێویست دەزانێ، بۆ ئەوەی بتوانێ روبەروی ئەو پادشایانە ببێتەوە کە دەوری ئیتالیایان داوەو چاویان بریوەتە سامان و خاکی ئیتالیا.
ئەم وایدەبینێ کە سروشتی جەماوەر وا خولقاوە بۆ پشتگیری کردنێکی کاتی بەئاسانی رازی بکرێ بەلام بەردەوام بونی ئەم رازیبونە کارێکی ئاسان نیە ،ئەمە سروشتی ئەم جەماوەرەیە، ناسەقامگیرو رارا لە بریارەکانی ، ئەمە دۆخەکەیە جا ئەو میرەی دەیەوێ چاکسازی بکا دەبێ ئەم راستیانە باش بزانێ و بروای پێ هەبێ چونکە ئەم دۆخە هیچ کاتێک بەئامادەکراوی بۆی نایەتە دەست ئەگەر هێز بەکار نەهێنێ ، ئەمە تەنها بروای مکیافیللی نیە بەلکو هەریەک لە زانایان (موسی ، قورش، تیزس، رومالوس) لەسەر هەمان بروابون.

## مكیافیللی و دەستەواژەی( مەبەست پاساوی رەفتارە)

---

ئەم دەستەواژەی سەرەوە بە ناشیرینترین سایكۆلۆژیەتی دەسەلات دادەنرێ ، ئەمە ئەو وێنەیە بوو كە مكیافیللی لە سەدەی شازدەهەم لە كتێبی( میر )بۆ دەسەلاتی كێشاوە.

لەو كتێبەیدا مكیافیللی چۆنیەتی گەیشتن بە دەسەلات و خەسلەت وبنەمای رەوشتی و ئایدیۆلۆژیی بەرپرس دیاری دەكا ، هەروەها تیادا دیاری كردوە كە ئەم خەسلەت و رەفتارانەی بەرپرسان هەرچەندی لەگەل داب ونەریتی ئاینی وكۆمەلایەتی و مافەكانی مرۆڤیش نەیەنەوە ، گرنگ نەبێ .

گرنگترین ئەوەی كە مكیافیللی پێی ناسراوەو بەهۆیەوە ناوبانگی دەركردوە، ئەو دەستەواژە بێ رەوشتیە بو كە دەڵێ ( مەبەست پاساوی رەفتارە) واتە لە پێناو گەیشتن بە ئامانج و مەبەستەكان هەموو رەفتار وشێوازەكانی مامەلە بە رەواو دروست دەبینێ، تەنانەت ئەو رەفتارانەی بەدەریشن لە داب ونەریتە ئاینی وكۆمەلایەتی و دادپەروەریەكان ، بەدیدی ئەو هیچ پەیوەندیەك لە نێوان رەوشت و سیاسەتدا نیە .بەلای مكیافیللی لە پێناو گەیشتن بە ئامانج گرنگ نیە درۆ بكەیت ، دوزمانی وخۆپەرستی و پەیمان شكاندن هەمویان رەوان، ئەگەر لە بەرژەوەندی مانەوەی حاكمدابێ لە سەر لوتكەی دەسەلات .

مکیافیللی حوکمرانەکانی راسپاردوە کە درۆ و فرت و فێل و نانەوەی فتنە بەبێ شەرم و ترس بیکەن ، چونکە ئەمانە فاکتەری گەیشتنن بە کورسیی دەسەلات و گرنگترین مەرجی مانەوەن ، وادیارە ئەوەی نەزانیوە کە دوای 47 سالی تر خوێندکاری ئەو دەردەکەون کە زیاتر سود بە خەلک دەگەیەنن و زیاتر بروایان بەو هزرانە دەبێ کە لە کتێبەکەی (میر)دا هاتوە.

ئەم بروابونەی مکیافیللی بە سیاسەت، خۆی لەو دەستەواژە دەبینێتەوە کە پێشتر وتویەتی(مەبەست پاساوی رەفتارە) ئەمە تاچەندی دژی ئاین و رەوشت و چاکەبێ گرنگ نیە.

زۆربەی حاکمەکان بینیان کە ئەوان شەرعی نین، هەروەها پابەندی هیچ بنەمایەکی رەوشتی وچاکەش نین، بەلام توانیویانە بگەنە دەسەلات و سەقامگیریش مسۆگەر بکەن بە مانەوەی خۆیان لە لوتکەی دەسەلات.

مکیافیللی لە کتێبی میر بە راشکاوی رەوشتی باوەرپێکراو رەتدەکاتەوە کە تایبەتە بە رەفتارو هەلس و کەوتی حاکمەکان، چونکە حاکم ئەگەر پابەندی رێنماو بنەما رەوشتیەکان بێ ناتوانێ هیچ جولەیەک بکاو ماندوو دەبێ ، بە پابەند بون دەست وپەنجەکانی دەبەسترێن ، بۆیە دەبێ وەکو گورگ مەکرباز بێ ئازاش بێ وەکو شێر، واتە هەرشێوازێک بێ دەکرێ لە پێناو دەست گرتن وکۆنترۆلکردنی دەسەلات بەکاری بێنێ .

لە کتێبەکەیدا لە بەشی هەشتەم دەلێ:

( دەبێ میر یا حاکم لەو پەیمانانەی کە سودیان بۆ ئەو هەیە بەوەفابێ، بەلام ئەوانەی سودیان بۆ ئەو نیە دەبێ گوێیان پێنەدا وبیانشکێنێ ).

هەروەها دەلێ :

( لەکاتێکا زەرورە کە میر ئەم خەسلەتانە لە خۆیدا بشارێتەوە، دەبێ بانگەخواز و زەلال بێ ،بە شێوەیەک مرۆڤ لە بەردەمیا نوێژی بۆ بکەن و سوجدەی بۆ بەرن ، تا ئەو ئاستە خەلک چەواشەبکا کە خەلکە نەزانەکە ئامادەبن بۆ فریودان. دەبێ وا خۆی نیشان بدا کە کەس لەو زیاتر خەمخۆری ئەوان نیە و پێویست بە کەس نەکا هاوکاریی بکا لە پێداگری و جەخت کردنەوە لەسەر وتەکانی، دەبێ شارەزاییەکی باشی لەگەل ئەم شێوازانە هەبێ) .

مکیافیللی گەیشتە ئەو بروایە کە پێویست ناکا میر پابەندی ئەو بنەما رەوشتیانە بێ کە مرۆڤی ئاسایی پابەندیەتی، بەلام دەبێ وا لە سیمای دیاربێ کە پابەندەو ئەو لە سەروی هەموو ئەو رەوشتانەوەیە .

فەلسەفەی مکیافیللی پشت بەو دیراسەتانە دەبەستێ کە مرۆڤی گەیاندە ئەو سەرکەوتنانە و بەمەبەست گەیشتن ، ئەگەر ئەو سەرکەوتنانە سەرکەوتنی کاری توند و تیژیش بوبن ، چونکە نمونەی بێبروا سەرکەوتوەکان بەژمارە زیاتر بوون لە نمونەی خواپەرستە سەرکەوتوەکان ، رەفتار و شێوازی بێبرواکانیش دژی رەوشت وچاکە بوو لە ژێر رۆشنای دەستەواژەی ( مەبەست پاساوی رەفتارە) کە بۆتە پاساو بۆ کارە نارەواکانیان .
مکیافیللی بینیی پاساوی رەفتارەکانی دور لە رەوشت لە بازنەی سیاسەت و رەوشتی حاکم و دەسەلاتدارەکاندا دەگەرێ.
ئەم ئاراستە نادروست و نامۆیەی دور لە رەوشت و مرۆڤایەتی ئەگەر، بەگشتی وەری بگرین دەبینین ئەمە رەوشت ورەفتاری هەموو زالم و ستەمکار و تاوانبارە گەندەلەکانە لەسەر روی زەوی ، پێش مکیافیللی وپاش ئەو ، لە سیاسەت ولە دەرەوەی سیاسەتیش.
فەیلەسوپی خوانەناس (برتناد رسل) بەسەریدا سەپێندرا کە لایەنگری هزری مکیافیللی بێ ، دەڵێ:
( فەلسەفەی سیاسەت لای ئەو زانستێکی تاقیکراوە ، لەسەر بنەمای ئەزمونی تایبەتی خۆی و شارەزایی لە کاروباری گشتی بنیات نراوە، تایبەتە بە پێشخستنی ئامراز یا رەفتارەکان پێشی مەبەستە دیارەکان ، بێ گوێدانە ئەوەی ئەم مەبەستە چاکەیە یا خەراپە، کاتێکیش رێگە بە خۆی دەدا ئەم مەبەستانە ئاشکەرا بکا ئەوکات دەبێ هەمومان بەپێی توانا بوژانەوەی بۆ بکەین .
بە سوک و ئاسانی بروای ( مەبەست پاساوی رەفتارە) دەبێتە هۆکار ورێگەچارەی توندو تیژی وستەم و زولمکاری و زۆرەملێی رەوا ، چونکە ئەوەی بروای بە پیادەکردنی ئەم دەستەواژەیە هەبێ دەیگەیەنێتە چاکەو ئارامی و ئاسایش ، بەلام ئازادی بیرکردنەوە لە مێشک وەلادەنێ ، ئەوکات پادشا لە رەخنەگرتن بەدەر دەبێ ، ئەو (پادشا) هیچ کاتێک هەلە ناکات تەنانەت ئەگەر هەلەشی کرد نابێ بەرویدا بدرێتەوە، چونکە ئەو هەمیشە قوربانی وخەباتگێرە، تەنانەت ئەگەر تاوانکاریش بوو .
نیکۆلا مکیافیللی(1469-1527) بە پێویستی دەزانێ جیاوازی لە نێوان سیاسەت ورەوشت دا بکرێ، هەروەکو پێشتریش ووتمان چونکە هەریەکەو گۆرەپانی جیای خۆی هەیە ، هەروەها جیاوازیش لە نێوان رەوشتە گشتیەکان ورەوشتی تایبەتیشدا بکرێ ، چونکە سیاسەت هەندێک شت بەسەر رەوشتی گشتیدا دەسەپێنێ کە جیاوازیان هەیە لەگەل ئەوانەی بەسەر رەوشتی تایبەتیدا سەپاندوە ، مکیافیلی وا

دەبینێ کە بابەتی جغزی چالاکیەکانی کۆمەلایەتی بریتیە لە دەستگرتن بەسەر دەسەلاتدا (دەسەلاتی دەولەت) دواتر پاراستن و راگرتنی، دواتر رۆلی درۆو فرت و فێل وچەواشەکاری پەیمانشکاندن و هەندێک جاریش بەکار هێنانی هێز دێت کە رۆلی گرنگ لە وقۆناغەدا دەگێرێ بۆ کاری سیاسەت.

ئەم کارو رەفتارانە بۆ میر هیچ شەرمەزاریەک ناهێنێ، چونکە میر ئەو بوارەی نیە خۆی پابەندی بنەما وداب و نەریتە رەوشتیەکان بکا تا کاری دەولەتی پێ بەرێوە ببا ، ئازایەتی وچاکە وباشی میر لە سەرکەوتنیدایە لە بەرێوە بردن و دەست گرتنی بە کورسیی دەسەلات ، بەم رێگەیەوە سیاسەتەکانی خۆی لە بەرێوە بردنی کاروباری دەولەت جێبەجێ بکا.

ئەوەی شیاوی باسە عەرەبەکان سیاسەت بە بەشێک لە رەوشت دەزانن (کەس بەدۆی خۆی نالێ ترشە.و) ئەمەش بۆئەوە دەگەرێتەوە کە هەندێک دەڵێن عەرەبەکان لەمەیاندا لەژێرکاریگەری گریکەکان بونە، کاتی خۆی فەلسەفەی کۆن و مامناوەندی هەمویان سیاسەتیان بە رەوشت تێکەلاو کردوە ، لەم بوارە مکیافیللی یەکەم کەس بوە لە هزری فەلسەفی لە کتێبی (میر) لەیەکی جیا کردونەتەوە .

**بەشداریەکانی مکیافیللی لە هزری رۆژئاوایی**

---------------------------------------

مکیافیلی بەم شێوەی خوارەوە بە کتێب و بیردۆزەکانی بەشداریی لە هزری رۆژئاوایی کردوە :

**1/ شۆرشی ئەقلی ئەوروپی**

لەوکاتەی مکیافیللی رەخنەی لە کەلیساو پیاوە ئاینیەکان گرت بەوەی ژیانی رابواردن و خۆش گوزەرانی دەژیێننەوە و لەودیو شورەی کەلیساکان لەوپەری ژیانی خۆش دەگوزەرێنن و داوا لەو خەلکەش دەکەن رەزیلی بکەن و دەست بە هەموو شتێکەوە بگرن و بە نەبونی وقات وقری ببەن بەرێوە ، لەوکاتەوە خەلک بروای بە کەلیساکان کەم بۆوەو متمانەیان بە قسەکانیان نەما ، مکیافیللی پێی وایە کەلیسا سەرچاوەو لوتکەی شەر و نەهامەتیە، بناغەی گەندەلی و هۆکاری یەکەمی روخانی برواکانی ئاینیە، لەم روەوە دەڵێ ( چەندی ئەو خەلکە لە کەلیسای رۆما نزیک دەکەوێتەوە کە لوتکەی ئاینی ئێمەیە، ئەوەندە لە ئاین پەرستی دوور دەکەوێتەوە و بێ ئاین دەبێ )

لە راستیدا رەخنەکانی تەنها کەلیسای نەگرتەوە بەلکو رەخنەی لە هەموو ئاینی کریستی گرت پێیوابوو کە ئاینی کریستی سوکایەتی بەمرۆڤ دەکاو ئەم دونیایە رادەستی پیاوە ئازاکان وخەلکانی توندوتیژ و بەغیرەت دەکا ، بۆیە ئەو ئاینی وەسەنیی پێ باشتر بوو لە ئاینی کریستی، چونکە ئاینی وەسەنی تەندروستی و هێز بەرز دەنرخێنێ و ریز لە قارەمان و سەرکردەکان دەگرێ ، بەلام کریستی بانگەشە خاکیایەتی ولاوازی دەکا.

بەهەر حال ئەوەی لەسەر مکیافیللی زانراوە ئەوەیە کە چەسپێنەر وداکۆکیکاری رەوشتی هێزە ، ئەو رەوشتەی کە سۆفستائیەکان ئەوکاتە بانگەشەیان بۆ دەکرد کاتیک بینیان دادپەروەری مانای پشراستکردنی گەورەیی هێزە لەسەر لاوازەکانە ، یاساش لە داهێنانی لاوازەکانە، هێزیش بەلای راستی دایە .

دواتر ئەم کێشەیە لە پاش مکیافیللی لەسەر دەستی زانای ئەلمانی نیچە(1844-1900) دەتەقێتەوە ، نیچە خەریک بوو ملیۆنەها هەژار وبێدەسەلات لەناو بەرێ چونکە بروایان بە پالەوان و مرۆڤی بەرزتر هەبوو، بە بروای ئەو هێز شوێن رەوشت دەگرێتەوە ،ئەمە گوتەیەکی مکیافیللیە کە دەڵێ:

( کریستیان هۆکاری چەسپاندنی رەوشتی کۆیلایەتی بوو ، بیردۆزی مانەوە بۆ بەهێزترینیانە ی داروینیش هەنگاوێکە بەرەو ئەو ئاراستەیە).

گرنگترین ئەوەی لەسەر مکیافیللی زانراوە ئەو دەستەواژەیە بوە کە دەڵێ:

( مەبەست و ئامانج پاساوی رەفتارن) بۆیە دەبێ حاکم مەکربازبێ وەکو گورگ، توند وهار بێ وەکو شێر، زولمکەر بێ وەکو رێوی ، دەبێ بزانێ کەی لە خێر و چاکە دور دەکەوێتەوە ، ناوە ناوەش هەراو ناکۆکی بنێتەوە ، لە خەراپەکاری بەردەوام بێ و کار بەو بروایە بکا کەدەڵێ :

( لەیەکیان جیاکەوە تا بەسەریاندا زاڵ بی) ئەمانە بۆ مەبەستی مانەوە لەسەر دەسەڵاتە .

لەهەمان کاتدا دەبێ خۆی لەم جۆرە خەسلەتە ناشیرنانە بشارێتەوە کارێک نەکا پێیەوە دیار بێ ، هەردەم خۆی بە بانگخوازێ چاکەو کاری خێر نیشان بدا، لەوکاتانەی ئەو کارە شەرمەزاریانە دەکا دەبێ وەکو رەوشت بەرزێک خۆی نیشان بداو بێتە بەرچاوی خەلک.

ئەمە بیروراکانی مکیافیللی بون کە بەهۆیانەوە شانی لە شانی کەلیسای ئیتالیا دەدا، ئەمەش هاوکات بوو لەگەل شۆڕشەکەی مارتن لۆسەر (1483-1546) لە ئەلمانیا لە سالی 1518کە لە پێناو چاکسازی ئاینی وکەم کردنەوەی دەسەلاتەکانی پاپا لەسەر کەلیساو حکومەت، لە نێو کەلیسا هەلگیرسا ، لە سەرەتا پرۆتستانتی وەکو

راپەرین و جولانەوەیەکی نارەزایی دەربرین بوو بەرانبەر بە فرۆشتنی بەزۆری پلیتی لێبوردن، تا پەرەیسەند بوو بە هەلمەتێکی بەدواداچون و خوێندنەوەی نوێ بۆ کتێبی پیرۆز ، ئەم بزوتنەوەیە هەریەک لە ولاتانی فرەنساو هۆلەنداو ئوسکۆتلەنداو جنێفی گرتەوە.

مارتن لۆسەر بوە مایەی ئەوەی مرۆڤ ئازاد بێ لە خوێندنەوەی کتێبی پیرۆز لێکدانەوەو شیکردنەوە کاندا راو بۆچونی خۆی هەبێ ، خەلکی لە پەیوەندیی راستەوخۆ لەگەل خواوەند ئازاد کرد، پێشتر دەبوایە لە رێگەی پیاوە ئاینیەکانەوە بێ ، نهێنیەکانی کەلیساشی بە ئاشکەرایی هێشتنەوە کە پێشتر ئەویشیان بە نهێنی بوون ، رێگەشی بۆ ئەو خەلکە کردەوە کە دەکرێ لە دەرەوەی کەلیسا کتێب بخوێنیتەوەو خوا پەرستی بکەیت کە پێشتر بە کەلیساوە بەند بوو ، ئەو خەلکەشی لە خوا پەرستی ئازاد کرد، ئەوە بوو تەنها رۆژانی یەکشەممە بۆ خواپەرستی تەرخانکراو لەو رۆژە خەلک دەچونە کەلیسا، باقی رۆژانی تر بە کاری تایبەتی خۆیانەوە خەریک دەبون .

مارتن بەم کارەی ئەو بروایەی سەدان سالی وەلانا کە دەبوایە خەلک لە رێگەی پیاوە ئاینیەکانەوە خواپەرستی بکا، ئەمەش ئازادیەکی بە وخەلکە بەخشی ئەم قۆرخکاریەشی لەدەست پیاوە ئاینیەکان دەرهێنا .

بەم شێوەیە چینی مامناوەندی پێشوازیان لەم بروایانەی مارتن لۆسەر کرد کە خۆیان بە ئازادتر دەبینی و کاتی تەواویان دەبوو بۆ پرژانە سەر کارو کاسبی و پەیداکردنی بژێوی ، بەمە ئاین لە سوچێکی تەسک حەشاردراو خەلکەکە تەنها رۆژێکیان بۆ خواپەرستی وچون بۆ کەلیسا تەرخان کرد، رۆژەکانی تر بەدوای قازانج و بازرگانی دا دەگەران.

ئەوەی بانگەشەی مارتن لۆسەر پتەوو خورتتر کرد، بانگەشەکەی ئیرازمۆس بوو (1466-1536 ) کە زۆر بە توندی هێرشی بردە سەر کەلیسای کاسۆلیک و گالتەی بەو پسولەی لێبوردنە کرد کە بەو خەلکەیان دەفرۆشت، گوایە لە رۆژی قیامەت لە گوناهەکانی دەبورن و پارچەیەک زەویان پێدەدەن ، بانگەشە بۆ دونیای ئێستا دەکردو خەلکی لە دونیای ئاخرە دوردەکردەوەو، پێی رادەگەیاندن کە بایەخ بە دوانیای دوایی نەدەن دونیای ئێستا گرنگە بۆتان ، گالتەی بە بۆچونە بێ بنەمایانەی قەشەکان دەکرد کە باسیان لە چۆنایەتی جل و بەرگەکانیان دەکردو خەلکیان پابەندی کۆمەلێک ئەرک دەکرد، لەم روەوە نوکتەی سەیری لەسەر دەهێنان .

لەم قۆناغەدا کۆبرینکۆس (1473-1543) لە بلاو کردنەوەی بیردۆزە نویٚکەیدا رارا بوو ،چونکە بەم بیردۆزەی گەردونی ئەرستۆ ودیدی مەدرەسەکەی تێک و پێک دەدا ، دواترئەم بیردۆزە کەلیسا پیادەی دەکرد، بە تێکچون و لەناوچونی ئەم بیردۆزە کەلیسا زیانی زۆری پێدەکەوت وسوکایەتیی پێدەکرا ، بیری لەوە کردەوە کە یا لە ناوی بەریٚ یا بەنهێنی لای دۆست وخزمانی باسبکا وەکو فیتاگۆس ، بەلام رێگەیەکی تری گرتە بەر، ئەویش کتێبەکەی پێشکەش بە پاپا کرد و ئیتر بە شێوەیەکی تایبەتی لای تاکەکەس باسی لە بیردۆزەکەی دەکرد ، بەهۆیەوە لە ژیانیدا توشی هیچ گرفتێک نەبوو چونکە کەلیسا بە دروستی نەیدەزانی چی لە ناو بیردۆزەکەیدایە، یاخود لەبەر ئەوە بوە کە ئەوکات بەر لە ئەنجومەنی برنت کەسێکی لیبرالیست بوە چونکە دوای ئەم ئەنجومەنە ئیتر (جزویت) دادگاکانی پشکنینی گەراندنەوەو خەلکێکی زۆریشی چەوساندەوە.
بنەمای دروست بونی ئەو بیردۆزە گۆرینی سەرتاپای گەردونە ، لەجیات ئەوەی گۆی زەوی وەکو بێشکەی مەسیح سەیر بکریٚ کە سەنتەری ئەم دونیایەیە و کەلیسا بروای پێهێناوە ، ئێستا دەبیٚ خۆر(رۆژ) بە سەنتەری دونیا بزاندریٚ گۆی زەوی تەنها هەسارەیەکە لەو هەسارانەی بەدەوری خۆردا دەخولێنەوە، ئەمەش کاسۆلیکەکان رەتیان دەکردەوە، چونکە سوکایەتی بوو بۆ مەسیح وکەمکردنەوەبو لە ئاستی ، بە گەمژەییەکی کوشندە دادەنرا.
کەوابیٚ کوبرنیقۆس ئاستی مرۆڤی دابەزاند و لەو مەرکەزیەتەی کەم کردەوە کە مەسیح پێی بەخشی بوون. بلاو بونەوەی ئەم بیردۆزە لە 1542 بە یەکەم گەمارۆدانی دونیا دێتە ئەژمار ،بەلام تا ئەوکاتەی لە سەدەی حەڤدەهەم (کبلر و گالیلۆ ) پشتگیریان لێی نەکردو چاکسازیان بەسەردا نەهێنا نەبوە باوو، ئیتر جەنگ و ململانیٚ لە نێوان زانست وبروا سربوەکان دەستی پێکرد ، ئەم جەنگە ئەوەبو کە کۆنە پارێزەکان جەنگێکی دۆراویان دژی زانینی نویٚ بەرێوە برد .سەرەرای ئیمانداری کوبرنیقوس بیردۆزەکەی کاریگەریەکی روخانی لەسەر خواگەری کریستیدا هەبوو ، گورزێکی بەهێزیش بوو بەر کەلیسا کەوت، بوە دەستپێک ورێخۆشکەر بۆ جیابونەوەی زانست لە ئاین لە رۆژئاوا بەهۆی روبەروبونەوەی بیردۆزە نوێکانی زانستی لەگەل دەقەکانی کتێبی پیرۆز.
بۆیە هەریەک لە مارتن لۆسەر(1483-1546) و کالفن(1509-1564) ئەم بیردۆزەیان رەتکردەوە ، بەدیدی لۆسەر کوبرنیقوس سەرچاوەیە، چونکە خۆر و مانگ دەبیٚ بخولێنەوە عیسا فەرمانی بە خۆر داوە دەبیٚ وەکو زەوی بمێنێتەوە ، کالفنیش ئەمەی رەتکردەوە ووتی:

دونیا وەستاوە جولە ناکا ، کێ ئەو زاتە دەکا دەسەلاتی کوبرنیقوس بخاتە سەروی دەسەلاتەکانی عیسا؟
ئا بەم شێوە کەلیسا سام و شکۆداری خۆی لەدەستدا لایەنگرانی کەم بونەوەو بەرەکەیان لە ژێرپێ دەرهێندرا.

## 2/ مکیافیللی و گلۆبالیزم

لە ئەوروپا لە ماوەیەکی درێژدا دەستەواژەی ئاین و سیاسەت هاوسەرگیریان کرد ، لەماوەی زیاتر لە چوار سەدە ئەوروپا لە ژێر دەسەلاتی هاوپەیمانێتی (میر و دەرەبەگایەتی و پیاوەئاینیەکانی کریستیانی) ژیا ، هاوپەیمانێتی سیاسەت لەگەل پیاوە ئاینیەکان جۆرێک لە حوکمرانی دەرەبەگایەتیی هێنایە کا ، کە لەسەر بنەمای مولکدارێتیی کشتوکالی دەبردرا بەرێوە ، گوندەکانی کە کۆیلەکان لێی دەژیان پەرش و بلاو بون ، میرەکانیش خۆیان و فەرمانەکانیان پیرۆز ورێزدار مانەوە ، کۆیلەکان لە دورەوە سەیری قەلای میریان دەکردو چاویان لە خواوەند بریبوو.
حوکمرانی میرەکان لە چەرخی ناوەراست چەسپا کە دەتوانین بە چەرخی تاریکی ناوی بنێین ، چەند دەستەواژەیەک لەو سەردەم بونە باو ، پاشکەوتنی ئادەمیزاد ، حەرام، هونەری حەرام، زانستی حەرام، بیرکردنەوە بە کاروباری حوکمرانی حەرام، بلاوبونەوەی دادگای پشکنین، دواتر لەسێدارەدانی زاناکان ، و سەرکوتکردنی بزوتنەوە چاکسازیەکان بە بەرپەرچدانەوەی خوێناوی ، ئەمانە هەموویا بە بەرچاوو بە رەزامەندی ئەو کەلیسایەی کە گوایە لەسەر رێبازی خوا دەروا بەرێوە چو.

سیاسەت لە جوتیار حەرام کرا ، بە بیانوی ئەوە نەگەیشتۆتە ئەو ئاستە کاری سیاسەت بکا ، جوتیاریان لە ریز درەخت و ئاژەل ئەژمار دەکرد کە لە ناو سامانی میردان، چۆن ئاژەل و دارو درەختەکان دەفرۆشران ئاوەهاش ئەو ئادەمیزادانە کە جوتیار بون کرین وفرۆشتنیان لەسەر بوو .
ئیرادەی گەل وون ببو ، هەروەها دەستەواژەی گەلیش بەهەمان شێوە ، لە شوێن ئەوان ئیرادەی میر و کەلیسا شوێنیان گرتبۆوە ، کە ژیانێکی گێرەشێوێن و گەندلکاریان هەبوو بە ئامرازی تۆقێنەر وچەوساندنەوەوە .
ئەم رەوشە تا ئەوکات بەردەوام دەبێ کە رژێمی دەرەبەگایەتی هەڵدەوەشێتەوەو لە بار یەک دەچێ ، لەگەڵ خۆیشیدا هەلوەشانەوەی هاوپەیمانێتی نێوان سیاسەت و ئاین دێنێ ، ئیتر نیشانەکانی چەرخی رێنسانس بەدەر دەکەوتن ، دیارترین دیاردەکانی بریتی دەبن لە بانگەشە بۆ جیاکردنەوەی ئاین لە دەولەت، بە هۆی ئەوەی کە دەولەت لە دەستکردی گەل و بۆ داخوازیەکانی گەل و هەر لە گەلیشەوەیە ، بەلام ئاین بۆ خوایەو لە خواشەوەیە ، ئیتر بیرمەندانی چەرخی رێنسانس رەچەلەکی شارستانیەتی ئەوروپایان بوژاندەوەو بە شارستانێتی گریکی و رۆمانیەوە بەستەوە ، مەسیحیەتیان بە خالی دەستپێکردنی شارستانێتی ئەوروپا دانەنا ، بەدروستی دەستەواژەی دیموکراسی لێرەوە دەستی پێکرد کە لە دەستەواژەکانی گریکیی کۆن بوو :
مانای دیموکراسی دەگەرێتەوە بۆ دوو رەگ ، دیموس کراتیا ، دیموس واتە حوکم کراتیا گەل ، واتە حوکمی گەل یا گەل خۆی حوکم لە خۆی بکا ،ئەم دەستەواژەیە پەرەی پێدەدرێ و لە سەردەستی زانایان، فرنسیس بیکۆن و هوبز و جون لوک و جان جاک روسو وهیتریش گەشەی پێدەدرێ کە لە کۆتاییەکەی تاک دەبێتە مەبەستی سەرەکی لەم پرۆسە سیاسیە ، گرێبەستی کۆمەلایەتیش بوە بنەمای سیستەمی سیاسی بەگشتی.
لەم بوارەدا یەکەم بیرمەندی چەرخی رێنسانس کە ئاینیان لە سیاسەت جیا کردەوەو بە مانا نوێکەی نەخشەی سیاسەتی نوێیان کێشا (مکیافیللی) بوو ، کە دەولەتی لە کاروباری ئاین بێلایەن کرد ووشیاری رەوشتیشی خستە سەروی ووشیاری نەدیار (غەیب)ەوە، بەئامانجی ئەوەی میر بە دروستی دەستی لە سوچەکانی میرنشین گیرببێ و بەهۆیەوە درێژە بە حوکمرانی بدا و لە زیان دورکەوێتەوەو شەرعیەت بە ستەم وزۆرداریەکانی بدا و لە کار و رەفتارەکانی سەرفرازبێ و پابەندی هیچ کۆت وپاسایەک نەبێ ، بەم شێوەیە هەرچی دەستەواژەی چاکەو میهرەبانی ودلسۆزی شەفەق هەیە بخاتە پال میر.

دوای ئەوە توانیی ئاین لە سیاسەت جیا بکاتەوە ئەوروپا توانیی لە هەموو روێکەوەو لە هەموو بوارەکاندا پێشکەوتن بەخۆیەوە ببینێ ، بەهۆیەوە دەولەتی نوێ لەلایەن کۆمەلگاو لەسەر بنەمای رێککەوتن وهاوپەیمانێتی و دارشتنی یاسای گونجاو بۆ بەرێوەبردن دەبردرا بەرێوە ، لەورۆژەوە پەرلەمان بوە تاقە شوێن کە حکومەتەکان دەستاودەستیان پێدەکراو حکومەت شەرعیەتی پێدەدراو هەر لەوێشەوە هەلدەوەشێندرایەوە ، هەر ئەو شوێنەش بوو کە شوێنی کۆبونەوەی گەل و دارشتنی یاساکان یا هەلوەشاندنەوەیان بوو ، کەوایە دەولەت کاروباری کۆمەلگا رێکدەخا بە کاروبارە ئاینیەکانیشەوە ، چونکە دام و دەزگا ئاینیەکان بەشێک بون لە دام و دەزگاکانی کۆمەلگا، مەترسیان لەسەر کۆمەلگا نەبوو . لەوکاتەی ئەوروپا لەوە سەرکەوتنی بەدەست هێنا کە ئاین لە سیاسەت جیا بکاتەوە، توانیی ئازادیەکانی بیرکردنەوەو برواداری بپارێزێ ، دواتر ئەم ئازادیانە بونە ئازادیی پیرۆز کەس بۆی نەبوو رێگریان لێ بکا .

ئەمە لە ئەوروپای کریستی ، بەلام لە ولاتی ئیسلام هیچ ناکۆکیەک لە نێوان ئاین وزانست و بەرژەوەندیەکانی کۆمەلگا رویان نەدا ، ئەمەش بەهۆی سروشتی ئاینی ئیسلامەوە بوو کە بەرژەوەندیەکانی هەردوو تەوەری دونیاو ئاینیی لەخۆ دەگرت ، سەرەرای ئەمە هەندێکمان ئەم ململانێیەی رۆژئاوایان گواستەوە نێو خۆمان کە لە نێوان ئاین لەلایەک ،زانست ودەولەت لەلایەکی تر ،بەمەش چارەسەری رۆژئاوایان بۆ هاوردە کردین کە پێی دەوترێ گلۆبالیزم ،واتە ئەوان کێشەیان بۆ هاوردە کردین نەک چارەسەر.

### 3/ گلۆبالیزمی کۆمەڵ و رەوشت

هزری کۆمەلایەتیی بێ ئاین، هزرێکی بەرەگەز کۆنە، ئەرستۆ باسی لە ژیانی کۆمەلایەتیی مرۆڤ کردوە، لەم باسکردنەیدا کە بەم گوتە بەناوبانگەی دەناسرێتەوە دەڵێ:
( مرۆڤ ئاژەڵێکی کۆمەڵایەتیە)، هەروەها ئەفلاتونیش لەم بارەیەوە دیدی کۆمەلایەتیی خۆی هەبوە کە لە کتابی (کۆماری)یەکەیدا باسی لێوە کردوە ، ئەگەر بە دارشتنێکی خەیالیش بوبێ .
هەرچەندە چەرخی رێنسانی ئەوروپی و ژیانەوەی ئەدەب و فەلسەفەی گریکی، فکری کۆمەلایەتیی بێ ئاینییان بۆ دوو ئاراستەی جیا دابەش کرد کە بریتی بون لە:

ا/ خەیالگەری تۆباویزم یا شارە پرچاکەکان.
ب/ واقعبینی، بریتیە لەو رێچک خەباتەی بە فەلسەفەو ئەقل دژایەتی کەلیساو پەروەردەکانی بکا .
پێشرەوایەتی ئەم بوارەش بەر مکیافیللی و هۆبز کەوت کە پوختەی بۆچون و بیرکردنەوەکەیان دەڵێ:
( پێشرەوی ئەم رەوتە لە پشکی مکیافیللی و هۆبز بوو کە پوختەکەی دەڵێ: کاتێک بروای مرۆڤ لە برواکانی رەوشتی شەرع جیادەبنەوە ، ئەوکاتە بۆشایی لە هزرەکاندا دروست دەبن ، ئیتر دەبینین بەهۆی نەبونی پرەنسیپەکانەوە هزری توندو تیژی دەبێتە سەررەفتاری مرۆڤ. بە گوتەی ئەم دوو زانایە ژیان لە کۆمەلگا لەسەر بنەمای هێز بنیات دەنرێ، دەرونناسی کۆمەلگاش هەردووکیان لەم گوتە بەناوبانگە یەکدەخا : ( مرۆڤ گورگی مرۆڤە)، هەروەها لە ووتەیەکی تری مکیافیللیش کە دەڵێ:
( مرۆڤ مەیلی خەراپەکاریی لە مەیلی چاکە زیاترە). هەر لەم تەوەرە بتول لەسەر گوتەی مکیافیللی دێتە قسەو دەڵێ:
(گرنگی ئەو زانا فلۆرەنسیە لەوەدایە کە فەلسەفەی مێژوو کۆمەلناسیی سیاسیی سەربەخۆ کرد).
ئەمەو لە پێشرەوانی هزری نوێ، فەیلەسوفێکی تر دێت ئەویش فەیلەسوفی بەرەگەز جو (سبینوزا) یە کە بە دژایەتی کردنی ئاین و رەوشتەکان بەناوبانگ بوو . ئەمیش لەگەل هوبزا هاو تەمەن بوو لەیەک چەرخدا ژیاون ، لە بۆچونەکانی دەڵێ :

(له راستیدا مرۆڤ لەژێر کاریگ ری ئارەزوە سکسیەکانیدایە، مافەکانی مرۆڤیش لە ململانێی بەردەوامدایە لەگەڵ هێزی خۆی کە یەکسانە بە مافەکان )، سبینوزا هەردەم هێرش دەکاتە سەر ئەو زانستەی رەوشت کە لە چەرخی ناوەراست باو بوو، کە کە بریتی بوو لەوەی سۆفیگەرێتی وپەشیمانی لەم دونیایە بەرز راگرێ گوتەیەکی تری هەیە دەڵی:

( چێژو خۆشی خێرە بەلام لەهەمان کاتدا خەراپ وناشیرنە .. حیکمەتیش لە ئومێد و ژیان دایە نەک لە مردن) .

نوسەرێکیتر کە زۆر سەیر پشرەوی لە دوژمنایەتی کەلیساو رەوشتەکانی دەکرد ئەویش (ماندیفیل) بوو ، لە کتێبێکی کورتە چیرۆکی بەناوی (مێش هەنگوین) رسواکاریەکی وروژاندوە دەنگۆیەکی زۆری بەدوای خۆیدا هێناوە ، لەوێ باس لەوە دەکا کە دەڵێ سوکایەتی و بەدکاریەکان ئەوانەن کە رەوشتگەراییەکان دەیکەن وەکو بەدرەوشتی وسوکایەتی .. هەر خۆی بوو بوە مایەی بلاو بونەوەی شارستانێتی و هونەر وتەکنیک ، ئەم ئاراستانەن کە بە پاشملە ناسراون بە لام لە راستی دا ئەمان فاکتەری درێژە پێدەری ژیانی مرۆڤایەتین ئەگەر ئەمان بونیان نەبوایە مرۆڤیش وەکو جۆرێک لە ئاژەلەکان تیادەچو و نەدەما.

ئەم سەرەتایی و هزرانە بە پەرش و بلاوی مانەوە، لە یەک قەوارە کۆنەکرانەوە تا ئەوکاتەی کۆمەلناسی لە دایک دەبێ ، چونکە کۆمەڵناسیش زانستێکی تایبەتە بە توێژینەوەو دیراسەکردنی پەیوەندی ودیاردەکانی کۆمەلگا و رێکخستنی بەپێێ رێنما وبنەمای تایبەتی.

## 4/ مكیافیللی و کۆمەڵگای سڤیلی(مەدەنی)

دەستەواژەی کۆمەلگای مەدەنی یەکێکە لە دەرهاوێشتەکانی هزری رۆژئاوایی ، ئەم هزرە لە نێو کۆمەلگای ئەوروپی سەری هەڵداو هەر لەوێش پەرەی سەند، ئەمەش لە ئەنجامی بەشداریەکانی چەرخی رێنسانس و روناکگەری و شۆڕشی پیشەسازیەوە هات ، ئەمەو جیاکردنەوەی کەلیسا لە دەولەت لە چەرخی ناوەراست رۆلی کەلیسای نەهێشت ، بە رادەیەک ئەمرۆ دەبوایە بەدوای شێوازێکی تری رێکخستنەوەی ژیانی کۆمەلایەتی وسیاسیدا بگەرێین.

دواتر ئەو دەرفەتە هاتە پێش تا رۆمای پاپایی هەلبوەشێتەوە ، ئەوەبو کە مارتن لۆسەر (1483-1546) دەردەکەوێ تا رۆلی کەلیسا دیاری بکا ، بەهۆیەوە کەس لە نێوان خواپەرستان وپەروەردگار نەما، پێویست بە کەس نەبوو ئەم رۆلە بگێرێ بەلکو خواپەرستەکان راستەوخۆ بەم ئەرکەیان هەلدەستان ،چونکە پەیوەندیەکانی تاک بە مەسیح وکتێبی پیرۆز بونە پەیوەندیی راستەوخۆو تایبەت بە خود. ئاسایی دەبێ هەر کەسێک بیەوێ لە کتێبی پیرۆز بگاو شیی بکاتەوە . بەم شێوەیە هەندێک لە دەستەواژەو رەوشت و نەریت لە جێی خۆیان لەق دەبن، دەسەلاتی کەلیسا بە هەمان شێوە، ئەو سەردەمە کۆتایی هات کە ئەولەویاتی دەسەلات هی

کەلیسا بێ و پاپا بە هەوەستی خۆی لێکدانەوە لەسەر کتێبی پیرۆز بدا ، ئیتر ئەم کۆمەڵگایانە ئەوحالەتە پێشینیەیان جێهێشت ودەستبەرداری دیاردە ونەریتە کۆنەکان بون، لە کۆمەڵگایەکی سروشتیەوە بون بە کۆمەڵگایەکی شارستان ، دیارە ئەمەش وەلامدانەوەی ئەو گۆرانکاریە ئابوری وفکری و کۆمەلایەتی وسیاسیانەیەبون.

ئەم دەستەواژە لە ئەنجامی گۆرانکاریە مێژووییەکان گەلالە بون کە لە مکیافیللیەوە دەستی پێکردو لە ژێر کاریگەری نەریتەکانی کۆماری رۆمانی بوو ، مکیافیللی بوو مەرجەکانی کۆمەڵگای مەدەنیی بە پێی پێوەرەکانی رۆژ دانا ، بەتێروانینی ئەو مەبەستی گەل پیرۆزترە لەمەبستی ئابرومەندەکان، ئەوان مەبەستیان ستەمکاری وزۆرداریە، بەلام گەل مەبەستی خۆپاراستنە، بەم شێوەیە میر ناتوانێ هەموو کاتێک خۆی لە تورەیی گەل بپارێزێ چونکە ئەم تورەییە لای سەرجەم گەل هەیە ، میر تەنها دەتوانێ خۆی لە ئابرومەندەکان(ئەشراف) بپارێزێ ئەویش بە کوشتنیان ونەجات بونی لەدەستیان.

مکیافیللی تێدەگا کە لە هەر کۆمارێکدا دوو ئارەزوو هەن : ئارەزووی گشتی ، ئارەزووی چینە بەرزەکان ، ئازادیش نایەتە دی تا ململانێی نێوانیان دەست پێنەکا ، ئەم ململانێیەش کۆتایی نایە بەلام دەکرێ لە رێگەی دام ودەزگاکانەوە بکرێتە ململانێیەکی مەدەنی.

دواتر تۆماس(1582-1679) دێت کە کۆمەڵگای بە وە ناساندوە (کۆمەڵگایەکی بنیاتنراو لەسەر بنەمای گرێبەست و دەسەلاتی دەولەت) بەتەواوەتیش وەکو هۆبز دەڵێ:

( دەسەلاتی خاوەن سەروەری) مەبەستی لەمەدا ئەوەیە کە ژیان لە نێو کۆمەڵگای مەدەنی نابێ، تەنها بە بونی دەولەت نەبێ ، شارل مۆنتسکیۆ(1689-1755) گرنگترین ئەوەی لە کتێبەکەی بەناوی (رۆحی یاساکان) پێی لەسەر داگرتوە، پرۆسەی جیاکردنەوەی سێ دەسەلاتەکەیە (یاسایی، دادگایی، جێبەجێکردن) وادەبینێ کە تاقە رێگە چارە( کۆمەڵگەی کۆمەڵگاکانە) ئەو رەخنانەی لێی گیراون بەهۆی ئەوەوە بون کە تاوانبارکراوە گوایە بەرژەوەندیەکانی گشتی لە خزمەت بەرژەوەندیەکانی دەستەیەک یا کەمینەکدا داناوە، ئەویش چینی ئوروستوکراتیە.

بەلام جۆن لۆک(لە 1691) کە بە ناودارترین زانای مەدرەسەی یاسای سروشتی دادەنرێ ، یەکێکیشە لە گەورە زانایانی فەلسەفەی دروست کردنی کۆمەڵگای مەدەنی، پێناسەی کۆمەڵگا لای ئەو بریتیە لەو کۆمەڵگایەی کە مرۆڤ بە هەوەستی خۆی دەچێتە نێوی، بۆئەوەی مافەکانی خۆی لە یەکسانی ودادپەروەری مسۆگەر

بکا  کە ژێر سایەی یاسای سروشتی دەستەبەر دەبن. بەلام نەبونی دەسەلاتێکی کاراو بە توانا بۆ راگرتنی کۆمەلگای سروشتی ، دەبێتە هەرەشە بۆ پێشێلکردنی ئەم مافانە. بۆیە ئەو خەلکە لەسەر ئەوە رێککەوتن کۆمەلگایەکی مەدەنی بنیات بنێن تا مافەکانیان مسۆگەر بکاو حوکمی پادشایەتیی رەهاش رەتکاتەوە .

داوای دەکرد پارێزبەندی وپیرۆزمەندی لە پادشا بسەندرێتەوە ، بە پێچەوانەی هۆبز بیری دەکردەوە کە پادشایەکی بەهێز لە سەر لوتکەی دەسەلاتی حکومەتێکی بەهێزدا بێ .

لۆک وای دەبینی کە کۆد و بەند بخرێنە سەر دەولەت، چونکە بەدیدی ئەوتا دەولەت بەهێزبێ کۆمەلگای مەدەنی لاواز دەبێ ، بیردۆزەکەیشی لەسەر بنەمای مولکداریی تاک داناوە ، بە دیدی ئەو مولکداری تاک بناغەی کۆمەلگای مەدەنیە بۆیە بونی مولکیەتی تاکی کردە مەرجی کۆمەلگای مەدەنی .

بیرکردنەوەی جان جاک روسوش (1712-1778) ش لەم بوارە لە (گرێبەستی کۆمەلایەتی) کورتکراوەتەوە ، بیردۆزەکەی دەلێ :

( دەبێ مرۆڤ لە حالەتی سروشتی بشۆردرێ و بگەیەندرێتە حالەتی مرۆڤێکی تەواو) ، بیردۆزیشی لەسەر کۆمەلگای مەدەنی بریتیە لە( هێرش کردنەسەر بەرژەوەندیی خود  و پیادە کردنی سیستەمێک بە ئامارێکی ئەقلانیی سودبەخش .

ئەمەو هەولەکانی رۆژئاوا بۆ بەرجەستە کردنی دەستەواژەی کۆمەلگای مەدەنی بەردەوامن.

## مکیافیللی وەکو چاودێری ڕێنسانسی هونەری جەنگ

-------------------------------------

زۆرکەس هەن ئەمرۆ بروایان وایە کە هیچ شت نیە لەم دوو کارانەی بەیەکەوە بەندن و زۆرترین ناکۆکی ولەیەک نەچونیان هەیە، بەقەدەر ژیانی سڤیلی(مەدەنی) و ژیانی سەربازی . بەلام کاتێک سەیری سروشتی کاری حکومی دەکەیت شتێکی تر بەدی دەکەین ، ئەویش ئەو هاوکاری و پەیوەندیە توند و تۆلەیە لە نێوانیان ، یەکیان تەواکەری ئەویتریانە لە کاری حکومیدا بەڵکو زەروریشە هاوکاریەکانیان لەو پەری توندی دابێ.

ئەم رستانە ئەوەن کە لە دەسپێکی کتێبەکەی مکیافیللی هاتون بە ناوی ( هونەری جەنگ) ئەم رستانە ئەم مەبەستانەمان بۆ دیاری دەکا ورۆشناییەکمان بۆ دەخاتە سەر ئەوبایەخانەی مکیافیللی بە بواری سەربازیەوەداوە، دیارە ئەم نوسەرە بە دیدی پیاوێکی سەربازی سەیری پرسەکەی نەکردوە ، بەڵکو سەیری ئەو رۆلەی کردوە کە هێزی سەربازی دەیگێرێ لە سەرکەوتنەکاندا، لە سیاسەتی دەولەت کەوتۆتە ئەو بروایە کە رۆلی دەولەت لە رۆلی دەزگای سەربازی و پێگەی لە سیاسەتی دەولەتەوەیە ، ئەمە مکیافیللی لە کتێبی میر باسی کردوەو دوبارە گەراوەتەوە لە کتێبی (گوتارەکان) دوبارەی کردۆتەوە ئەمجارەیان دەڵێ:

( نابێ هیچ یاسایەک راستبن تا ئەوکاتەی چەکی بەهێز نەبێ ، هەرکاتەی چەکی بەهێز بونی هەبوو ئەوسا یاسای راست و دروستیش بونیان دەبێ ).
بۆیە هەردەم هانی حاکمەکانی داوە، ئەگەر بیانەوێ لەسەر لوتکەی دەسەلات بمێننەوە دەبێ هێزێکی سەربازی چاکیان هەبێ ، دیسان دەڵێ :
(نابێ میر هیچ ئامانجێکی تری هەبێ جگە لەم ئامانج و راو بۆچونەی تر ، نابێ بایەخیش بە هیچ دیراسەیەکی تر بدا جگە لە دیراسەی کاروباری جەنگ و رێکخستنی سەربازی) .
مکیافیللی لە کتێبەکەی ( گوتارەکان) یش بایەخی بەم رەهەندە داوە تا لە کۆتایی دیراسەکەیدا لە مێژوی رۆمانی دەگاتە ئەو بروایە، بناغەی دەولەت لە رێکخستنی سەربازیەکی دروستەوە هاتوە.
بەم جۆرە کتێبی هونەری جەنگ ئەو کتێبە دەبێ کە مکیافیللی وەکو هزروانێکی سەربازی ناوبانگی پێیەوە وەرگرت ، سەرەرای ئەوەی لەو کتێبەیدا بەوردی باسی لە رێکخستنی سەربازی وهونەری جەنگ و تەکتیکەکانی دەکا ، بەلام لەمەش قولتر دەروا گفتوگۆی لەسەر پابەندیەکانی سەربازی و رێکخستنی سەربازیی راست ودروست و دسپلینەکانی دەکا ، ئەنجامدانی رۆلی هێزی سەربازی لە ژیانی سیاسیدا وەکو رۆلی مگناتیزە کە هەموو هزرەکانی سەربازیی مکیافیللی لە دەوری خۆیدا کۆدەکاتەوە .

## پەیوەندیی نێوان رێکخستنی سیاسی و رێکخستنی سەربازی

----------------------------------------------------------

بەلام مکیافیللی چۆن سەرنجی بۆلای پەیوەندیی نێوان رێکخستنی سیاسی ورێکخستنی سەربازی چوو؟
ئەزمونی ئەو چەرخەی مکیافیللی تیایدا ژیا، دەرسێکی باشی لەسەر کاریگەری کرداری سەربازی لەسەر ژیانی سیاسی پێدا. بینیی کە چۆن ولاتەکەی بەهۆی شکست هێنانی ئامێری سەربازیەوە ئازادیەکانی لەدەستداوە. هەروەها ئیتالیاشی بینی کە چۆن سوپای ولاتان دەستیان بەسەرداگرتوەو سەربەخۆی لەدەست داوە، ئەمیش هەر بەهۆی شکستی سەربازیەوە بوو .
کەوابێ بایەخی مکیافیللی بەم ئەرکە بەرهەمی ئەو زانیاری و ئەزمونە سیاسیانەی بون کە هەیبوو ، ئەمەش نیشانەیەکی تری ئەوەیە چۆن تێگەیشتنی وردی لەسەرهێزە راستەقینەکانی سەربازی وسیاسی هەیە لەم سەردەمەدا کە بوە بناغەی ئەو تێکهەلچونانەی سەدەکانی چواردەو پانزەهەم ، ئەوەی ئەو پەیوەندیانەی نێوان گۆرانکاریەکانی رێکخستنی سەربازی و شۆڕشگێرەکان کە لە بواری کۆمەلایەتی وسیاسی رویاندا هەستی پێکرد، تەنها ئەو ئەقلە ئامادەو پێگەیشتوە بوو . لەم روەوە و سەبارەت بەم گۆرانکاریانە دەبێ ریز لە و توانا داهێنانە بگرین کە باروتیان دۆزیەوە ئەوانیش :

**یەکەم : هاتنەکایەی ئابوریەکانی پارە(پول)**

**دووەم: هەوڵەکانی دەرەبەگی بەرێز** بوو بۆ رزگار بونیان لەدەست چەوسێنەرانی زەویەکانیان، و چیتر پشتیان پێنەبەستن و سیستەمێکی نوێ بدۆزنەوە بۆ هێزێکی شەرکەر بۆ پشت پێبەستن .
ئەم گۆرانکاریە لە دامەزراندنی سوپاو گەشەکردنی هونەری سەربازی ، بونە هۆکاری گۆرانکاری لە گیانی سوپاو رێکخستنەکانی ، یاسای مەعنەویی لاسایکەرەوە لە سوپا رۆلی نەما ، ئەو یاسا کۆنانەی پێشتر کە سوپایان لێ پێکدەهێناو بەرێوەیان دەبر وەلانران ، کرێگرتەو جاشەکان ئەوانەی تەنها بۆ مەبەستی پارە پەیداکردن دەبونە سەرباز و هەموو کارە پێشرەوی و توندو تیژیەکانیان بێ سلەمین ئەنجام دەدان ، هەلگیرسانی جەنگ بۆ ئەوان هیچیان لەدەست نەدەدا، تەنها پەیداکردنی سامان لای ئەوان گرنگ بوو بۆیە بێ درێغی و بیرکردنەوە لە دوارۆژ دەجەنگین.
بەم پێوەرە خزمەتکردنی سەربازی بوە دەرفەتێک بۆ پەیداکردنی سامان و پارە، لەم روانگەوە کێشەیەکی رەوشتی سەری هەڵدا ، ئاخۆ ئەم پیشەیە پێویست بەوە دەکا خەلک بکوژێ ؟ ئایا ئەمە گوناە نیە؟
لە زۆربەی ناوچە شارستانیەکانی ئەوروپا وەکو ئیتالیا ئامادە نەبون هیچ پەیوەندیەکیان لەگەل سەربازی پیشەدار هەبێ ، تەنانەت لە نێو توێژی سیاسیەکانیشدا هیچ ریزێک بۆ سەربازەکان نەدەبیندرا .
سەفیری میەنشینی فیرارا لە فلۆرەنسا لە سالی 147ە راپۆرتێک دەنێرێ و دەڵێ:
(بە رێژەیەکی زۆر ئارامی بەرقەرار بوە، ئەگەر لە داهاتوو شتێکی کتوپر روو نەدا ئەوا ماوەیەکی تر هەوالی شەر دەبیستی کەلەگەل بالندەکان و سەگەکاندا دەکرێ نەک لەگەل سوپا )، ئەوانە حوکمرانی ئیتالیا دەکەن لە

سەردەمی ئارامیدا دەنگۆیەکی باشتر پەیدا دەکەن لەوانەی لە سەردەمی جەنگا حوکمرانی ئیتالیا دەکەن .چونکە کۆتایی راستەقینە جەنگ ئاشتییە.
ئاقلمەند و زاناکان کەوتنە گفتوگۆی ئەوەی بتوانرێ کۆتایی بە پەتای جەنگ و سەربازی بهێندرێ ، چونکە پرسی رێکخستنی سەربازی وپێگەی لە رێکخستنی کۆمەلایەتی کۆمەلێک کێشەی دروست کردوە کە پێویست بە پێداچونەوەو لێکۆڵینەوە هەیە ، سەردەمێکی نوێ خولقا و یاساو رێنما کۆنەکان شوێنیان نابێتەوە ، پیویست بە پێداچونەوەیان هەیە.
کارەکە لەوە مەزنتر بوو پێویستیی بە تواناو ئەقلێکی کاریگەر هەبوو ، کە زیاد لە حەزو ئارەزوێک مشور لەوە بخوا لەوانەی تێگەیشتنیان بۆ سیاسەت هەیە بۆئەوەی بتواندرێ بروا بەو خەلکە بکرێ کە پێویست بەم گۆرانکاریە نوێیە سیاسیانە هەیە.

## داگیرکردنی ئیتالیا لەلایەن فرەنساو سەرهەڵدانی جەنگی کت و پڕ

---

لە راستیدا لە ئەنجامی روداوێکی سیاسیی کاولکار بوو ئەم بنیاتنراوە کۆنە دارما ، ئەمەی سەلماند کە سیستەمی سیاسیی حالی حازر کاتی بەسەرچوە، بەمەش رێگە خۆشکرا کە هەلوێستێکی نوێی سیاسی پێشکەش بکرێ ، ئەم هەلوێستەش ئەوکاتەبوو کە لە 1494 سوپای فرەنسا بە فەرماندەی شارل ی هەشتەم و بەهێزێکی زۆر و پرچەکەوە بە هاون وبە سەربازی پیادەی سویسری، ئیتالیا داگیر بکا و رژێمە کۆنەکەی سەرنگون بکا ، جیشاردینیی دۆستی مکیافیللی و مێژونوسی مەزنی ئەو چەرخ سەبارەت بەو جەنگە لە 1494 ووتی:
سالێکی بەخت رەش بوو بۆ ئیتالیا ، ئەم سالەش پێشەکیی بوو بۆ ئەوسالانە نەهامەتی ومەینەتیان بەدوای خۆیاندا هێنا .
جتشاردینی شیکردنەوەیەکی باشی ئەنجامەکانی ئەم شۆرشە درێژخایەنە کردبوو کە لە ئەنجامی داگیرکاریەکەی فەرەنسا رویدا ،کاریگەری وئاەواری ئەم داگیرکاریە وەکو ئاگری بەر پوش و پەلاش گری گرت ، تەنها دەسەلاتی

حوكمرانیی نەهێنایە خوارەوە بەڵکو سەرتاپای دەسەلاتدارانی حوکمران و رژێمە سیاسی و شێوازی جەنگیشی گۆری.
ئیتالیا بەر لەو روداوە لە پێنج ویلایەتی سەرەکی پێکهاتبوو ( دەولەتی کەلیساو ناپۆلی و ڤینیسیاو میلان و فلۆرەنسا) ئەوەی لای ئەو پێنج دەولەتە گرنگ بوو ، مانەوەی رەوشەکە بوو وەکو خۆی ، هەر ویلایەت و لە هەولی پاراستنی سنوری خۆیدابوو کە رێگە لە دەستدرێژی ویلایەتەکانی تر بگرێ ، چاودێری ئەم پێنج ویلایەتەو سنورەکانی زۆر بە وردیی کرا ، لە کاتی گۆرینی بچوک ترین قەلۆتکی سنور، مەزنترین هەرا دەنرایەوە ، کاتێک جەنگ لە نێوانیان رووی دەدا هێزە سەربازیەکان یەکسان بوون و رێکخستنە سەربازیەکانیش زۆر بە هێواشی هەنگاویان دەنا، هەرکاتەی جەنگ رویدەدا یا بێ زیان یا بە زیانێکی زۆرکەم کۆتاییان دەهات ، بەلام کاتێک فرەنسای داگیرکەر هات ئەمە سەرتاپای گۆرا، وەکو ئەوەی وولات توشی گەردەلول هاتبێ هەموو کۆت و نەریتەکان نەمان، هەموو پەیوەست وپابەندیەکان لەیەک ترازان ، ئەوانەی لە نێوان حاکمەکانی ئیتالیادا هەبوون ، لە ئەنجامدا هەریەکەو لە خەمی پاراستنی رەوشی ناوەخۆی دا بوو، لای ئەو گرنگ نەبوو ئەگەر لافاو دراوسێکەی ببا بەمەرجێ خۆی بە ئارامی و بێزیان لێی دەرچێ.
رودانی جەنگەکان زۆر بە خێرایی رویان دەدا، شکست وسەرکەوتنەکانیش بەخێرایی دەهاتن و دەرۆیشتن، ئەگەر لەگەل سەردەمانی پێش داگیرکاریەکە بەراورد بکەیت ئەو ماوەی پێشتر بۆ داگیر کردنی گوندێکی دەخایاند زۆر کەمتری دەویست بۆ داگیر کردنی ولاتێکی ئێستا . شەرەکان بە زیانی زۆرەوە تەواودەبون ، سیاسەتمەداران هیچ رۆلێکیان نەمابوو لە دان وستانەکانی کۆتایی هێنان بە جەنگ ، هەلمەتی سەربازی و هێرشە توندەکان بریاریان لەسەر چارەنوسی جەنگ دەدا.
لە وتەکانی جتشاردینی دەردەکەوێ ئیتالیەکان تا چەند هەستیان بەو جیاوازیەی دۆخی نێوان سەدەی پانزە وشانزە دەکەن، لە سەدەی پانزەهەم ئەو پەری گەنجینەی ئیتالیابوو خەلک هەستی بە دەولەمەندی وخۆشگوزەرانی و پێشکەوتنی هونەری وزانستی دەکرد ، لە گەرمەی ئەو خۆشیانەدا وێرای نزمی سیستەمی کۆمەلایەتی و ئاستی رەوشەنبیریان، ئیتالیا خۆی لە سەروی ولاتانی ئەوروپا دەبینیەوە ،ئەمە وێرای ئەوەی ئاراستەیەکی خەراپیش دەکران، بەلام لە سەدەی شانزەهەم چارەنوسی سەرتاپای ئیتالیا کەوتە دەست ولاتەکان خۆیان کە

بۆیان دەرکەوت ئەوەی ئەوان بیریان لێی دەکردەوە راست نەبوو، دەبێ ئیتالیا بەراستی لە ئاستی دیدی ئەوان نەختێک دابەزێ.

ئەمەو جتشاردینی لە ووتەکەی خۆیدا باس لەو رونکردنەوەیە دەکا کە ئیتالیەکان بۆ شکستی خۆیان هەیانە و بە چ شێوازێک باسی شکستەکەی ئیتالیا دەکەن .ئەوان بەهۆی پێشکەوتنیان لە روی ئابوری شارستانیەوە گلەییان لە خۆیان دەکرد کە هونەری نوێی جەنگیان فەرامۆش کردوە ، ئەو قەلا پۆلایین و بەربەستە جەنگیانەی لە دەوری شارەکاندا کێشابوو بە چال و شورەکانەوە هەر خێرا کەوتنە دەست هێرشبەرانەوە، بەرانبەر بە هاونەکانی شارلی هەشتەم خۆیان نەگرت ، دیسان سەربازە سوارەکانی ئیتالیاش هیچ بەرگریەکیان نەبوو لە بەرانبەر سوپای پیادەو هاون هاوێژی شارلدا.

هونەری نوێی جەنگ بەسەر شێوازە کۆنەکەدا سەرکەوت ، هەروەکو مکیافیللی دەڵێ:

(جەنگێکی هێرشبەر وکورت و خێرا بوو، یا وەکو ئەمرۆ پێی دەڵێن شەرێکی کت و پرانە بوو دەستوەشاندنێکی خێرا بو ).

دیسان مکیافیللی دەڵێ:

( جەنگەکە بەرپابوو لە ناو گەرمەی شەرەکەدا سەربازە فەرەنسیەکان هەرماڵێکی مەبەستیان بوایە لێی دەچونە ژوور ولێی دەحەوانەوە بێ ئەوەی هیچ ترسێکیان لە هێزە لاوازەکەی ئیتالیا بوبێ) .ئەم سەرکەوتنانە بۆ فرەنسیەکان کاری کردە سەر ئیسپانیەکان وئەلمانیەکان کە دەستی هاوکاری ودۆستایەتی بۆ فرەنسیەکان درێژ کەن وبۆی بون بە دەستکەوتی چاک ، بە پێچەوانەی ئیرادەو ویستی ئیتالیەکان، ئەوان بون بە بینەری روداوەکانی ئەوروپاو ئەوەی لە ولاتەکەیان روو دەدا، بێ ئەوەی بتوانن هیچ بەرگری و کارێک بکەن کە دەبینن ولاتەکەیان بۆتە شانۆی جەنگ لە ئەوروپا و سەنتەری کێشانی هەموو بێگانەکان بۆ ئەم شانۆیە، ئەوکەسانەی مەبەستیان بوو ناوبانگی سەربازی بۆ خۆیان وەدەست بێنن .

لێکۆلەرەوەکان گەیشتنە ئەو بروایەی کە ئیتالیا ، ئەگەر ویستیان جارێکی تر سەروەری بۆ ولاتەکەیان بگەرێننەوەو لەگەڵ میلەتانی تر یەکسان بن، دەبێ چاکسازی ونوێکاری لە فێرگە سەربازگەییە کانیدا بکا.

**مکیافیللی وچاکسازی رێنما سەربازیەکانی ئیتالی**
**------------------------------------------------**

بەهۆی ئەو کارەساتەی لە ماوەی شۆڕشدا بەسەر ئیتالیادا هات، حەز وئارەزوێک لای مکیافیللی دروست بوو، تا بە ووردی تێگەیشتنێک بۆ پرسە سەربازیەکان بکا ، ئەمە لای مکیافیللی بوە هۆکارێک بۆ ئەوەی قولتر کار لەسەر دیراسەکەی بکا . بە پشت بەستن بەو ئەزمونە پراکتیکیەی لە سیاسەتی فلرۆرەنسا هەیبوو کە وانەیەکی تایبەتیی لە بواری رێکخستنی سەربازی وکردنەوەی گرێ کوێرە سیاسیەکان وەرگرتبوو .

ئەوکاتەی بیرو سودرینی گەورە فەرمانبەری دەولەتی فلۆرەنسا ئاراستەی سیاسەتەکانی فلۆرەنسای دەکرد، مکیافیلی لەو سەردەم لە نێوان سالەکانی1498 تا 1512 وەکو سیاسەت مەدارێک مەزنترین رۆلی بینی و ئەو ماوەی بە تراجیدیا ناساند، بۆ مکیافیللی ئەو سەردەم بە گرنگترین قۆناغەکانی ژیانی دادەنرێ ، پەیوەندیەکانی مکیافیللی ش بە سۆدرینیەوە کارێکی هەلکەوت ،

ئەمە ئەوکاتە هات  پاش ماوەیەکی کورت لە ئاژاوەو گێرەشێوێنی خانەوادەی مدیتشینی دێننەخوار لە دەسەلات ، دیموکراتخوازەکان و ئوروستوکراتەکان کە دوو حزبی رکابەر بون لەسەر سۆردینی رێکدەکەون کە دەسەلات بگرێتەدەست هەرچەندە ئەو نە لە دیموکراتخوازەکان نە لە ئوروستوکراتەکان دڵنیا نەبوە، بۆیە پشت بە کۆمەڵێک لە فەرمانبەری هەمیشەیی حکومەت دەبەستێ ئەوانەی لە بواری سیاسەتی دەولەت کاردەکەن،  دیارە مکیافیللیش ئەو دەرفەتەی نەبوە کە ببێتە کەسێکی دیاری یەکێک لەم دوو حزبە بەلام وەکو سکرتێرێک لە سەرۆکایەتی لەگەل کۆمەلێک لەو فەرمانبەرانەی کە سۆردینی متمانەی پێدەبن ئەو دەبەێتە یەکێک لەو گروپە.
 سۆدرینی هەر زوو لە توانا و بەهرەکانی ئەم پیاوە بچوکەی کۆلیەوە ، دوای دڵنیا بون  لێی بۆ بازنەی خۆی گواستەوەو لە کاری ئیداری و سیاسیی دانا و سودی لیوەرگرت ، بەم شێەویە مکیافیللی دەستی گەیشتە کارە سیاسی و سەرابزیە ئالۆزەکانی کە رووبەروی سۆدرینی دەبونەوە لەوانە دوبارە هێرش بردنە سەر بیزا....
 بیزا بەندەرێکی گرنگ بوو لە سەر روباری ئارنو، خەلکی بیزا ئەو دەرفەتەیان قۆزتەوە کە فرەنسا ئیتالیای داگیرکردو ولات روبەروی نائارامی وئاژاوە بۆوە، لەو کاتەدا خەلکی بیزا ولاتەکەی خۆیان رزگار دەکەن وسەربەخۆیی رادەگەیەنن ، بۆیە لە سەقامگیری حوکمرانی سۆدرینی بیر لە گەراندنەوەی بیزا کرایەوە بۆ سەرخاکی ئیتالیا بۆئەوەی ئاستی هێزی خۆی تاقی بکاتەوە، ئەم بیرۆکەی خستە بواری کارکردن.
 سال دوای سال فلۆرەنسا باشترین فەرماندەی سەربازی ئیتالیای بەکرێگرت، هەولی دیراسە کردنی باشترین پرۆژەی دا، ئەمەش بۆئەوە بوو کە ئاراستەی روباری ئارنو بگۆرێ و بیزا لە سودی بەرهەمەکانی بێبەش بکا . بەلام هەر سالەی کە لە زستان نزیک دەبونەوە پرسی داگیرکردنەوەی بیزا دوردەکەوتەوەو بیزا لەم جەنگە رزگاری دەبوو. ئەم کورتهێنانە بوە مایەی نارەزایی گەل لە حوکمی سۆدرینی لە ئەنجامی ئەمەشدا لایەنگرێکی زۆری لە فلۆرەنسا لەدەست دا ،  وێرای ئەمەش بودجەی کرێگرتە ئیتالیەکان بۆ دەولەت بارێکی گران بوو بۆ خەزینەی ولات و ئەوانەی باجیان بە دەولەت دەدا کە بەهۆیەوە دەبوایە باجی زیاتر بدەن ئەمەش دیارە نارەزاییەکی تر زیاد دەکا ، بۆیە سۆدرینی لەگەل هاورێیان بیریان لە رێگەچارەیەکی تر کردەوە کە گەمارۆی بیزا بدەن وناچاری کەن خۆی بدا بەدەستەوە و ئەم بارە قورسەی

سەر خەزینەی دەولەتیش سوکتر کەن ، یەکێک لەو رایانە ئەوەبو کە خەلکی توسکان هێزی میلیشیا دابمەزرێنن ، نازانین ئەگەر ئەمە رای مکیافیللی بوبێ یان نا، بەلام لە سالی 1506 مکیافیللی یاداشتێک دەنوسێ کە خزمەتی سەربازی بەسەر هەموو کەسێک کە تەمەنیان لە 18 سالیەوە تا 30 سالّی دەبێ دەکاتە بە زۆر واتە زۆرەملێ کردنی خزمەتی سەربازیی دەولەت.
ئەم یاسایە سیستەمی سەربازی یەک ناخا ، بەلام هەنگاوێکی بەرایی بوو بۆ ئەم ئاراستەیە، ئەم یاسایەش بەسەر خەلکی فلۆرەنسا جیبەجێ نەکرا تەنها خەلکی جوتیاری توسکانیی گرتەوە کە ئەوکات لە ژێر حوکمی فلۆرەنسادا بو ، لەمانیش لە جوتیارەکان ژمارەیەکی کەمی لێ دەستبژێر کردن بۆئەوەی کار نەکاتە سەر چالاکیەکانی ژیان .
مەشق و راهێنانە سەربازیەکان بە شێوازێک ئەنجام دران کە کارنەکاتە سەر گوندنشینەکان وبەسەریانەوە نەبێتە ئەرکێکی قورس ، ئەوەبوو رۆژانی یەکشەممە وپشوە فەرمیەکانیان بۆ ئەم ئەرکە تەرخان کردبوو بە بەکار هێنانی ئەو چەکانەی کە شارەزاییان لیی هەیە ، سالّی دوو جاریش گوندنشینەکان بۆ ماوەی دوو رۆژ دەچونە شارە نزیکەکانیان بۆ مەشقکردن وراهێنان ، سیاسیە شارەزاکان زاتی ئەوەیان نەبوو لەمە زیاتریان لەسەر بکەنە ئەرک ، چونکە لەوە دەترسان ئەگەر ئەرکیان قورستر بکەن جوتیارەکان بەدوری نازانن شۆڕشیان لە دژ بەرپا بکەن ، بەمە سۆدرینی لە هەولی ئەوەدابوو خۆی بکا بە حاکمێکی رەهای دەستڕۆوشتوو بە هاوکاریی رێکخستنی بەهێزی سەربازی.
تەنها بە هەولەکانی مکیافیللی بەم ئامانجە گەیشتن، کە بێ پشتگیریەکی هەمەلایەنە توانیی پیاوە فلۆرەنسیەکان کۆکاتەوە و بگاتە ئەنجامێکی پراکتیکی کە دواتر لە 1507 دوو هەزار لەو پیاوانە بە میلیشیا کۆکرانەوە کە رۆلێکی باشیان هەبێ لە گەمارۆدانی بیزا ، کاری خزمەتی سەربازی بوو بە بەشێک لە کارەکانی نوسینگەی مکیافیللی ، خۆی بە نێو گوندەکاندا دەگەرا تا کەسی گونجاوو شایستە بدۆزێتەوە بۆ خزمەتی سەربازی، هەر خۆشی لە دەستنیشان کردنی ئەفسەران بەرپرس بوو، ئەو کاتەی میلیشیاکان لە دەوری بیزا دایان کوتابوو مکیافیللی بە ئەرکی لۆجستیک هەڵدەستا.
هەرچەندە پیاوە میلیشیاکان وەکو هێزێکی یەدەکی سەربازە کرێگرتەکان بون، بەلام رۆلی ئەوان لە گەمارۆکە رۆلێکی گرنگ بوو هەر ئەمەش بوە هۆکارێکی سەرەکی کە دواجار توانیان بیزا بۆ فلۆرەنسا بگەرێننەوە ، چونکە میلیشیاکان بوون بە درێژایی زستان گەمارۆکەیان بەرنەدا و شوێنی خۆیان

چۆل نەکرد ، رێگەیان لە خەلکی بیزا گرتبوو کەل و پەل و هاوکاری هاوردە بکەن، بۆیە ئەوان توشی برسێتی وقات و قری بون ، لە ئەنجامدا لە زستانی 1509 خۆیان دابەدەستەوە ، بەمەش رۆلی میلیشیاکان زیاتر دەبێ کە توانیان بەهۆی زانیاریە سەربازیکانیان بیزا بگرن ، بەلام پشتیان بە سەربازە بەزۆر (ئیجبار)یەکە بەستبوو ، دوای دوو سال کاتێک سوپای ئیمپراتۆر لە فلۆرەنسا نزیک دەبێتەوە تا حوکمی مدیتشی بگەرێنێتەوە، سەربازە میلیشیاکە لە بەرانبەریاندا شکست دێنن چونکە ئەوانی تر سەربازی مەشق پێکراو بون .
میلیشیاکان بەمەبەستی پاسەوانی کردنی ئەو رێگایە دەچنە فلۆرەنسا لە شاری براتو کۆم ببون ، بەلام هەر لەیەکەم هێرشی سەربازەکانی ئیمپراتۆردا هەرا کەوتە نێو میلیشیاکان و کەسیان سۆراخی ئەویتریانی نەدەزانی، هەر زوو شارەکەیان لەدەست دەرهێندراو تێکشکان بێ ئەوەی هیچ بەرگریەک بکەن .
لەم هەراو ئاژاوەیە نزیکەی چوار هەزار سەرباز تیاچون کە زۆربەی هەرە زۆریان لە میلیشیاکان بوون، هەرچەندە ئەو سەردەم بە سەردەمی خوێنرشتن دەناسرا بەلام کوشتارگەریەکی بەناوبانگ لەو جەنگە رودرا. بەمەش رێگاکە خۆشکراو مدیتشی بە سەرکەوتویی دەگەرێتەوە سەر حوکم.
گەرانەوەی مدیتشی بە کۆتایی هاتنی ژیانی سیاسیی مکیافیللی ناونرا، هەموو هەوڵ وتەقەلاکان بە فیرۆچون کە بۆ گەرانەوەی مکیافیللی بۆسەر کارەکەی دران، بۆیە بە زوو وەختانێک خانەنیش دەکرێ ، ژیانی لە کارکردنەوە بۆ بیرکردنەوە دەگۆردرێ ، لە ئەزمونی سیاسیشەوە بۆ بیرکردنەوەی سیاسی ، کاتێک ئەو بیرەوەری وئەزمونە سیاسی و سەربازیانەی پر لە کێشە بەسەرچوانەی رابردوو دەگێرێتەوەو کە دەبنە بنەمای بیرکردنەوەی، تامێکی تاڵ و ناخۆش دەبەخشن.
دەبێ ئەو میلیشیایە تارادەیەک دەتوانین بڵێین بەرهەمی بیرکردنەوەو دارشتنی ئەو بون نەبونە هۆکاری روخانی حوکمی کۆماری؟ دەبێ داهێنان هۆکاری ئەو کودەتا سەخت وناخۆشە نەبن کە بەسەر ژیانیداهات؟
لەگڵ ئەمەشدا کە پەیوەندیەکی راستەوخۆی مکیافیللی لەگەل ئەورووداوانەدا هەبوو بەلام نەبونە مایەی سەرچاوەی گلەیی و گازاندەی هەڤالانی لە کارەکەی یا تاوانبار کرابێ بەهۆی ئەم بیرۆکەو نەخشانەی لەماوەی کارەکەیدا دەیکێشاو جێبەجێ دەکران و ئەمانی گەیاندە ئەم قەیرانە. یەکێک لە دیاردە مەزنەکانی ئەقلیەتی مکیافیللی ئەوە بوو کە زۆر بەوردی وبایەخەوە دەیروانیە روداوە

مێژووییەکان کە دور لە سیاسەت ئەنجام دراون ،بڕواشی بە هیچ نەدەکرد تا ئەوکاتەی ڕاستیەکانی بۆ دەرکەوتن .
بەرگری کردنی مکیافیللی لە کارەکانی ڕابردویدا ئەوی گەیاندە ئەو دیراسە بەسودەی کە هەیبوو ، بەهۆی ئەم دیراساتەنەوە بووگەیشتە ئەو ڕاستیەی کاریگەری سەربازی ئیتالیای بەم ڕۆژگارە ڕەشە گەیاند، لەم روەوە لە ڕاستی وهۆکاری گەلێک لە وگۆرانکاریانە گەیشت کە لەو سەردەم ڕوياندا ، لەوانە لە ڕێگەی ئەزمون و دیراسەکردنی کێشە سەربازیەکانیەوە گەیشتە ئەو ئەنجامە بەمەش دەبێتە یەکەم هزرمەندی سەربازی لە ئەوروپای نوێ.

**بونی هەمیشەیی هونەری جەنگ لە ناو نوسینەکانی مکیافیللیدا**

**-------------------------------------------------------**

بەهۆی هەستکردنی لە ڕێگەی ئەزمونەکانیەوە لە کاریگەری هێزەکان لەسەر ڕوداوە سیاسیەکاندا، مکیافیللی وەکو بینیمان بایەخێکی زۆر بە پرسە سەرابزیەکان دەدا . بۆیە توێژینەوە سەربازیەکانی مکیافیللی لە سنوری خوێندنەوەی کتێبێکی سەربازی و هونەری جەنگ ناوەستێ کە تایبەت بون بە پرسە سەربازیەکان، بە نمونە لە کتێبەکانی مێژویی و سیاسییدا جەنگ وڕێکخستنی سەربازی ڕۆلێکی گرنگ دەگێرن ، ئەم بۆچونەمان لە کتێبی (میر) و ( گوتارەکان) و (مێژوی فلۆرەنسا) بەدی دەکرێ کە هەموو ڕایە جیاوازەکانی سەربازی لە کتێبی هونەری جەنگدا دیارە ، لە کتێبەکانی تری مێژویی وسیاسی دەکرێ دەرهاوێشتەی ئەو جیاوازیانە بوبن کە لە ئامانجی کارەکاندا هەبونە.

کتێبی هونەری جەنگ بەرونی و بە درێژی باس لە بۆچونە هونەری ورێکخستنەوەی سەربازیی مکیافیللی دەکا ، بەلام ئەم بۆچونانەی لە کتێبی (میر و گوتارەکان) دا وەکو پێشنیار پێشکەشی کردون بە روخسارێکی چاکسازیانە ناساندنی .

هەروەها کتێبی هونەری جەنگ باسی لە نەخشەسازیی بەرنامەی چاکسازی سەربازی کردوە، بەلام ئەو تێبینیانەی لە دوو کتێبەکەی تری کە لەسەرەوە ئاماژەمان پێیان داوە بە شێوەیەکی نەرێنی باس لە پرسی سەربازی و پەروەردەو رێنماکانی دەکا کە لەو سەردەم بونیان هەبوە، رەخنەکانی مکیافیللی کە ئاراستەی رژێمی سەربازی لە ئیتالیا کردوە لە سەدەی پانزەهەم بوە، واتە بەر لە داگیرکاریەکەی فرەنسا ، ئەوکات فەرماندەکانی سەربازی لە کرێگرتەکان بوون سەربازەکانیش لە سریە پیادەکان بون کە ببونە ئامانجی رەخنەو بێ رێزی ئەو خەلکە .

دەڵێ :

( لەیەک هەلوەشاوە بون هیچ یەکیەتیەک لە نێوانیاندا نەبو ، چاوبرسی ونادلسۆز و دور لە پرنسیپەکانی سەربازی بون ، لە نێو برادەرەکانیان ئازا و لە روبەرو بونەوەشدا لەگەڵ دوژم ترسنۆک، هیچ ترسیان لەو خوایە نەبوو بروایان بە هیچ پیاوێکیش نەبوو).

لە کتێبی (مێژوی فلۆرەنسا) بێ شاردنەوە رەخنەیان ئاراستە دەکا ، ئەوکاتەی باس لە شەرەکانی سەربازە پیشەییەکان دەکا لە سەدەی پانزەهەم و لە شەری(زاجوانرا) ئەو شەرە لە ئیتالیا بەناوبانگە لەو شەرەدا یەک کەس نە کوژرا جگە لە (لودوفیکۆ ئوبتزی) نەبێ ، ئەو خۆی و دوو لە سەربازانی لەسەر هەسپەکانیان دەکوژرێن و لەناو ئەو زەلکاوانەدا وون دەبن ، لە شەری(ئینجباری) کە لە کاتژمێری بیستەوە تا نیوەشەوان بەردەوام دەبێ ، تەنها یەک سەرباز دەمرێ کە ئەویش هیچ شتێک نەیپێکابوو بەلکو لەسەر هەسپەکەی دەکەوێتە خوار، دواتر هەسپەکەی دەیشێلێ ، بەهۆیەوە گیان لەدەست دەدا.

لە شەری ( مولینیلا) یش کە نیو رۆژ بەردەوامی هەبوو، هیچ کەسێک نەکوژرا تەنها هەندێک هەسپ بریندار دەبن و هەرلایەو هەندێک لە سەربازەکانی لایەکەی تر بەدیل دەگرن.

مکیافیللی دەڵێ فەرماندە پیشەوەرەکان و سەربازانیان( پیشەوەر بەو سەرباز وفەرماندانە دەوترا کە سەربازیان وەکو پیشە وەرگرتبو و بۆ ئەم کارەیان

بەکرێ دەگیران، بۆیە  لە گیانی دلسۆزی بێبەش بوون..و) خەراپترین شەریان کرد چونکە ئەوان هیچ بەرژەوەندیەک بەم شەرەیان نابەستێتەوە تەنها ئە وکرێیە نەبێ کە پێیان دەدرێ لە کاتێکا شایەنی ئەوەنیە بەم کرێ کەمە روبەروی مردن بیتەوە ، ئەوان هیچ دلسۆزیەکیان بۆ نیشتمان نەبوو هیچکاتێک هەستیان بەوە نەکردوە کە نیشتمانێکیان هەیە ودەبێ بەرگریی لێبکەن و دلسۆزیان بۆی هەبێ .

بەپێی بۆچونەکانی مکیافیللی هۆکاری دارایی تاقە هۆکارێکی بزوێنەرو کاریگەرە لەسەر رێکخستنی سەربازی ، هەر ئەم ئاراستەیەش بوو لە سەدەی پانزەهەم ئیتالیا وجەنگەکانی دەبرد بەرێوە یا فاکتەری بەرێوە بردن بوە ، چونکە ئەوکاتەی سەرباز دەبێتە سەرمایەی فەرماندەیەکی کرێگیراو ، هیچ کاتێک فەرماندە ئامادەی ئەوە نیە ئەو سەرمایە لەدەست خۆی بدا ،چونکە لەدەست دانی سەربازی بەکرێگیراو مانای لەدەست دانی چەند درهەمێکە هەرچەندە ئەوان حەزیان لە دۆراندنی شەرەکە نەبوە، بەلام بە بەراورد لەگەل لەدەستدانی سەربازی کرێگرتە یەکەمیان پێ باشتر بوە ، بۆیە هەردەم خۆیان لە جەنگی مەزن و  روبەروبونەوەی لەیەک نزیک و زیانەکانی دورخستۆتەوە ، شەری دور بەدوریان پێ باشتر بوە کە بەهۆیەوە لە بەدیل گرتن و کوشتار دوردەکەونەوە ، بۆیە ئەو سەردەم سەردەمی شەری بێ خوێن رشتن بوە ، لە هەمانکاتدا شەرە کورتخایەنە کانیش لە بەرژەوەندی فەرماندە بەکرێگیراوەکاندا نەبوو ، چونکە ئەوان نەیاندەویست بە شەڕێکی کورت ، پیشەکەیان لەدەست بدەن وکۆتایی بە دۆخەکان بێن، بۆیە درێژەیان بە شەرەکان دەدا بێ ئەوەی زیانێکی ئەوتۆیان لێبکەوێ .

مکیافیللی ئاماژەی بەوە داوە کە پشتگوێخستنی سەربازە پیادەکانی ئیتالیا لەلایەن فەرماندە کرێگیراوەکانەوە هۆکارەکەی بۆ بەرژەوەندی دارایی ئەوان دەگەرێتەوە ، چونکە ئامادە کردنی سەربازە پیادەکان کەمتری تێدەچێ لە ئامادە کردنی سەربازە سوارەکان، کە بۆ فەرماندە کرێگیراوەکان ببونە سەرچاوەی گەندەلی وپارە پەیدا کردن ، چونکە بەبێ سەربازی سوار دەکرا سەرجەم دەولەت بە سەرباز بکرێ بە گوژمەیەکی کەم ،هاوتا لەگەل ولاتە دراوسێکانی.

مکیافیللی دەلێ:

( بەشێوەیەکی گشتی گۆرانکاری وباشبونێکی کەم بەم سوپایەوە دیارە)، لە کاتێکا سەرجەم فەرماندە کرێگیراوەکان بە هەمان نەفەس وئەدا کاریان دەکرد، جەنگاین بە هۆکارێکی سەرەکی بەلکو تاقە هۆکاری بوژانەوەو ژیانی خۆیان

دەزانی ، لە بەرژەوەندی ئەواندا بوو کە هەموو رێنماکان قەبول کەن و هەمان ئەو رۆلە بگێرن کە هەیانبوو .
لەسەدەی پانزەهەم، مکیافیللی ئەو ناساندنەی بۆ شێوازەکانی هونەری جەنگ دەکرد لە ئیتالیا ، نابێ بە راستیەکی مێژویی بزاندرێ ، چونکە بنەمای پێناسە ی پرسە سەربازیە کان سەرچاوەیان لە چەند دیاردەیەکی دیاری ئەوکات وەرگرتوە ، فەرماندە کرێگیراوەکان لە نیوەی دوەمی سەدەی پانزەهەم بایەخیان بە پرسە نوێکانی سەربازی دەدا و سەربازە پیادەکان و هاون هاوێژیان بەکار دەهێنا ، واتە گۆرانکاریەک لە شێوازی فەرماندە کرێگیراوەکان رویاندا.
دواتر کێبرکێ و ململانێ لە نێوان فەرماندە بەکرێگیراوەکان وفەرماندە خۆجێییەکاندا هەبوو، لە پێناو وەدەستهێنانی سەرکەوتن وناوبانگی باش بۆ خۆیان و مانەوەیان لەسەر پۆستەکانیان. بۆیە رویان لە شەری مانۆرەو خۆدزینەوە لە گورزەکانی دوژمن دەکرد، بۆئەوەی بتوانن گورزی چاک لە دوژمن بوەشێنن ، بەلام ئەمە نە لە ویژدانەوە بوو نەلە نیاز خەراپیشیانەوە بوو ، هەلوێستی سیاسیی ئیتالیای ئەوکات ئاراستەو پێگەکانی دەستنیشان دەکردن، دواتر ئامراز و توانای ویلایەتەکان هەمویان لەیەک نزیک بوون لەروی توانای سەربازی وچەک وتەقەمەنی و برواو زیرەکیانەوە، کە رێگریان لە هەر هێرشێکی لایەنی بەرانبەر دەگرت ، دەکرا چاکسازیە سەربازیەکان لەم وەختدا ئەنجام بدرێن.
مکیافیللی لەو پەیوەندیەی نێوان رژێمی سیاسیی ئیتالیاو چەکە کۆنەکەی بەردەستیان ،بێ ئاگا نەبوو لەوەی لەگەل ئەوسەردەم نەدەهاتەوە ، مکیافیلی هەستی بەوە دەکرد کە ئیتالیا پیویستیی بە ئیمکاناتی هونەری زیاتر هەیە بۆ روبەرو بونەوەی مەترسیەکان ، لە پێش هەمویان هەلوەشاندنەوەی سیستەمی سەربازی کرێگرەتە و بەکارهێنانی سەربازی پیادە بوو بۆ روبەرو بونەوە لەگەل ولاتانی ئەوروپی.
مکیافیلی دەلێ :
(ئەو رۆحیەتەی ئیتالیەکان پێی روبەروی جەنگەکان بونەوە، لە بنەرەتدا سیستەمێکی هەلەبوو دەلێ: کاتێک کەس نەکوژرێ هیچ شار وگوند کاول نەکرێ، ناتوانین ناو لەو ئۆپەراسیۆنە بنێین جەنگ ، چونکە ئامانجی جەنگ وشەرەکان خەرپ کردن وکاولکردنی شار و گوندەکانی دوژمن و لەنا وبردنی سەربازەکانیانە ، کاتێک دەلێن کوشتن بەدەست ئەو لایەنەوەیە کە دەمێنێتەوە مەبەست لەناوبردنی بەرانبەرە ، دواتر تەنها ئاسایش وئارامی ولات دەبێتە

مەبەست ولە جەنگیشا هیچ یاسایەکی ویژدانی وئاینی نامێنێ، هەمویان لە خزمەت ئاسایش و سەرکەوتنی ولاتدا دەبن ، نە شەرم نە یاسا نە نەریت نابێ ببنە بەربەست لە سنوری شەرا، چونکە تەنها سەرکەوتن پێوەری شەرە) .
مکیافیللی بە سەرسورمانەوە باس لە (کاسترۆتیشیو کاستراکانی) دەکا دەڵێ:
( ئەگەر سەرکەوتن بە درۆ و چەواشەکاری وەدەست بهاتبایە، هیچ کاتێک پێویست بە بەکارهێنانی هێز نەدەکرا ، چونکە سەرکەوتن ئامراز نیە بەڵکو ئامانجە کە شانازیی پێوە دەکەیت )، بە دیدی مکیافیللی نابێ تەنها بە ئامرازە سەربازیەکان فەرماندە دەولەمەند بکەیت و بیپارێزی، بەلکو ئامرازی تریش هەن لەوانە هۆکارەکانی حیلەو فرت وفێل لە دوژمن ، ئەگەر راستەو خۆ بەکاریان بێنی یا نارەستەو خۆ، لە رێگەی پرۆپاگەندە و ..

## گرنگی جەنگی دەرونی لای مکیافیللی

----------------------------------

بەلکو زیادە گوتنبێ، ئەگەر بلێین مکیافیللی یەکەم کەس بوە باسی لە دەروننناسی کردبێ یا درکی بە بونی دەروننناسی کردبێ، چونکە گەلێک بەلگەمان لەبەردەستدایە کە ئەم ئاراستە لای مکیافیللی بونی هەبوە ، لە سەردەمی مکیافیللی و بەتەواوەتیش لە جەنگی رافینا کاتێک بەر لە دەستپێکردنی جەنگ شەرکەرەکان نمایشی خۆیان ئەنجام دەدا بە ئەسپسواری ونیشاندانی توانا سەربازیەکانیان بە شێوازێکی رەوشتبەرزانە ، ئەمەش نیشانەی ئەوەیە کە رێنمای هەمیشەیی هەبونە بۆ جەنگ وبەگژیەکدا چون ، تائێستاش بەلگەی وامان لەبەردەستە کە هەردوو لایەنی شەرکەر، شەڕێکی یەکسان وسنورداریان کردوە ، ئەمە ئەو ئاراستەیە بوو کە مکیافیللی کاری لەسەر دەکرد، پێی رەوا بوو لە شەرا هەموو تواناو شێوازەکان لە پێناو سەرکەوتندا بەکار بهێندرێ ، بە دیدی ئەو دەولەت بە گشت ئۆرگانەکانیەوە

وەکو ئادەمیزاد هەموو تواناکان لە هێز و ئازایەتی دەبێ لە کاتی شەردا بخاتە گەر ولە خزمەت جەنگەکە دابێ .
بەهۆی هەلەی بۆچونەکانی لە سەر گرنگی داهێنانی هاون و بایەخی سامان و سەروەت لە جەنگا ، رەخنە لە مکیافیللی گیرا ، بەلام واپێدەچێ کە بۆچونەکانی لەو زەرفدا واقعبینانە بوبن .
لە بەشە گرنگەکانی کتێبی (گوتارەکاندا) ئەو بەشە بوە کە باس لە ئەهمیەتی هاون دەکا بۆ سوپایەکی نوێ ، بەلام ئایا رای گشتی لەسەر ئەم پرسە  بروایان پێێ هەبوو بەقەدەر ئەوەندەی باسی لە ئەهمیەتی داهێنانی هاون کردبو بۆ پەرەسەندنی جەنگ ؟، ئەوەندە لای گرنگ نەبوو بەقەدەر گرنگی دان بە لایەنی ئازایەتی وهێزی داهێنان ودەستپێشخەری بۆ ئەم چەکە نوێیە لە جەنگا بنێ.
مکیافیللی گوێی لەو خەلکە بوو کە دەلێن : ئەو جەنگانەی لەمەودوا دێتە رێمان هەموویان جەنگی شەڕە هاون دەبن ، هەموو هەولەکانی لەم بابەتە بۆ ئەوە بون ناراستی ئەم بۆچونە بسەلمێنێ، لەگەل ئەو بۆچونەدا بوو کە هاون هەنگاوێکی باشی بەرەو پێش هاویشتوە و لە جەنگا رۆلی باشی دەبێ، بەلام دژی ئەو بۆچونە بوو کە جەنگەی داهاتوو تەنها جەنگی هاون دەبێ دەبێتە جەنگێکی یەکلاکەرە ، داهێنانی دروستکردنی هاون ئەوە ناگەیەنێ ، جەنگ هونەرێکی سەربازی بکاتە قوربانی هەندێک لە بسپۆرو ئەندازیاران ، چونکە هێشتا پێویستی زۆر بە کۆکردنەوەی سەرجەم هێزە سەربازی و مەعنەویەکانی دەولەت هەیە ، تائێستاش یەکلاکردنەوەی جەنگ بەندە بە توانا وئازایەتی فەرماندەو ئازایەتی سەربازەکان.
مکیافیللی شتێکی لەو بابەتەی پشکەش کردبوو بۆ گفتوگۆو کردن لەسەر گرنگی سامان لە جەنگدا ، لە برگەیەکدا نوسیویەتی، وێرای ئەوەی ئەم خەلکە وای دەبینن کە سامان تاقە فاکتەری سەرکەوتنی جەنگە ، بەلام من ئەمەیان بە مەرج نابینم ، مکیافیللی توێژینەوەکەی بەمە کۆتایی دێنێ :
( نەک سامان بەلکوو سەربازە ئازاکان مەرجی سەرکەوتنی سوپان لە جەنگا، چونکە بە سامان ناتوانین سەربازی چاک پەیدا بکەین) .
هاوسەردەمانی مکیکافیللی لەوانە کجتشاردینی بۆ ئەم بۆچونەی دەلێن: (مکیافیللی کەسێکی نەزەری بو، شارەزای لە پراکتیکدا نەبوو) ، بەلام ئەوەی راستیبێ لە هەندێک بەشی نوسینەکانی مکیافیللی دا هاتوە کە ئاماژە بە رۆلی سامان و سەروەت دەکا لە کاری سەربازی ، بە ریزەوە با س لەم بابەتە دەکا .

مکیافیللی حەزی لەوە نەبوە کە داهاتە سامانیەکان لە بەرێوە بردنی جەنگدا، بێ بایەخ بن ، بەلام کاتێک سەیری شارە مەزنەکانی ئیتالیای دەکرد وەکو فلۆرەنسا  ومیلان، خاوەنی سامان وسەروەتێکی دەولەمەند بوون کەچی کەوتە دەست دوژمن و نەتوانرا بە هۆی سامانەکانیانەوە بەرگری بکەن ، ئەو بروایەی ئەو پێداگریی لەسەر دەکرد بریتی بوو لەوەی کە هێزی سەربازی بنەماو ستونی هێزی سیاسیە ، سامانیش ئەم هێزەی سیاسی تەواو دەکا ئەمیش تەنها ئەو کاتەی هێزی سیاسی دەبێتە هێزی سەربازی .

**گیانی سەربازی بنچینەی هێزە**

**---------------------------**

لە تێبینیەکانی مکیافیللیدا زیتر لە مانایەک بە پەیوەندیەکانی نێوان هێزی دارایی و هێزی سەربازیمان پێدەبەخشێ، هەستی بەو چاکانە دەکرد کە کاری سەربازی پێسیتی پێیەتی و لە هەمان کاتیشدا لەگەڵ ئاراستەکانی بازرگانیدا نایەوە ، پێیوابوو کە ئاراستەو گیانی ئاشتیخوازانەی ئیتالیەکان لە سەدەی پانزەهەم ، بونە هۆکاری گەشەنەکردنی گیانی سەربازیی راستەقینە. ئەمەشی بۆ رون بوەوە کە ئەو گیانی ئاشتیەی ئیتالیەکان پەیوەندیی بە بەرژەوەندیە بازرگانیەوە هەیە . لە یەکێک لە نامەکانیدا کە بۆ هاورێیەکەی بەناوی فیتوری دەنوسێ ، تیایدا راستی ناخی خۆی بۆ دەردەخا و دەڵی:

( بەراست ئەوەیانم لەسەرخۆم بۆ دەرکەوت، کە من ناتوانم گفتوگۆلەسەر خوری وهەریرو  قوماش بکەم ، بۆیە بۆمن زەرورە لەسەر سیاسەت بدوێم ، واتە یا دەبوایە من بێدەنگ بم یا دەبێ لەسەر ئەو بابەتە بدوێم) .

بەرای ئەو، کاریگەری رۆلی دارایی لەسەر ئەقلیەتی فلۆرەنسیەکان بوە مایەی دارمانی سیاسی لەو ولاتە.
لەو دەولەتەی کە بتەوێ بگەیتە پۆستە سیاسیەکان و چاوت بریبێتە گەیشتن بە ئاستی سیاسیەکی بالا، دەبێ بەرژەوەندیە سیاسیەکان سیمای هەمو شتێکیانت داپۆشیبێ وباڵی بەسەر هەموو چالاکیەکانت داکێشابێ.
بەهۆی کەمی زانیاری لەسەر فەرماندەو سەربازە کرێگیراوەکان رەخنەی لە شێوازی هونەری جەنگی ئیتالیەکان گرت و داوای گیانی قوربانیدانێکی زیاتری لێکردن .
توانەوە و نەبونی گیانی فیداکاری ، وەکو لێی تێگەیشتبم لەئەنجامی چاوبریەنە دەستکەوتە تایبەتیەکانی ئەو خەلکەوە بون، بەرژەوەندیە تایبەتی ودارایییەکان بەسەر ئەوانیتردا زاڵ ببون . هیچ کاتێک ناتوانی سوپایەکی ئازاو هەمیشە سەرکەوتوت هەبێ، ئەگەر ئەو سوپایە بەرژەوەندیەکانی گەلی نەپاراستبێ و نەیخستبێتە سوروی بەرژەوەندیەکانی خۆی و دلسۆزیی بۆ نیشتمان نەبێ. ئەو سوپایەی هەردەم سەرکەوتوە دەبێ هی گەلێک بێ کە هەمیشە ئامادەی قوربانیدان وگیان بەخشینی هەبێ لە پێناو ئازادی وبروا سیاسیەکان .
دەتوانین بە ئاسانی لە بنەرەتی مەبەست و راکانی مکیافیللی بۆ چاکسازی سەربازی بگەین ، لە رێگەی گفتوگۆ رەخنەییەکانی پێشویدا، ئەو لەگەل دروست کردنی سوپای پیادە بوو، لەسەر بنەمای خزمەتی سەربازیی بە زۆر(زۆرەملێ) ، ئەم جۆرە رێکخستنە سەربازیەش پیویستی بە چاکسازییەکی سیاسی هەیە ، ئەگەر بە گیانێکی نوێ جۆش نەدرێ مومکن نیە سەرکەوتو بێ ، دواتر ئەوانە حوکمی خۆیان دەکەن باشتر دەەتوانن شەر بکەن چونکە بەرگری لە خۆیان و بونی خۆیان دەکەن، بەم جۆرە مەبەستی مکیافیللی ئەوە بوو کە دەبێ پەیوەندیەکی توند و تۆل لە نێوان دیموکراسی وسوپایەکی پیادەی سەربازە بانگکراوەکان هەبێ .
لەگەل ئەوەشدا خوێندنەوەی کتێبی هونەری جەنگ ، واتە کتێبە سەرەکیەکەی مکیافیللی لەسەر پرسە سەربازیەکان ، دەبێ توشی شۆکت بکا ، چونکە لەم کتێبەدا ئێمە ئەو هەنگاوو رێنمایانە نابینین کە لەو سەردەمە ناسکە پر لە روداوەی سەدەی شانزەم بۆ جێبەجێ کردن وپیادە کردنی راو بۆچونەکانی کە باسێکی راستەقینەی چۆنێتی جەنگ دەکا .

مکیافیللی بەرهەم و لەدایک بوی چەرخی رێنسانس بوو ، بۆ سەلماندنی راستی راو بۆچونەکانی، ئەوە رون دەکاتەوە کە راکانی گونجاون بۆ دونیای کۆن. بەهێزترین خالی سەلماندنی بیردۆزەکانی ئەوە بوو کە سوپای رۆمانی سوپایەکی پیادەی سەربازە بانگکراوەکان بوو . بۆیە تا رادەیەکی دوور وەکو رونکردنەوەی مەشق و فێرکاریەکانی سوپای رۆمانی بوو . زۆربەی نمونە بەکارهێنراوەکانیش لە مێژوو نوسە کۆنەکانی وەرگرتبوو وەکو ، لیفی ، بولیبیوس، و لاسایی هونەری سەربازیی کلاسیکی کردبووەوە ، کتێبەکەی زۆر بەسادەیی و ئاسانی نوسرابۆوە، وەکو ئەوەی بۆ ئەو سەردەم نوسرابێتەوە تا لیی تێبگەن .
سەرچاوە سەرەکیەکەی نوسینی ئەو کتێبەی، ڤیجتییوس بوو ، ئەو سەرچاوەشی بایەخی بەم بابەتانە دەدا : بژاردنی پیاوەکان، مەشق وئامادەکردنی سەربازەکان ، وێنەکانی جەنگ، دواتر هەندێک لەو روداوە جۆراو جۆرانەی کە شیاوی نمایشکردن بن بۆ راهێنانە سەربازیەکان و سودیان لێ وەرگرن لە کاتی ئۆپەراسیۆنە سەربازیەکاندا ، تەنانەت لە شێوازی رێکخستن و دارشتنی کتێبەکەشی دا مکیافیللی هەمان رێچکەی ڤیجتیوسی گرتبوە بەر، بۆیە مرۆڤ دەتوانێ بلێ یەکێک لە هۆکارەکانی پشتگوێ خستنی کتێبەکەی مکیافیللی ئەوە بوو کە بە کۆپیکراوی دەقە ئیتالیەکە دەزانرێ یا وەکو نوێکراوەی هەمان دەق دەبیندرا .
مکیافیللی هەندێک جار لەسەر شێوازی نمونە کلاسیکیە لاساییکەرەوەکە نەدەما ، وەکو نوێکردنەوەی هونەرە سەربازیە کۆنەکەی لێدەهات، پێدەچو کە ئەمەی بە ئەرکی خۆی زانیبێ ، ئەم سیمایەی بۆ خۆی بە زەرور دەزانی بۆیە بەم شێوەیە دەبوو . لەم روەوە دیارترین خالی گۆران و لەیەک چونی ئەو شێوازەی کە لاسایی ڤیجتیوس بکاتەوە ئەو چارەسەریە وشیاریانە بوو کە گرنگی بە جەنگ بدا .
بەلام بە پێچەوانەی ڤیجتیوس کە بە کورتی باسی لەم بابەتە کردوە ، باسکردن لە جەنگ زۆربەی روبەرەکانی کتێبی هونەری جەنگ هی مکیافیللی گرتبوو ، لە کتێبی سێیەم دەبینین کە بە شێوەیەکی خەیالئامێز هەلوەستە لەسەر خالی ستونی ئەو کتێبە دەکا ، هەردووکتێبی یەکەم هەمووی لەسەر چۆنیەتی دەست نیشان وبژاردەکردنی سەربازو مەشق و راهێنانەکانی دەکا ، باس لەوە دەکا ئاخۆ چۆن سوپایەکی باش وئامادە کراو دروست دەکەیت و بۆ کاری سەربازی بەکەلک بێت؟ لە مەیدانی شەرا سەرکەوتن بەدەست بێنێ ، یا بە مانایەکی تر

بلێین  ناوەرۆکی هەردوو کتێبەکەی تر هەموویان لەسەر جەنگ و بابەتەکانی پەیوەست بەم تەوەرەوە  بوون .
ئەوکاتەی باسەکان لەسەر جەنگ کۆتاییان دێ ماندو بونەکان دەهەسێنەوە ، مەبەستی لەم کتێبانە( سیستەمی هاتوچۆ و پازگادانان و خۆ توند کردن ) بوو ئەم پرسانەی لەو کتێبانە زۆر بە رونی لە دیراسەیەکدا چارەسەر کردون کە پەیوەندیەکی لاوازیان لە نێواندا هەبوو ، بەم شێوەیە ناراستەوخۆ جەنگ بەشێکی زۆری ئەو کتێبانەی گرتبوەوە ، وێرای ئەمەش گرنگی وبایەخی شەر لەو کتێبانە برگەی تایبەتی بون، لێرەو لەوێ خوێنەر بەدیی دەکردن ، تێیاندا هاتبو ، لەوکاتەی فەرماندە شەرەکە دەباتەوە هەموو هەڵەکانی دەسرێنەوە وتەنها سەرکەوتنەکەی بۆ دێتە ئەژمار، ئەم سەرکەوتنە دەبێتە ئەو نەخشەیەی کە سوپاکەی بۆ ئامادە کردبوو بەم ئەنجامەی گەیاند ، بۆیە ئامادەکردنی سەرباز وپێکهێنانی سوپا بە شێوەیەکی پەروەردە و مەشقپێکراو بە پرەنسیپە سەربازیەکان، بۆ ئەوەیە سوپایەکی چاک و بە تواناى هەبێ لە روبەرو بونەوەی لەگەڵ دوژمندا لە پێناو بەدەست هێنانی ئەنجامێکی باش  .
جگە لەمە ،  ناتوانی خۆت لە ئەنجامی شەر دور خەیتەوە ، شەرێک کە دوژمن بریاری لەسەر دەدا فەرماندە ناتوانێ خۆی لێ دورخاتەوە ، هەروەها ئەو شوێنەی دوژمن بریاری ئەنجامدانی شەرەکەی لەسەر دەدا ئەمەشیان فەرماندە ناتوانێ خۆی لێ دورخاتەوە، بۆیە دەبێ هەردەم ئامادەباشییی بۆ هەر ئەگەرێک هەبێ تەنانەت ئەگەر لەو ئەگەر وبریارانەی دوژمن بریاری لەسەر دەدا توشی هەڵەش بێیت دەبێ روبەروی بیتەوە  ، ئەمەشت لە بیر نەچێ  لەو کاتەی هاون داهێنراوەو لەم شەرانە بەکاری دەهێنن ، شورەو قەلاکانیش سودیان نەماوە بۆ راگرتنی هێرشەکانی دوژمن.
شەر تەرازوو پێوەری جەنگە ، دەتوانین گەلێک سود لەو بۆچونانەی مکیافیللی وەرگرین کە لەم کتێبانەیدا لەسەر جەنگ هاتون ، بە دڵنیاییشەوە ئەو شێوازەی بەهۆیەوە چارەسەری شەری کردوە لە بەشی سێیەمی کتێبەکەدا (هونەری جەنگ) نیشانەی ئەوەیە، مکیافیللی بایەخی بەم بەشەی کتێبەکە داوە ، لەم بەشەدا بە رونی باس لە رێگە چارەکانی شەر دەکا .
مکیافیللی زۆر بەرونی باس لەو دەستەواژەیە دەکا کە ئیمرۆ بە جۆرێک لە مێژووی کۆن دەناسرێ ، باس لە چۆنیەتی رێکخستنی سوپا و سەرباز وهێزی پیادە کە هێزە بنەرەتیەکەیە دەکا، باس لە چۆنیەتی دابەش کردنی سوارەکان دەکا ،  دابەش کردنیان لەم بەرو ئەوبەری رێگا ،  چۆن کاتێک دەست دەکرێ بە

تەقە کردن دواتر هاون هاوێژەکان بۆردومانی مەیدانەکە دەکەن لەوکاتەی هێزی خۆیانی تیا نەماوە و روبەرو بونەوەکە دەبێتە دورهاوێژی ئەوکاتیش شەرە راستەقینەکە دەستی پێکردوە .
ئەوسەربازانەی هەلگری رمە درێژەکانن لە ریزی پێشەوە فشار دەخەنە سەر دوژمن ودەیانشکێنن ، ئەوکاتەی مەوداکانی نێوانیان کورت دەبێت و سوپاکە شوێنی خۆی دەگرێ و شیر وەشێنەکان یاخەی یەکتر دەگرن ، ئەوکاتانە کاتی ناسک ویەکلاکەرەوەن ، چونکە زیانی مەزن لە یەکتر دەدەن و سەرەکەوتن و ژێر کەوتن لەسەر دەستی ئەوان دەبێ و تواناو زیرەکی و ئازایەتی رۆلی خۆی دەبینێ، کاتێک زیانەکانی کوشتن وبریندار کردن کەلەکە دەکەن، سەیر دەکەی دوژمن لە لای راست و چەپت رادەکا ومەیدانی شەر بۆتۆ جێدەهێلێ ، ئەوساتانە ساتی سەرکەوتنن بەمەش شەرەکە دەبەیتەوە .
ئا بەم ووشانە مکیافیللی کۆتایی بە باسکردن لەسەر شەر دەکا ، لەراستیشدا ئەمە باسی راستی روداوێک نیە بەلام وەکو گێرانەوەی بەسەرهات وچیرۆکێکی شەر وایە کە بینەرێک باس لە روداوێک بکا و هەلسەنگاندنی خۆی بۆی هەبێ ، بەهۆی ئەوەی شەر بینراوە بۆکەسێک لە ناوی نەبێ ولە دورەوە سەیری بکا وەکو ئەوە وایە کە پێشتر ئەم شانۆگەریە وێنەی بۆ کێشرابێ ، قۆناغەکان یەک لە دوای یەک دێن تەنها دەمێنێتەوە ئەنجامەکەی ئەگەر وەکو دارشتنەکە نەبێ ، چونکە ئەمە گرەنتیی نیە هەرلایەک سەرکەوتن بۆ خۆی دادەنێ، بەل کو هەموو تەقدیراتەکان وەکو خۆیان نەیەن ؟ هۆکاری ئەم نەزانینی ئەنجامانە مکیافیللی بۆئەوە دەگێرێتەوە کە شیکردنەوەی پرۆسەی سەربازی لە قۆناغی سەرەتایی دابێ، دەلێ :
(شیکردنەوەکان لە قۆناغی سەرەتایی دابون بۆیە نوسەران بەر لە رودانی شەرەکان ناتوانن ئەنجامەکەی بزانن) .
مکیافیللی شەری بەو کارە شوبهاندوە کە ئامێرەکان بە رۆنی زەیت چەورکرابێ بۆ ئەوەی بە چاکی کار بکا ، ئەم هەلسەنگاندە زۆر لە راستی بەرێوە چونی شەرەوە نزیکە ، چەنکە لەو سەردەم شوێنێک نەبوو بۆ داهێنانی هێز ، هەرکاتەی شەر دەستی پێکرد و سەربازەکان دابەزینە مەیدانی شەرو دەستەو یەخە کەوتنە نێو شەر، ئەوکات ناکرێ هیچ مانۆرێکی سەربازی ئەنجام بدەیت، چونکە ئەوکاتەت بەدەستەوە نیە بۆ ئەنجام دانی ئەم جۆرە ئۆپەراسیۆنانە ، ئەوەی لەوکات دەتواندرێ بکرێ ناردنی هێزێکی پشتیوانە بۆ هێلی دواوەی سوپا بۆئەوەی ببێتە هێزێکی پالەپەستۆ بۆ هێزەکەی پێشەوە تا

بەردەوامی بە هێرشەکان بداو سەرکەوتن مسۆگەر بکا ، بۆیە مەشقی سەربازی لەم کاتانە رۆلی خۆیان دەبینن دەتوانن جولە لە هێزەکانی دوژمن ببرن دسپلینی سەربازی و رێنماکانی بە وردی جێبەجێ بکەن ، لەم بوارە بە نمونە (فروند-سبرج) لە مەشقپێکەرە بەناوبانگەکان بوو، ئەم ناوبانگیەشی لە جێبەجێ کردنی ووردەکاریەکانی مەشق و راهێنان ی سەربازی وەرگرتبوو کە فێری سەربازەکانی دەکرد.

**گرنگی رێکخستنی سوپا لە شەردا ، لای مکیافیللی**

**---------------------------------------------------**

یەکێک لەو بابەتانەی مکیافیللی گرنگیی پێدەدا، پرسی توندو تۆڵ کردنی سوپا بوو لە کاتی شەردا ، بە دیدی ئەو توند و تۆلکردنی سوپا لە هەموو روێکەوە گرنگترین پرسی جەنگە ، بۆیە هیچ کاتێک لە بیری نەدەکرد لە کەمرتین دەرفەتا باسی لەم بابەتە بکردبایە ، ئەوکاتانەی ئاماژەی بە سوپا باشەکان دەدا دەیوت لە بیرتان نەچێ ئەم سوپایە بۆیە ئەم خەسلەتە باشانەیان هەیە چونکە توند وتۆل و دسپلینی سەربازیان تەواوە بۆیە سەربازەکان بەم شێوە ئازان و شەرەکانیش دەبەنەوە ، دەیوت کەم مرۆڤ ئازان بەلام رێکخستنی سوپاو دسپلینەکانی وادەکەن سەربازێکی زۆر ئازابن، کەوەیە پشت بەستن بە دسپلین وتوندو تۆلکردنی سوپا باشترە لە پشت بەستن بە پیاوی ئازا .

کێشەی رێکخستن توندو تۆلکردنی سوپا بۆ مکیافیللی دوو دیاردەی جیا بوون:
یەکەمیان / بە زەروری دەزانی کە سەرباز دەبێ مەشقی لەسەر چۆنیەتی چەک و بەکارهێنانی بکرێ و دواتر بگەرێتەوە سەر کارەکەی لە ناو یەکە سەربازیەکەی، چونکە ئەوان دەبێ شارەزاییان هەبێ لەسەر چەکەکانیان وپاراستنی ریزی سوپاکەو گوێ رایەلیان بۆ فەرماندەو بەرپرسەکانیان و جێبەجێ کردنی فەرمانەکانیان، چ لەکاتی پشودان یا لەکاتی روبەروبونەوەو جەنگین لە مەیدانی شەر.
دووەمیان / کە گرنگترە، ئەویش توندو تۆلی سوپایە ، ئەم پرسە ماوەی دوو سەدە جێی مشت ومر بووە ، ئەمەش خۆی لە م هەنگاوانە دەبینێتەوە ، دابەش کردنی سوپا بۆ سەر چەند یەکەیەکی تەکتیکیی بچوک بۆئەوەی هێزە مەزنەکەی سوپا بتوانێ بە ئاسانی و بێ گرفت جولە بکا .
لە نەخشەسازی جەنگیشدا مکیافیللی بە دروستی دەزانێ کە لە مەیدانی شەر سەربازەکان بەسەر سێ ریزدا دابەش بکرێن بۆئەوەی ئەگەر ریزی یەکەم سەرکەوتنی بەدەست نەهێنا ریزەکەی تر بچێتە هانایەوە ، بۆ ئەم بابەتە سیستەمی (لجین) ی رۆمانیی پێ باش بوو، ئامۆژگاریان دەکا تا لەسەر ئەو سیستەمە برۆن ، ئەمیش بریتی بوو لە دروست کردنی مەزنترین هێز لە بەتالیۆنی هاون هاوێژ و لە نزیکەی شەش تا هەشت هەزار سەربازی پیادە ، ئەم بەتالیۆنەش دابەشی سەر دە بەش بکرێ هەر بەشێکیان بە فەرماندەی ئەفسەرێک بێ ، لەم روانگەیەوە رادەسپێرێ کە ژمارەی سوپا لە پەنجا هەزار زیاد نەکا، چونکە زۆربونی سەرباز لەم ژمارەیە زیاتر توشی نارێکی و شلەژان دەبێ و کۆنترۆلکردنی بە ئاسانی ناکرێ ،تەنانەت لە نێو سەربازە توند وتۆلەکانیشدا هەراو گێرەشێوێنی دروست دەبێ .
ئەمە وەکو نمونە بۆمان دێنێتەوە ، لە مێشکی مکیافیللیدا وێنەیەکی تەواو ودروست بۆ ژمارەو چۆنیەتی سوپای هەردەولەتێک بە جیا هەبوو ، لە راستیدا ئەمە بیرکردنەوەی مکیافیللی بوو لەسەر رێکخستنی سەربازی ، ئەگەر هەندێک جار زیاد لە پێویست باس لە بابەتێک دەکا زۆری لەسەر دەنوسێ ئەمە نیشانەی ئەوەیە کە بە زەروری دەزانێ بنەماو رێنمای باش بدۆزێتەوە بۆ چارەسەریەکی تەندروست .
بەلکو هەندێک جار گومان دەکەونە سەر ئالیەتی جێبەجێکردنی بیرو راکانی و لە پراکتیزەکردنی بیردۆزەکانی بەگومان دەبن، بەلام ئەمەی بەوە چارەسەر

کردوه کە وێنەیەکی رونی بە خشیوەو لە کتێبەکەیدا وەکو دیالۆگ چارەسەری ئەم پرسە دەکا، ئەم گفتوگۆیە لە باخچەی خانەوادەی (رۆچلای) ئەنجام دراوە ، ئەم شوێنە بە کۆبونەوە بەناوبانگەکان و گفتوگۆکانی زاناو سیاسەتمەداران بەناوبانگ بوە کە هەردەم لەم شوێنە بۆ ئەم مەبەستانە لەوێ دانیشتنیان ئەنجام داوە .

لە راستیدا ئەم دیدە دیدێکی ئەفلاتونیانەیە ، چوونکە ریزی بۆ رۆمانیەکان هەبوە ، ئەم ریزلێنانە لە هەموو لاپەرەکانی ئەو کتێبە بەدی دەکرێ ، بەلام ئەم راستی گوتنە دلەراوکێ و کێشمەکێشمی بۆ خوێنەر دروست کردوە ، چونکە لێیان گوم دەبێ نازانن ئەم پیاوانەی گفتوگۆدەکەن لەسەردەمی رێنسانس دەژین و باس لەوکات دەکەن یا باس لە سەردەمی کۆن دەکەن؟ ئەم رایانە دەربری ئێستان ..یا لە رابردوو وەرگیراون؟

بۆیە دەتوانین بەکورتی بلێین ئەو راو بۆچونانەی لە کتێبی هونەری جەنگ دا هاتون ، روخسارێکی نادیاریان هەیە وئاراستەی ئامانجی کتێبەکەش دیار نیە .

## مکیافیللی لە کتێبی (هونەری جەنگ) دەبێتە مەرجەعێکی بنەرەتی

---

کتێبی هونەری جەنگ خەریکە دەبێتە مەرجەعی سەربازی ، لە سەدەی شازدەهەم زیاتر لە حەوت هەزار دانەی لێ چاپ کراوە و وەرگێردراوەتە سەر زۆربەی زمانە ئەوروپیەکان ، (مونتانی) پێی وایە لە دوای قەیسەر و بولبیوس و کومنییس ،مکیافیللی لە سەرچاوە باوەرپێکراوەکانە بۆ کاروباری سەربازی ، لەگەل ئەوەی ئەو گۆرانکاریەی لە شێوازی سەربازی لە سەدەی حەڤدەهەم رویدا، بوە مایەی ئەوەی ئەو کتێبە بێتە پێشەوەو بەرچاو بێ ، ئەوکات مکیافیللی دەبێتە سەرچاوەی زانیاری و هونەری سەربازی و رێکخستنەکانی بۆ ئەم مەبەستە، ئەم دەست وئەو دەست دەکرێ ، لە سەدەی هەژدەهەم مارشال (دی ساکس) پشت بەم کتێبە دەبەستێ لە نوسینی کتێبێکی لە 1757 ، هەروەها

(جاروتی) وای دەبینێ هیچ پێوسیت بە بەڵگە ناکا کە مکیافیللی (فریدریک ی مەزنی ) فێری ئەو شەرانە کردوە کە هەموو ئەوروپای سەرسام کرد ، دیسان (جیفرسون) ئەم کتێبە لە کتێبخانەی خۆی دادەنێ ، ئەوکاتەی لە 1812 شەری ئەمریکا رودەدا بەهۆیەوە زیاتر بایەخ بەو کتێبە دەرێ ولە ئەمریکا چاپێکی تایبەتیی بۆ دەکرێ .
بەلام لە سەدەی نۆزدەهەم ئەوکاتەی مکیافیللی وەکو هزر مەندێک ناو دەردەکا کتێبی هونەری جەنگ و هزرمەندی سەربازیەکەی بەرەو کاڵ بونەوە دەچێ ، تا ئێستاش هەندێک کەس وای دەبینن کە ئەو بوو درکی بە جەنگی نوێ کرد، ئەو جەنگەی شۆڕشی فەرەنسی بەدوای خۆیدا هێناو بەهۆیەوە خزمەتی سەربازیی بەزۆر بە یاسا کرا، بەلام زۆرکەسیش شکستی مکیافیلیان دەوروژاند لەوەی لەکاتێکا با س لە مەشق وراهێنانە کانی رومانی دەکا کەچی نەیتوانیوە بایەخی هاون لەم بوارە بە دروستی بپێکێ ، دەڵێن ئەمە نیشانەی ئەوەیە شارەزایی کەمی لە روالەتی کاروباری سەربازی هەیە.
بەلکو لەم هەموو ململانێیانە، بکرێ بڵێین لایەنێک هەموی راستە یا لایەنێک هەمووی هەڵەیە ، بۆ نمونە مکیافیللی بانگەشەی بۆ خزمەتی سەربازیی زۆرەملێ دەکرد ، هەرچۆنێکی بێ ئەم بۆچونە بە دید وپێوەری گۆرانکاریە نوێکان، بۆچونێکی سەرسورهێنەرە، زیاتر لەوەی رەتی بکاتەوە، پێداگری دەکا کە مکیافیللی کەم و کوریی هەیە لە شارەزایی ئەو سەردەم ، چونکە کاتێک ئێمە شیکردنەوە بۆ هێزە سیاسیەکانی ئەوکات دەکەین روبەروی سەرهەڵدان وبوژانەوەی هێزی دارایی ودەسەلاتی میرەکان دەبینەوە ، ئەمانەش هەمووی ئاماژەن بەوەی پاشەرۆژ هی سوپای پیشەوەرە ، لەم روانگەیەوە ئەو بۆچونەی لەگەل ئەوەدابوو سوپایەک لە خەلک دروست بکرێ وەکو سوپاکەی رۆمانی، دەتوانین بلێین تەنها خەونێکی جوان بوو زیاتر نا.
لە لایەکی تریش دەتوانین بلێین بایەخ نەدانی مکیافیللی بە هاون، سەرچاوەی لە زانیاریی راست ودروست وەرگرتوە ، چونکە وێرای ئەو داهێنانە هونەریە سەربازیە نوێیانە هێشتا رەگەزە بنەرەتیەکانی جەنگ رۆلی خۆیان لەدەست نادەن ، دواتر راسپاردەی مکیافیللی بە لاسایی کردنەوەی شێوازی رۆمانی تەنها ئۆپەراسیۆنێک بوو بۆ ئێمە ، لە راستیدا لیجیون ی رۆمانی بوو لە سەدەی شازدەهەم چاکسازی سەربازیی لەسەر کرا، لەو وچاکسازیانەش بە نمونە ئەوەی فرەنسوای یەکەم پادشای فرەنسا دوای ئەویش ئەو چاکسازیانە بون کە موریس ئەمیر ناسو ئەنجامی دابون ، مۆریس بوو سیستەمێکی یەکگرتوی

سەربازیی بۆ هونەری سەربازی رۆمانی دانا وبووبە سیستەمیکی تەکتیکیی یەکگتوی پیادە ، لەم سیستەمەیداو لە مەشق و راهێنانەکانی لاسایی ئەوروپای نەدەکردەوە ، بۆیە شێوازەکانی رۆمانی هەرگیز کاریگەری خۆیان هەبوو لە هەر گۆرانکاریەکی نوێدا ، بەم شێوەیە دەتوانین گفتوگۆ لەسەر بۆچونەکانی مکیافیللی بکەین کە هیچ کاتێک کۆتاییان نایە .

لە راستیشدا هەڵەیە ئەگەر هەڵسەنگاندنی بیردۆزە سەربازیەکانی مکیافیللی لە روی سودی راستەوخۆییەکانەوە ببینین ،هەڵسەنگاندن وپێوەری راست بۆ ئەم هەڵسەنگاندنانە ئەوەیە :

ئایا نمونەی هزرێکی نوێیە کە لە رێگەیەوە بتوانین باشتر لە دۆخی سەربازیی حالی حازر بگەین یان نا ؟ واتە ریزلێنانەکە لەسەر بنەمای وەدەست هێنانی بەرهەم و تێگەیشتنە لە دیاردە گشتیەکان؟. هەڵوەستە تەنها لەسەر سود وەرگرتن لە بابەتی تایبەتی ، بەم شێوەیە دەکرێ ئاستی مکیافیللی لە بواری مێژوی هزری سەربازی هەڵسەنگێنین و گرنگیی بزانین.

لەسەر مکیافیللی ئەوە یەکلا بۆتەوە کە یەکەم هزرمەندی سەربازیی نوێیە ، بەلام یەکەم کەس نەبوە کە بایەخی بە کاروباری سەربازی داوە چونکە بەر لەویش هزرمەندی تر هەبون بەلام نەگەیشتونەتە ئاست ئەو ، چونکە مکیافیللی گفتوگۆکانی سەربازیی بۆ ئاستێکی نوێ گواستنەوەو بنەماو لەیەک تێگەیشتنی نوێی داهێنا کە لەسەر ئەو بنەمایەوە ئەقلیەتی سەربازی و بیردۆزە جەنگیەکان دروست بین ، تەنها لە رێگەی ئەو دوو کتێبەی دەتوانین را و بۆچونەکانی هەڵسەنگێنین و بەراوردیان بکەین لەگەڵ ئەوانەی بەر لەو ، ئەوسا بۆمان دەردەکەوێ چۆن رێگە چارەی بۆ کێشەو گرفتەکان دۆزیوەتەوەو دیراسەو توێژینەوەکانی ئەنجام داوە .

پرسە سەربازیەکان بەشێکن لە چالاکیە کۆمەلایەتیەکانی رەگەزی ئادەمیزاد ، ئەمە هیچ گومان هەڵناگرێ ، بۆیە دیراسەکانی ئەم پرسانە بۆ راگەیاندنی دیراسە ئاینیەکانی سەدەی ناوەراست  لە گەڵ فەلسەفە کۆمەلایەتیەکان ئەژمار کران ، بەتایبەت ئەو کەسانەی لەسەر ئاماژەکانی مەسیح بایەخیان بەم بوارە داوە ، وەکو لاسایی کردنەوەیەک کێشە سەربازیەکان بەشێک بون لە بیردۆزە سیاسیەکان ، دواتر ئەوانەی کە هاتن بایەخیان بە دیراسە سروشتیەکان دا پێداگریان لەم بۆچونە کردەوە کە بابەتە سەربازیەکان بەشێکن لە ژیانی سیاسی.

چونکە ئەوەندە پابەند و سۆزداری مێژوی رۆمانی بون، بینیان کارە سەبازیەکان و مێژوی سەربازی گرنگترین پێداویستیی مەزنی مێژویی ومەزنی

سیاسیی دەولەت بون ، هەر بەهۆیەوە ڕێنسانسی زانستی سروشتی و هونەری بونە مایەی لە دایک بونی ئەدەبێکی نوێ خاوەن روخسارێکی دیراسیی هونەری ، بەم شێوە لایەنە هونەریەکان لە زانستی سەربازی خوێندران وەکو ئەندازیاری بیناسازی و فێربونی بەکارهێنانی چەک ، ئەمانە بونە بابەتی گفتوگۆو توێژینەوە لە زۆربەی لێکۆلینەوەکاندا .

گومانی تیا نیە ئەم سێ ئاراستەیە کاریان لە دروست کردنی بۆچونە سەربازیەکانی مکیافیللی دا کرد . بەو ڕێزگرتنەش لە کتێبی (فیجیتوس) کەوەکو سەرچاوە ناسراوەو پێگەی ئەو کەسەش للە سەدەی ناوەراست کە وەکو کەسێکی بە متمانە ناسرابو ، کاریگەری خۆیان هەبوو، دواتر باشترین دوو کتێب لەسەر هونەری سەربازی لە سەدەکانی ناوەراست ئەو دوو کتێبە بوون کە (ئەجیدیوکولونا ، کریستین دی بییزان) نوسیبویان، هەرچەندە لە ناوەرۆکدا هەردوکیان دوپات و جەختی کتێبەکەی (فیجتیوس) بون بە کەمێک جیاوازی بەمەبەستی گونجاندنی لەگەل رەوشی دەرەبەگایەتی ئەوسا ، بۆ ئەمەو بۆئەوەی مکیافیللی لەگەل نوسینەکانی کتێبی فیجتیوس دا بێتەوە لەو سەردەم کە تیایدا دەژیا، دەبوایە ئەویش لەگەڵ هەنگاوو بۆچونەکانی کولانا و کریستین دا یەک بێ ، ئەمەش بە رونی دیارە کە چۆن بە ووردی باس لە بەکارهێنانی چەک دەکا و دواتر دێتە سەر بابەتی خۆقایم کردن لە هونەری شەڕو قەلا دروستکردن کە ئاماژەن بۆ شارەزایی مکیافیللی لە کێشەکانی ئەندازیاری سەربازی.

ئەوانەی بایەخیان بە دیراسەکانی سروشتی ئادەمیزادی دا کاریگەری باشیان بەسەر مکیافیللیەوە دیارە ، بلاتینا لە ساڵی 1468 دەنوسێ دەڵێ:

(هیچ شتێک هێزی ئیتالیای لاواز نەکرد بەقەدەر ئەوەی کە پێویست کرا مرۆڤە ئیتالیەکان هەمویان چەک بەکار بێنن ) ، بەر لە مکیافیللی سیاسەتمەدارە فلۆرەنسیەکان وەکو (ماتیو بالمیری 1406-1475) رەخنەیان لە سەربازە کرێگرتەکان گرتوە و بەرگریان لە بیردۆزی (پرچەکک کردنی هاولاتیان) کردوە ، هەروەها ئەوانەی بایەخیان بە دیارسەکردنی سروشتی ئادەمیزاد دا وەکو ( باتریکیوس1415-1494) رایان سپارد کە گرنگی بە مەشقی سەربازیی بەزۆر بدەن بۆ هەموو پیاوە تەمەن بچوکەکان ، هێرشیشیان کردە سەر نیانی و تواندنەوەی گەنجان لە نێو کۆمەلگا کە لەو سەردەم ببوە باو ، داخیشیان بۆ کەمبونی پالەوانان خواست لە نێو ریزی سەربازیدا ، ئەمەشیان

گەراندەوە بۆ بلاو بونەوەی گیانی بازرگانی کە لەو سەردەم باو، بوو ببوە مایەی ئاژاوەو نارەحەتی سیاسی لە ولات .
لە کۆتاییەکانی سەدەی چواردەهەم، سالوتاتی(130-1406) دەڵێ:
( سیاسەتی فلۆرەنسا ئەو جوامێرانە ئاراستەی ناکەن کە چاوی گەشەو بەرەو پێش چونیان هەبوو ، بەلکو لە ژێر ئاراستەی بازرگانی دایە ، کاتێک بازرگان وپیشەسازکار رقی دونیایان لە جەنگ دەبێتەوە و بە دوژمنی سەرسەختی خۆیان دەزانن ، ئەوان ئاشتی وئارامیان دەوێ تا قازانج بکەن، لە شەرو ئاژاوە تەنها زیانیان پێ دەکەوێ بۆیە رقیان لە جەنگە .
بە پشت بەستن بەو پەیوەندیە رونانەی نێوان بۆچونەکانی مکیافیللی و ئەوانەی بەر لەو لەسەر پرسە سەربازیەکان نوسیویانە ، دەتوانین ئەوە بلێین کە مکیافیللی لە نوسینەکانیدا پشتی بە بۆچون و زانیاریی نوسەرەکانی بەر لە خۆی نەبەستوە، چونکە ئەوەی لە کتێبەکانی مکیافیللی دایە لەوانیتر بەدی ناکرێ، راسپاردەو ناوەرۆکەکان لەیەک ناچن ، ئەو بایەخەی مکیافیللی بە هونەری سەربازیەوە داوە ، لە هەموو ئەو خالانەی تایبەتن بە هونەری سەربازی لە هێزی پیادە، جێی رەخنە بونە لای مکیافیللی ، بە نمونە کۆناتسانو لە کتێبەکەیدا کە لە سالی 1507 چاپی کردوە دەڵێ:
( خەلکانی چەرخی نوێ سەربازی پیادەیان خۆش دەوێ چونکە لە کاتی شەردا بۆیان دەستخۆشن ، ئامۆژگاری فەرماندەکانی کردوە ئەم جۆرە شەرانە نەکەن چونکە هەموو کاتێک ئەنجامەکان مسۆگەر نین ، هەروەها بتریسیون دەنوسێ دەڵێ:
( سەرەرای ئەوەی ئازایەتی وشارەزایی لە پرسە سەربازیەکان هاوکاری فەرماندە دەکەن ، بەلام هەموو کاتێک بەخت ونسیب هۆکاری یەکلا کەرەوەن ، دواتر وەکو ئامرازێکی فرە ئامانج سەیری شەریان کردوە) .
لەگەڵ ئەمەشدا مەزنترین راستی ئەوەیە کە مکیافیللی ئەم خالە کۆنە لاسایی کەرەوانەی وەلانان وبە شتی تری گۆرینەوە ، لەم روەوە راو بۆچونی تازەی پێشکەش کردن ، ئەو راو بۆچونانە، بەشە زەرورەکانی بەش بە بەشی لەیەکی دان ، لە ئەنجامدا شێوازێکی نوێی لە بیرکردنەوە دروست کرد کە تەواوکەری یەکتر بن، ئەمانەش هەمویان پشتیان بە بۆچونەکانی مکیافیللی دەبەستن وبونە هزری نوێی ئەو ، بە دیدی ئەو ژیانی سیاسی ململانێ بوو لە نێوان شانە نوێکان کە تازە دروست دەبن ، جەنگیش زەرورەتێکی سروشتییە بۆئەوەیە تا بزاندرێ ئاخۆ دەولەت چۆن دەبێ بژیێ؟ بەلکو هەندێک جار لە نێوان گەشە

بون ونەمانا یەکلایی دەبێتەوە ، بۆیە رودانی جەنگ شتێکی حەتمی بوو بۆئەوەی دوا بریار بدرێ ، شەریش باشترین شێوازی گەیشتن بە بریاری خێرایە چونکە ئەم بریارەیە ولاتی شکستخواردو دەخاتە ژێر دلۆڤانی ولاتە براوەکە .
بەهۆی ئەو گرنگیە مەرکەزیەی جەنگەوە، نابێ ئاراستەکانی بخەینە ژێر رەحمەتی سودفە ، بەلکو دەبێ خۆمانی بۆ ئامادە کەین بە جۆرێک بیر لە هەموو پێداویستیەکان بکرێتەوە تا سەرکەوتن مسۆگەر کەین .
بۆیە ئامادەکاریی ورد بۆ جەنگ، تاقە رێگەی دروست کردنی سوپاو سەرکەوتنەکانە ، ئەمە وا پێویست دەکا دوبارە ئامرازە کۆنەکانی رێکخستنی سەربازی بەسەر کەینەوەو پێداچونەوەیان بۆ بکەین ، دەبوایە زانستەکانی سەربازی و پێویستیەکان ببنە بەشێک لە گیانی سەربازی .
ئەوکاتەی ئەوانەی بایەخیان بە دیراسەکانی سروشتی ئادەمیزاد دەدا ورەخنەیان لە بیرمەندە هاو سەردەمەکانیان دەگرت، بەوە تاوانباریان دەکردن کە لە روی پالەوانی سەربازیەوە کەم و کوریان هەیە و پالەوانیان بەرهەم نەهێناوە، ئەمە لە ئەنجامی ئەو روداوانەوە بوو کە دواتر رویاندان ، لە راستیشدا ئەمانە ئاراستەی نا تەندروست بون کە دژی بابەتە رەسەنەکە بون ، بەلام ئەگەر سەیرێکی بیردۆزەکانی مکیافیللی وراو بۆچونەکانی بکەین دەبینین هەندێکیان هەندێک بەهێز دەکەن وتەواوکەری یەکترو لەیەک بەستراوەن ، لە ناوەرۆکیشدا بنەمای فەلسەفەی گشتیی سیاسەت وجەنگ پێک دەهێنن .
بۆیە هێزو رەسەنایەتی دیراسەکانی مکیافیللی ، لە فراوانی بنەماو رەسەنایەتیی دایە ، سەرجەم کێشە سەربازیەکانی لە یەک بازنەدا کۆکردۆتەوە ، لە راستی پەیوەندیە ناوەخۆییەکانی هونەری سەربازیی جەنگ وپەروەردەی سەربازی و رێکخستنی سیاسی دەکۆلێتەوە ، بۆ هەلسەنگاندنی ئەو سەردەم دەلێ ئەو دۆخە مێژوییەی لێی لەدایک بوە دەستکەوتی باشی وەدەست هێناوە ، ئەگەر ئەو بۆچونە نوێانەی روداوی سیاسی نەبونایە کە ئەنجامەکەی پرۆسەی رێنسانس سەرهەلدەدا، ئەوا ئەم دیدە وردەمان لەسەر رەوشەکە نەدەبوو، بەلام گومان لەوە دا نیە کە هزری سەربازی لە سەردیاردە نوێکانی سەربازیی ئەو سەردەم بریتی بون لە چەکی نوێ و دروست بونی یەکەی پیادە . زەرور بوو لە روانگەی ئەو دۆخە نوێیە هەموو ئەگەرەکان بخرێنە سەر مێز ، بەلام گومان لەوەدا نیە لە سەردەمێک کە یەکسانی کۆمەلایەتی بەرقەراربێ دەبێ هزری

سەربازی لە چوارچیوەی دامەزراندنی پێشنیاری هونەری بێ لە چوارچیوەیەکی گشتیدا و تەنها باس لە وردەکاریەکانی بکرێ .
قەیرانی فێربون و رەهەندە سیاسیەکانە بونەتە نیشانەی کۆتایی سەدەکانی ناوەراست . بەلام لەبەر ئەوەی جیهانی سیاسەت لە جۆشدان دایە ، دەکرێ ئۆرگانی نوێ لەسەر تێگەیشتنو بنەمای نوێ دابمەزرێن ، ئەمەش نیشانەی ەئوە نیە کە ئەم جۆرە چارەسەریە وردانە لای هەموو هزروانێکی ئەو سەردەم بونیان هەبوە ، بەلکو ئەمە پێویستیەکی زەرور بوو بە هزرەکانی مکیافیللی لەو کات بۆئەوەی سود بە هەموو هێز و توانایەک بەیەنێ لەو سەردەمدا ، لە هەمان کات ئەو قەیرانەی لەو سەردەم بەسەر رەوسەکەدا هات بریتی بوو لە قەیرانی هەستی شۆرشگێرانە بۆ کێشە سیاسیەکان.
گیانی رێنسانس بە دروستی لەگەل ئەو سەردەم دەهاتەوەوەکو ئەو تاقیکردنەوەی دیاردە سیاسیەکە ، ئەو بروایانەی هەمو وهزروانێکی ئەو سەردەم لەگەڵی کۆک بوون و پێیان وابوو بەهۆی ئەو بروایانە بوو بەو قۆناغەی رێنسانس گەیشتن ، ئەویش ئەو بروایە بوو کە یاسایەک هەبێ حوکم لەسەر هەموو دیاردە و چالاکیەکانی ژیانی کۆمەلایەتی و چالاکیەکانی مرۆڤ بکا . ئەوکات یاسای وا هەبون کە لە ئەنجامی لێکۆلینەوەو دیراسە لێی گەیشتبونە بروا ، بەهۆی ئەو یاسایانە دەتوانرا کۆنترۆلی روداوەکان بکرێ ، لەم روانگەیەوە مکیافیللی گەیشتە ئەو بروایەی کە یاسا دەتوانێ کۆنترۆلی سەرجەم روداوە سەربازیەکانیش بکا بۆیە دەکرێ بەهۆیەوە دیراسەی سەرجەم پرسە سەربازیەکان بکرێ ،ئەوە بوو هەموو بایەخ وهەولێکی خۆی لەم بوارە تەرخان کرد بۆ دۆزینەوەی یاساکان ، دواتر هەندێک لەو کەسانە لەگەڵیدا یەکیان گرتەوە ، ئەوانەی دەیان ووت مرۆڤ دەتوانێ بە چەکی ئەقل دونیا ئاوەدان بکا و کاولیشی بکا ، هەر بەو هۆیەشەوە دەتوانێ بۆچون و دەستەواژەی ( بروا بون بە چاکەو بەخت ونسیب ) لەناو بەرێ .

## گرنگی ئەقل وزانست لە جەنگدا، لای مکیافیللی

---------------------------------------

ئەم بروایە شتێکی روکەشی نەبوو چونکە پیاوانی سەردەمی رێنسانسی ئەوروپی بە سەرپێی سەیری بەخت ونسیبیان نەدەکردو لە بایەخیان کەم نەدەکردەوە ، پێیان وا بوو کە ژیان ململانێیەکی توندە لە نێوان روالەتی مرۆڤ وئەقل وخواوەندی بەخت و نسیب ، لە هەمان کاتا گومانیان لەوە نەبوو کە دواجار ئەقلی مرۆڤ دەبێ سەرکەوێ .

کاتێکیش مکیافیللی جەنگی کردە سەنتەری بیرکردنەوەکانی، توانیی بەهۆی ئەنجامە دروستەکانیەوە سەرکەوتن بەدەست بێنێ، ئەو کردارەی کە پێش ئەو کتێبە مەترسیان لێی دەکرد، لەم کتێبە هیچ مەترسیەک نەما دواتر بەهۆی رێکخستن و دامەزراندنی سەربازی لە رێگەی یاساوە کە ئەمەش بە ئەقل

دەکرێ، بەمەش دەرفەتی کەم بۆ سودفە مانەوەو سەرکەوتنەکان کەوتنە دەست مرۆڤ و ئەقل وبیرکردنەوە.
ئەم سەرکەوتنەی ئەقل بوە مایەی زیاتر رازی بونی مکیافیللی لە مەشق و راهێنانە سەربازیەکانی رومانی ، بەرز و پیرۆز راگرتنی کۆن وئاراستەی تاک پەرستی بونە فاکتەری ئەم داهێنانە ، فراوانی دەسەلاتەکانی رومانی وبەرگریەکانی سوپای رومانی نیشانەی دروست رێکخستنە کانی سوپای رومانی بون ، مەشق و راهێنانەکانی سوپای رومانیش بونە مایەی گونجان و بەردەوامی سوپایەکی باش .
دیارە تێکشکاندنی هێزەکانی دوژمن و وەدەست هێنانی سەرکەوتنەکان لە ئامانجە بنەرەتیەکانی جەنگ بونە ، بەم شێوە هزری سەربازی بوە بوارێکی سەربەخۆ بوە خاوەنی دام ودەزگاو ئامانج وشێوازی تایبەتی خۆی ، کەواتە دەتوانرێ لەسەر بنەمایەکی هونەری گفتوگۆ لەسەر کێشەکانی سەربازی بکەین، لەوەش باشتر ئەو کاتە بوو ئەگەر ئامانجی هەموو دەزگا سەربازیەکان یەک ئامانج بوایە ، بە رای مکیافیللی ئەمە چارەسەریەکی باش دەبوو بۆ پرسە سەربازیەکان و دەبونە مەرجی سەرکەوتن لە شەرەکاندا ، هەرچەندە دەستەواژەی ستراتیژی ئەوکات ناسراو نەبوو بەلام لە راستیدا ئەمە خۆی سەرەتایەکی بیرکردنەوە ستراتیژیەکان بوو .
لەوکاتەوە هزرە سەربازیەکان کە پێشکەش دەکران ، سەرچاوەیان لە هزرەکانی مکیافیللیەوە گرتبوو ، بەلام ئەمە ئەوە ناگەیەنێ کە سەرجەم هزرەکانی سەربازیی مکیافیللی قەبول کرابن و رەزامەندیان لەسەردرابێ و پشتی پێببەستن ، هەرچەندە ئەو وتووێژو گفتوگۆیانەی لەم بارەیەوە کراون ئاماژە نەبون بۆ رەت کردنەوەی ئەم هزرانەی مکیافیللی، بەلام وەکو درێژە دەرو بەرفراوان کردنی هزرەکانی ئەو بوون.
بۆ نمونە هەرچەندی رای مکیافیللی گرنگیی لەسەر ئەوە هەبوو جەنگ بریارێکی یەکلاکەرەوەیە ، پێویستی بەوە دەکرد رونتر و باشتر لەم مانایە بکۆلدرێتەوە و لە لایەنە باش و خەراپەکانی بگەن، بیردۆزە سەربازیەکان لە ئاستی دروستکوردنی یاساو بنەمای دامەزراندن و رێکخستنی سەربازی نەدەوەستان تا سیستەمێکی دروست بۆ ئەنجامدانی شەر دابنێن ،بەلام دەبوایە بە ووردی چاودێری بەرێوە چونی شەر بکا هەنگاو بە هەنگاو لێکۆلینەوەیان لەسەر بکا ، لە لایەکی تر ئەگەر شەر پێوەری جەنگ بێ کەوایە دەبێ سەرجەم

قۆناغەکانی ئۆپەراسیۆنە سەربازیەکان و هەڵمەتە سەربازیەکان بخرێنە ژێر نەخشەی جێبەجێکردن و شیکردنەوە.

ئەگەر بەم شێوەیە بێ رۆڵی رێکخستنەکانی سەربازی وئامادەکاریەکان و ئاراستە نەخشە سازیەکانی کاری سەربازی لە جەنگە نوێکاندا گەلێک لەوە گرنگترە لەوەی مکیافیللی مەزندەی دەکا ، چونکە ئەو ئەم رۆلە گرنگەی بە فەرماندە دابوو ، بەلام لە راستیدا ئەمە لە دیراسەیەکدا هاتبوو کە پەیوەندیی بەم بابەتەوە نەبوو ، چونکە هەرئەوەندە ئاماژە بە فەرماندە درابوو کە دەبێ فەرماندە شارەزایی تەواوی لەسەر مێژوو جوگرافیا هەبێ، بۆئەوەی فەرماندەیەکی سەرکەوتوبێ ، بەلام لە سیستەمی سەربازیی نوێی داهاتوو رۆلی فەرماندە لە نەخشەسازی جەنگ دەگۆرردرێ یا بە مانایەکی تر بلێین رۆلی فەرماندە لە دانانی پلان ونەخشەی شەرەکان بە شێوەیەکی تر دەبێ کە ئەوەندە رۆڵی تیا نابینن ، بە هەمان شێوە سەبارەت بە رۆلی فەرماندە لە مەشق و راهێنانە سەربازیەکان، چونکە ئەم دوو پرسە دەبنە کێشەیەکی مەرکەزیی پرۆسەکە . لەگەل بەخۆوەبینینی ئەو پێشکەوتنانە لە بواری سەربازی ، هزرە سەربازیەکان زۆر زیاتر گەشەیان کرد لەوەی لە سەردەمی م کیافیللی دابوو ، بەلام لەگەڵ ئەوەشدا ئەنجامەکانی هەر ئەنجامی ئەو لێکۆڵینەوانە بون کە ئەو دەستی پێکردبوو.

تەنها لە یەک روەوە دەتوانین بلێین هزرە سەربازیە نوێکان لەگەل هزری مکیافیللی نەک یەک ناگرنەوە بەلکوو دژ بە یەکن ، مکیافیللی گرنگیی بە هزرە گشتیەکانی سەربازی دەدا کە دەگونجان لەگەل رێکخستنی سەربازی نوێ ، سەرەرای ئەوەی ئۆپەراسیۆنە سەربازیەکان لە هەندێک دۆخی مێژوویی جیا رودەدەن بەلکوو رێنما سەربازیەکان بۆ هەموو ئەو کاتانە نەگونجێن، بەلام ئەوەی بە شێوەیەکی گشتی مکیافیللی بیری لێدەکردەوە بۆ کاتە ئاساییەکان دەبون.

لەگەڵ ئەوەی کە مکیافیللی لە سەدەی پانزەهەم سەرەتای کارەکەی بە رەخنەگری جەنگ دەستی پێکرد کە وەکو بینەو بردەکانی شترنج وابوو ، فەرماندەی شەرەکانی سەدەی هەژدەهەم تا رادەیەک وەکو ئەو دارەی شەترنج بە بینە وبردە ومانۆرە شەریان دەکرد ، ئەمەش دژی هزرەکانی گشتی نیە لە دونیای سەربازی ، ئەمە ئەو ئاراستەیە کە مکیافیللی دەستی پێکردبوو بە یاسای ئەقل ئیدارەی شەرەکانی دەکردو هیچ بوارێکی بۆ سودفە جێنەهێشتبوو ، دەبێ هەرگیز ئەو خۆوەدەست دانە بۆ دوژمن بهێلیەوە کە کاتی دۆراندن لە شەرەکە خۆی رادەستی هێزەکانی تۆ بکا .

ئەنجامی ئەو بروایەی کە جەنگ زانستێکە ، یا لانی کەم ریز بۆ لایەنی مەنتیق ی پرسە سەربازیەکان دابنێین بەلکوو بە ئاسانی بمان گەیەنێتە ئەو بروایەی کە دەڵێ : دەکرێ لەسەر کاغەز بریار لەسەر ئەنجامەکانی جەنگ بدەین ،هەروەک دواتر ئەم بریارە لە گۆرەپانی شەر جێبەجێی بکەین .
لەوکاتەوە تواندرا ئەوە بسەلمێندرێ کە جەنگ تەنها زانست نیە بەلکو هونەریشە.
لەگەل کۆتاییەکانی سەدەی هەژدەهەم ، هەست بە هەندێک پرسی تریش کران کە کاریگەریان لەسەر بابەتەکان هەبوون ، بریتیبون لە بە گرنگ زانینی هۆکارە تایبەتیەکان زیاتر لە هۆکارە گشتیەکان، ئیتر لەوکاتەوە دەستکرا بە بایەخدان بەو هۆکارانەی کە پێشتر هیچ بایەخێکیان پێی نەدابوو .
بەهەند وەرگرتنی ئەو تێگەیشتنە نوێیە لە بایەخدان بە تواناو بەهرە تاکە کەسیەکان لە تەک هۆکارە هونەریەکان لە بیردۆزە سەربازیەکاندا، بە ناوی (کلاوزفیتەز)ەوە ناسراو بلاو بۆوە ئەو نوسەرە بەوەش ناسرابوو کە لە رەخنەگرتن لەوانەی لەگەل بۆچونەکانیدا نەبوون ،زۆر توند وتوش بوو ، بایەخێکی ئەو تۆی بە هزرو نوسینەکانی مکیافیللی نەدەدا، هەرچەندە پێی وابوو مکیافیللی لە هەلسەنگاندنە سەربازیەکاندا راستگۆ بوە و حوکمە کانیشی لە پرسە سەربازیەکاندا دروست بونە.
ئەمەش نیشانەی ئەوەیە، وێرای ئەوەی کلاوزفیتەر داهێنان و هزرێکی نوێ دێنێتە ناو بیردۆزە سەربازیەکانەوە لە دەرەوەی هزرەکانی مکیافیللی، بەلام لە خالێکی بنەرەتی لەگەڵیدا کۆک بوە بۆیە دەڵێ:
وردیی لە شیکارە کانی تایبەت بە کێشە سەربازیەکان، نیشانەی دیدو بۆچونی راستی ئەون لەسەر سروشتی جەنگ .
ئا بەم شێوەیە کلاوزفیتەز ئەو هزرمەندە شۆرشگێرە مەزنە کە لە نێو هزرمەندەکانی سەدەی نۆزدەهەم دەردەکەوێ، بیردۆزەکانی مکیافیللی وەلا نانێ و پشتگوێیان ناخا، لە نرخیشیان کەم ناکاتەوە بەلکوو لە هەندێک لە بەهێزترین بیردۆزەکانیدا سودی لێی وەرگرتوەو ئاماژەی بە راو بۆچونەکانی داوە .

## مکیافیللیزم لە تەرازوی شەرعدا

--------------------------------

ئەی هەلویستی شارستانێتی ئیسلامیی عەرەبی لە هزرەکانی مکیافیللی چیە؟ سەنگی ئەو هزرانە لە تەرازوی شەرع و ئیسلامی ئابرومەند چیە؟
ئیسلام لە لوتکەی پارێزی دادپەروەری وراستی وخێر و چاکە و جوانی دایە .
ئەویش فەرمانێکە بەموسلمانەکان دەدا کە ئەوەی خوا فەرمویەتی جێبەجێی بکەن، داواشیان لێ دەکا ئەو دەستەواژانە بپارێزن، لە مامەلە کردنتان لەگەڵ هەموو کەسێک و لە نێو هەموو گەل ونەتەوەیەکدا بێ جیاوازی بن ، جا ئەوانە موسلمان بن یا نا موسلمان.

هەلوێستی ئیسلام لە ئامراز ومەبەستەکان، جوانترین بڕواکان بریاری لەسەر داوەو دیاری کردون کە پابەندی یاساکانی دادپەروەری وچاکەو خێر و راستی بن ، لە فەرمانەکانی خوا دەرنەچن کە خۆیان لە چاکەکردنو دور کەوتنەوە لە خەراپە دەبینێتەوە.
سەبارەت بە هەلەی بچوک دەبێ ، دلْمان کراوە بێ شوێنی هەندێک زیان و وردە گلەیی ببێتەوە بۆئەوەی لە شەرو خەراپەکاری دورکەوینەوە ، ئەوکاتانەش کە هیچ رێگەیەک نابن رێگری لە شەرو خەراپە بگرین ، دەبێ ئەو ووردە خەراپانە لە پێناو بەرژەوەندی گشتی بشارینەوە.

**بنەماکانی ئیسلامی لەم روەوە بریتین :**

برگەی یەکەم/
دەبێ مرۆڤ لە ژیانیدا مەبەستەکانی بەو رێگە پێدراوانەوە بەند بن کە خوای پەروەردگار رێگەی پێداوین ولە شەرع دیاری کردوە .
چونکە هەموو حەز و ئارەزوێک بۆ مرۆڤ رێگە پێدراو نیە ، تەنها ئەو حەزانە نەبن کە لە شەرعدا هاتون .
برگەی دووەم/

دواتر دەبێ مرۆڤ بەدوای ئەو حەزانەی خۆیدا بگەرێ و هەول بدا کە وێرای رێگە پێدانی شەرع، دەبێ لەسەر حسابی مالْ و سامانی خەلک نەبێ و نابێ سامانی گشتیش بێ دادپەروەری بەکار بێنێ ، نابێ قەدەغەکراوێکی خەلک بەکاربێنی بۆ حەز و ئارەزوەکان تایبەتیەکانی خۆت ، نابێ زیادە خەرجی لە سامانی خەلک و گشتی بەکار بێنی .
برگەی سێیەم/

ئەگەر لە ژیانی مرۆڤدا دوو مافی راست ودادپەروەر بونە ئەرکی تۆ و نەتوانرا هەردوکیان لە یەککاتدا جێبەجێ بکەیت، یا بەیەکەوە حەرامیان کەیت، نەشتوانرا هەردوکیان بە یەکەوە وەلانیی و هیچ رێگە چارەیەک بۆ ئەمە بەیەکەوە نەدۆزرایەوە ، بریاری ئیسلام بۆ ئەم جۆرە حالەتانە کە هەردوکیان ئەرکن نەتوانرا هەردوکیان بەیەکەوە جێبەجێ یا وەلا بنرێ یا پشتگوێ بخرێ ، حوکمی ئیسلام دەلی:

1- دەستبەرداری بچوکترینیان ببەو ئەویتریان جێبەجێ بکە ، چونکە ئەرکە مەزنە کە بۆ موسلمان پێویستترە وخێر وچاکەی زیاترە .

بەنمونە ، ئەگەر یەکێک لە نوێژدا بوو لەو حالەتەشدا دوژمن گەمارۆی ولاتەکەیدا ، ئەگەر خۆی دوا بخا تا ئەوکاتەی نوێژ تەواو دەکا ئینجا بەهانای شەربچێ، دیارە ئەوکات دەرفەت بۆ ،دوژمن دەرەخسێ و ولاتەکەت داگیردەکا ، بەلام ئەگەر نوێژەکە دوا بخەیت وبەرۆکی دوژمن بگریت وبەرگری لە ولات بکەیت، بەلوک دواتر ئەو نوێژە بگێریتەوە ، چونکە ئەرکی جیهاد لەوکاتە لە ئەرکی نوێژ مەزنترە ئەمەش بە پێی ئەو دەرەنجامانەی لەو حالەتە دەکەونەوە .

2-دیسان ئەگەر لە ژیانی میلەتێک ئەرکی بوژاندنەوەی ئابوری کەوتە سەرشانیان لەولاشەوە ئەرکی پاراستنی ئاین و خواوەند و چاکە و زانستە پیویستەکانی ئەم بوارە لە ئەستۆی ئەواندا بوو، ئەگەر ئابوری ببوژێنیتەوە دەبێ دەستبەرداری ئەرکەکانی تر بیت یا ئەوانی تر بەجێ بگەیەنیت پرسی ئابوریت پێ جێبەجێ ناکرێ ، حوکمی ئیسلام ئەوەیە کە دەستبەرداری چاکەو خواپەرستی وئاین نەبین بەلکو لە پاراستنی ئەو ئەرکە پیرۆزانە خوا پاداشتی چاک بونی باری ئابوری دەداتەوە و لەم حالەتە هیچ کام لە ئەرکەکانت لەدەست ناچن .

3-دیسام لەو حالەتەی کە پێویست دەکرێ کار بۆ بەرز راگرتنی ناوی خوای مەزن بکەیت، یا خۆت روبەروی کوشتن بکەیتەوەو خەلکیش بەهۆیەوە توشی هەلاکەت وکوشتن ببێ ، حوکمی ئیسلام دەڵی نابێ لە پیناو پاراستنی گیانتدا خۆت توشی کوفر و هەلاکەت بەکیت وسوکایەتی بە ناوی پیرۆزی خوا بکەیت و دونیاو قیامەتیش لەدەست خۆت بدەیت، لە پێنا وبەرز راگرتنی ناوی خوا گیان بەخشین شەهادەتەو شەهیدیش شوێنی بەهەشتە ، چونکە ئەگەر توشی کوفر هاتی خوای مەزن بەدور نازاندرێ ئەو میللەتە توشی نەخۆشیەکی کوشندە بکا کە بەهۆیەوە سەرجەمیان بەکافری لەنا وبچن.

برگەی چوارەم/

کەمترین یا بچوکترین حەرام بکە بۆ ئەوەی لە مەزنترینیان دور کەویتەوە، ئەگەر هیچ چارەیەکت نەبوو خۆت لە کاری خەراپ وحەرام دورکەیتەوە، ئەوا بچوکترین حەرام ئەنجام بدە لە پێناو دورکەوتنەوە لە مەزنترینیان، لە کاتێکا ئەگەر نەتتوانی لە هەردوکیان دورکەویتەوە .
بەنمونە ئەگەر یەکێک هەرەشەی لێکرا یا دەبێ یەکێک بوکژێ ،یا دزیەک بکا ، لەم حالەتە دەبێ گوناهە بچوکەکە ئەنجام بدا کە دزیەکەیە بۆئەوەی خۆی لە کوشتن دەرباز بکا، چونکە تاوانی کوشتن مەزنترو کارەساتی مەزنیش بەدوای خۆیدا دێنێ ، ئەمە لە حالەتێکدا ئەگەر مەحال بوو لە هەردوکیان دورکەویتەوە .
هەروەها ئەگەر ژیانی بێگوناهێک کەوتە مەترسیی کوشتن لەدەست ستەمکارێک ،ئەمەش تەنها بە رێگەی درۆکردن دەتوانرێ رزگاری بکەیت لەم حالەتەدا ئەرکە شەرعەکە ئەوەیە درۆ بکەیت تا ئەم بێگوناهە لە مردن رزگار کەیت.
برگەی پێنجەم/

دەبێ بچیتە ژێر باری کەمترین زیان بۆ ئەوەی لە زیانێکی مەزنتر بپارێزرێیت،هەروەکو ئەوەی ئەندامێکی لەشت کەوتە ژێر کاریگەری نەخۆشیەک و ئازارەوە ئەگەر ئەم بەشەی ئەندامی لەش بە لێکردنەوە یا برین چارە نەکەیت ئەوا بەشەکانی تریش دەگرێتەوە ، لەم حالەتە هیچ گوناهێکت نایەتە سەر کە ئەندامێکی لەشت بەم هۆیەوە لێکەیتەوە، بۆئەوەی بەشەکانی تری ئەندامانی لەشت لە توشبون بپارێزیت ، ئەمەش ئاشکەرایە لەدەست دانی ئەندامێکی لەش باشترە لە لەدەست دانی دوان یا زیاتر.
هەروەها ئەگەر پاراستنی سەلامەتی میلەتەکەت بەند بوو بە برینی دەست یا بەشێکی تری ئەندامی لەشی گوناهبار یا تاوانبارەکان، ئەوا پاراستنی ئارامی میلەت باشترە لە برینی بەشێک لە جەستەی تاوانبار کە وەکو سزا ئەنجام دەدرێ و بە بریاری دادگای شەرع بریاری لەسەر دەدرێ .

برگەی شەشەم /

ئەگەر دوو ئەرک یا دوو حەرامکراوی یەکسان کەوتنە پێشت و بونە فەرز بەسەرتەوە بۆ ئەنجام دانیان ، خۆپاراستن لێیان بەهیچ رێگایەک نەدەکرا،

دەبوایە یەکێکیان ئەنجام بدەیت ، ئەوا موسلمانەکە دەتوانێ بە هەوەستی خۆی یەکیکیان دەستبژێر کا ئەگەر ئەو بژاردەیە لای خۆی خۆشتریش بێ گوناهی ناکوێتە سەر ، بەلام لەمەیان زاناکان هەندێک جار کۆک نین لەسەر یەک را بەنمونە لەسەر پرسی زینا کردن ، هەروەها لە کەسێکەوە بۆ کەسێکی تر دەگۆردرێت ، لەوانە راگەیاندنی کوفر . بەنمونە ئەگەر کەسەکە خۆی یەکێک بوو لەوانەی کفر دەکەن دەتوانێ لە پێناو رزگار کردنی خۆی ئەو کوفرە بکا بەمەرجێک لە دلەوە نەبێو دلی بە ئیمانداری بمینێتەوە ، دەشتوانێ دان بە خۆیدا بگرێو بە شەهیدی سەربنێتەوە چونکە مانەوەی لەسەر راستی سود بە بانگەشە ئیسلام دەگەیەنێ ، بەهۆی ەئوەوە خەلکانێک لە ریزی کوفر دەردێنو لە ریزی موسلمانەکانیش زیاتر ئیمانیان بە خواو ئیسلام پتەو دەبێ .
هەروەها سەرکردەکانی بانگخوازانی ئیسلام وخواپەرستی ، ئەوان دەبێ لە خەلکانی تر پابەندی بەرز راگرتنی ناوی پیرۆزی خواو راگەیاندنە راستیەکان بن، تەنانەت ئەگەر لەم پێناوە سەریش بنێنەوە و شەهدی بن ، بۆ ئەوان ئەم رێگایە باشترە .
بۆ نێردەو پێغەمبەرەکان جائیز و رێگە پێدراو نیە بەهیچ شێوەیەک کوفر بەسەر زمانیاندا بێت..
ئەگەر لە دۆخێکدا یەکیک تەنها خۆی بینیەوە لەو ناوە تاقە موسلمان بوو، مانەوەشی بۆ ئیسلام سودی لە کەسانی تر زیاتر بوو و کاریگەری ئەو زیاتربوو لەسەر دوژمانی خوا ، لە بواری رکابەری ودوژمنایەتی کردنی لەگەل یاندا ، لەم حالەتە بۆ ئەوکەسە بەسەرزماندا هاتنی ووشەی کوفر ئەگەر لە دڵەوە نەبێ ودڵی بە برواداری خوا جۆشدرابێ ئەوا گوناهەکەی بۆ ناگەرێتەوە و جائیزە.

تەرازوی دیاری کردنی ئاستی قەدەغەکراوەکان یا دژەکان:
تەرازوی ئیسلام بۆ دیاری کردنی ئاستی ئەرک وقەدەغەکان و جۆرەکانی زیان تەرازوێکی وورده پشت بە دوو بنەما دەبەستێ :

**بنەمای یەکەم/**
پۆلینکردنێکی گشتیی هەیە بۆ حەزو ئارەزوو خۆشیەکان و بەرژەوەندیەکانی تاک و کۆمەل و مرۆڤایەتی وئاینی ودونیایی مادی و مەعنەوی ، لەکاتێکا ئەمانە کاریگەریان لەسەر لایەنی ئاینیی مەزن هەیە وەکو برواداری بەخوا وکتێب

وپەیامە پیرۆزەکە و رۆژی قیامەت ، ئەمانە لە بەری پێشەوەن  چونکە یەکەم مافەکانی خوا لەسەر مرۆڤ ئەم پرسانەن.

**بنەمای دووەم/**

پۆلینکردنەکانی گشتیی زیان ونابەجێ وژان و گەندەلیە کانی تاک و کۆمەل و مرۆڤایەتی و ئاینی ودونیایی و مادی و مەعنەوی دەگرێتەوە، لە کاتێکا ئەمان کاریگەریان لەسەر پرسە مەزنەکانی ئاین هەیە وەکو : شەریک بینینەوە بۆ خوا، یا نکۆڵی کردن لە بونی خوا ، ئەمان لە خانەی پێشەوەی گوناهەکانن، چونکە بە دوژمنی سەرسەختی خوا دەناسرێن و زیادەرۆییان لەسەر مافەکانی خوا کردوە .

لە نێوان دەقێکەوە  بۆ دەقێکی تر، ناکۆکی هەیە ئەگەر جادە پشتی لەم جۆرە حوکمانە کرد کە زیانیان بۆ ئاین هەیە ئەوا رەوشەکە بە ئاسایی دەروا ، ئەگەر ئەمەی نەکرد جادە ئەوا پیاوە ئاینیەکان کە ئەرکی ئەوانە لەم پرسە بدوێن دەبێ حوکمی خۆیان بدەن کە حوکمی قورئان وشەرعە.جا لەم حوکمانەش هەندێک جار یەکنەگرتنەوە هەیە یا هەوەست وراو بۆجونی جیا دروست دەبن یا میزجی کەسی دەور دەبینێ.

ئا بەم شێوەیە ئیسلام لە لوتکەی  چاودێری و رەچاوکردنی راستی ودادپەروەری و چاکە وخێر وئەرکەکاندایە ، بەلام دەبینین کە مکیافیللی چۆن لە دەریای خەیال و گۆرەپانێک دا دەخولێتەوە بەدوای شێوازی سیاسەت وعەسکەرتاری، لەم روانگەیەوە مرۆڤ دەتوانێ بۆ هەلسەنگاندنی بۆچونەکانی مکیافیللی پەند لەم سورەتەی (التین) وەرگرێ کە دەفەرموێ  ( ثم رددناه اسفل سافلی) .

هەلوێستی ئیسلامیش لەسەر جیا کردنەوەی سیاسەت لە دەولەت بریتیە لە  ، خۆی ئیسلام لەسەر بنەمایەک  و لە هەل ومەرجێکدا دامەزراو بانگەشەی بۆ بلاو بونەوەی کرد، کە بە تەنگترین و ناخۆشترین وهەستیار ترین دۆخ دەزاندرێ ، مەبەستی سیاسەت ئەوەیە ئاین و  ئارامی بۆ کۆمەلگاکەی دابین بکاو و سنورەکانی بپارێزێ و بەرگریان لێ باک و دادپەروەری بەرقەرار بکا ، لەسەر ئاستی گەلانیش، تەبایی ویەکسانی وبرایەتی دابین بکا وبەرپەرچی هێزی نارەوا بداتەوە ، لە سەرئاستی نێو دەولەتیش سیاسەتی ئیسلام خۆی لە بلاوکردنەوەی ئاینی ئیسلام و بانگەشە و هاوکاری موسلامان ومرۆڤەکان بکا لەسەر بنەمای چاکەو بەرژەوەندی هاوبەش  و نەهێشتنی جیاوازیەکانی نێوان گەلان وبەرقەرار کوردنی ئاشتی وئارامی ودۆستایەتی.

ئەوموسلمانە سیاسەتمەدارەی ئەم بەهرەیەی هەیە، دەبێ لە رەفتارەکانی ئەوە رەنگبداتەوە کەهەڵگری ئەو سیاسەتەیە کە لە سەرەوە ئاماژەمان پێیداوە، لە پێش هەمویان خاوەنی تواناو زیرەکیەک بێ بتوانێ کاروبارەکانی پێ بەرێوە ببا و هەڵگری زانستێک بێ سود وبەهرەکانی بۆ ئەم کارەی بگەرێنەوە ، هەڵگری خەسلەتەکانی چاکەو خێرو ئازایەتی بێ، کەسێکی خاکی بێت ، خاوەن سەبرو چاکە بێت، هەڵگری دیاردە جوانەکان بێ وەکو وەفاداری وگیانی لێبوردەیی چاوپۆشین لە هەڵەی خەڵک و لە دڵەوە نیاز پاک و خاوەن دەرون وهەستێکی بێگەرد بێ .

بە کورتی سیاسەتی ئیسلامی سیاسەتی بروادارانە، لەسەر بنەمای مرۆیی وچاکە، دەبێ نە لە ئاین نە لە رەوشت جیا نەبێتەوە، لەو کەسانە بێ کە بروایان بە دروشمی ( مەبەست پاساو نیە بۆ رەفتار) هەیە .

**لەنێوان مکیافیللی وکلیلەو دمنەدا**

**-----------------------------**

لێکۆلەرەوەیەکی لوبنانیی بەناوبانگ، لە کتێبێکی نوێیدا کە لە بەیروت دەریکردوە، جیاوازیە فکریەکانی نێوان هزری سیاسیی کلیلەو دمنە لەگەل

زانیاریەکانی هزری سیاسیی بیرمەندی بەنابانگی ئیتالی مکیافیللیی خاوەنی کتێبی(میر) دەست نیشان دەکا .
لێرەش پرسیار ئەوەیە : ئایا مکیافیللی کاتابی کلیلەو دمنەی خوێندۆتەوە کە وەرگێردراوەتە سەر چەندین زمانی ئەوروپی لە سەدەکانی ناوەراست؟ یا ئەو نامە گۆرینەوەی نێوان عبدالله ی کوری مقفع و مکیافیللی ئەنجام دراوە بە هەلکەوت هاتۆتە پێشی و بینیویەتی ؟ .
موستەفا سبیتیی توێژەر لە کتێبەکەیدا ( ریشەکانی مکیافیللی لە کلیلەو دمنە ) کە لە (دار الفارابی) دەرکراوە دەڵێ:
مکیافیللی لاتینی وگریکی و فەرەنسی وئەلمانی وئیتالیی دەزانی ، ئەمەش بۆتە مایەی ئەوەی ببێتە دبلۆماتکارێکی رەوشەنبیر و پیاوی دەولەت کە شارەزایی لە بوارەکانی وەرگێرانی ئەو زمانانەدا هەبێ کە بۆ ئیتالیا وەرگێردراون ، کتێبی کلیلەو دمنەش لە سەروی ئەو کتێبە وەرگێردراوانەیە.
نوسەر لە درێژەی نوسینەکانیدا ئاماژە بە گەلێک نمونەو ئامۆژگاریەکانی مکیافیللی دەدا کە بە میری داوە ، تا ببێتە هەلگری ناسنامەی شێروئەقلی گورگ، وا پێدەچێ لە روانگەی شێرو کەلەگا وەرگیراون ، ئەم دەرگایەش مەزنترین دەرگاکانی کلیلەو دمنەن ، لەو کتێبە سیاسەت لە نێوان شێر ورێوی دەخولێتەوە ، هەروەها ناونیشان یا دەستەواژەی ( مەبەست پاساوی رەفتارە) کە مکیافیللی ناوبانگی پێ دەرکرد ، بە شێوەی جیا گەلێک جار لە کتێبی کلیلەو دمنە هاتوە ، هەروەها ئەو بنەمایەی کە مکیافیللی پشتی پێ بەستوەو بۆتە نەهجی دەربرینەکانی ئەمەشیان لەو کتێبە بەدی دەکرێ ، دواتر هێنانی نمونە لە گفتوگۆ ودیالۆگەکان دیسان شێوازێکی لەیەک چوە لەگەل کلیلەو دمنە ، وێرای هەندێک شێوازی نوسین ، ئەمانە هەمووی ئەو شێوازە لەیەکچوانەن کە کلیلە دمنە لەگەل بۆچون و نوسینەکانی مکیافیللی یەکدەگرنەوە .
دواتر گەلێک برگەو دەقی لەیەکچو هەن و بەدی دەکرێن ، هەمویان ئەوە دەسەلمێنن کە مکیافیللی کتێبی کلیلەو دمنەی خوێندۆتەوە ، دیسان هەندێک گوتەو قسەی نەستەقی تریش لە کتێبی کلیلەو دمنەدان بونەتە سەر ناونیشانی نوسینەکانی مکیافیللی ، ئەم لەیەکچونانە هەندێک جار دەگەنە ئاستی وەرگێرانی پیشەیی، کە گومان دەکرێ دەقەکە وەرگێردرابێت ، ئەمانە هەستێک لای خوێنەر دروست دەکەن کە بەدوای ریشەو رەچەلەکی بیردۆزەکانی مکیافیللیدا بچێ ، نمونەی زیاتریش هەن .
مکیافیللی دەڵێ:

(نابێ پۆستی بالا بەوکەسانە بسپێردرێ کە پێشتر جارێک خەراپەیان دژی کردوە).
کلیلەو دمنەش لەم روەوە دەڵێ:
(نابێ میر ئەوکەسانە لەخۆی نزیککاتەوە کە پێشتر بەهۆی خەراپەکاریەوە سزای دراون).
دیسان مکیافیللی دەڵێ:
(من ناڵێم هێزی سەربازی بەکار نەیەت ، من دەڵێم پاش ئەوەی هەموو رێگاکان لە ئەنجامدانی کاری چاکە شکست دەهێنن، با هێزی سەربازی ببێتە هۆکارو ئامرازی خێرو یەکلاکەرەوە).
کلیلەو دمنەش لەم روەوە دەڵێ:
(کەسی ئاقلمەند دەبێ رێگەی شەر وجەنگ بکاتە دوا رێگەی چارەسەری )،
کتێبی توێژەری لوبنانی بۆ مەبەستی گەلێک شت نوسراوە ، لە پێش هەمویان کتێبی کلیلەو دمنە وێستگەیەکی گرنگی گۆرانکاریەکانی هزری سیاسیە ، ئەمە رای نوسەر خۆیەتی کە لە دوایینەکانی کتێبەکەیدا دەری بریوە ، لەوێ بانگی (بیدبای شاژبی دبشلیم) دەکا و ناوەرۆکی کتێبەکەی ئاراستە دەکا دەڵێ:
(ئەی پادشا بەلکو هەموو خەون و ئاواتە و زانستیەکان بەهۆی تۆوە دێنەدی؟ ئەقل و گوتارو نیازپاکیت لێ کەم نیە ، لە گوتەکانت نە شەرم نە کەم و کوری نیە، توندی وخاویت لە خۆ کۆکردۆتەوە لە چاوپێکەوتندا لەگەلت کەس ترسنۆک نیە، و لەگەڵتا کەس تەنگە نەفەس نابێ ، لەم کتێبەمدا هەموو زانیاریەکم لەسەرتۆ نوسیوە و ئاماژەم پێیداوە، وەلامی هەموو پرسیارەکانی تۆم داوەتەوە، هەولم داوە هەموو ئامۆژگاریەکانم بۆ جەنابتان ئاماژە پێبدەم راو بۆچونەکانم لەسەرت بنوسم ، هەروەکو پێم ووتی ئەوەی هەمە لەسەر ئێوە لە خەسلەت وپێناسەو ئامۆژگاری باسم کردوە .
لەم گوتەیە بە رونی مەبەستی کلیلەو دمنە دیاردەکەوێ ، ئەویش ئامۆژگاریی حوکمرانەکان و باسکردنی هەموو ئەو پرسانەی پەیوەندیان بە حوکمرانیەوە هەیە ، ئەوانەی رۆژانە روبەرویان دەبنەوە لە کێشەو پرسە گرنگەکانی رۆژ وچارەنوس و پرسە ناوەخۆو دەرەکیەکان ، لێرە ئەوەی بەباش دەزانم ئاماژەی پێبدەم ئەو گالتە پێکردنەیە لە دیاری کردنی بەرنامە و سیاسەتی بەرێوە بردنی دەولەت کە لەم کتێبەدا هاتوە ، هەروەها ئەرک وفەرمانی سیاسیی دەولەت دیاری دەکا، ئەمیش لە رێگەی دوو ناونیشانی دوو بەشی کتێبەکە باس لێوە دەکا.

لە یەکێکیان پادشا لەسەر پرسی سیاسی پرسیار لە فەیلەسوفەکەی دەکا و لەو بەشە وەلامەکەی دەدرێتەوە ، لە میانی درێژەی نوسینەکانی بەشەکەو لە کۆتاییەکانی فەیلەسوفەکە ئەوەی دەنوسێ دەڵێ ئەمە ئەو دەقەیە کە پادشا لێی پرسیوم ، دواتر وەلامەکە دەنوسێ کە تیایدا حیکمەت وژیری خۆی بەدەردەخا.
سەبارەت بە پێشەکیەکەی کتێبیش کە هی علی کوری شای فارسی یە ، لەوێ بە راشکاوی باس لە دۆخ و رەوشی خۆی دەکا ، دەڵێ (دبشلیم بیدبا) داوای لێکردم کە کتێبێک دابنیم تیایدا هەموو ئەقلی خۆمی لێ خاڵی بکەم ، وەکو دیاردەیەکی سیاسیی گشتی و پەروەردەیی بێ ، لە ژێرەوەش رەوشتی پادشاو سیاسەتەکانی بێ بەرانبەر بە هاولاتیانی تا دەگەیەنێ تا بەچاکی لە خزمەت و ژێر فەرمانەکانیدا بن .
لە کتێبی کلیلەو دەمنە هیچ ووشەیەک نەهاتۆتەدەر روبەروی دەولەت کرابێتەوە ، ئەمەش بە پێچەوانەی هەموو ئەو گوتارانەیە کە لەو کتێبە هاتوە ، شێوازی گفتوگۆی نوێش لەگەڵ هاولاتیە ئاساییەکان، لەگەل ئەو بەرنامەیە دێت کە گێرانەوەی چیرۆکن ، بە پشتبەستن بەو شێوازەی خۆی کە ووشەی نهێنیی و زۆری دەستەواژەو کورت و پر مانایی لە رستەکاندا بەکار هێناوە،( ئقلەکە ، یا ئاقلمەند ، پیاو ،سولتان ، دەسەلاتدار، والی، خاوەن دەسەلات،) و چەندین دەستەواژەی لەم بابەتە ، لە گوتارەکان بەم شێوە ناوی دەولەت دەبا ، بۆخوێنەر هەندێک جار ئەمە شاشیە، چونکە ئەو لە گەرمەی خوێندنداو چونە ناو بابەتەکانەوە ئەم دەستەواژەی دەکەوێتە بەرچاو دەبێ نەختێک هەلوەستەیەک بکا تا دێتەوە بیری ، بەم شێوەیە هزرەکانی بۆ لایەکی تر دەرۆن و لە جەوهەری ەاستیەکان دور دەکەونەوە، ئەمەش دەبێتە بەرجەستە کردنی دەولەت و رێکخراوەکانە، یا بە یەک ووتە بڵێین بەرجەستەکردنی گشتیی کەسایەتیە ، بەم هۆیەوە بیدبا لە ووتەکانی سەرەوەیدا کە ئاماژەی پێداوە لە جیاوازی نێوان روکەشی کتێبەکە کە سیاسەتی گشتییەو ناوەرۆکی کە ئامۆژگاریی حاکمەکانە رون دەکاتەوە .
وەنەبێ مکیافیللی لەم رێبازە دەرچوبێ ، سەرەرای هێنانەوەی نمونەی زۆر لەسەر کەسە ئاساییەکان بەلام مکیافیللی ئەوەی لە کتێبی (میر) دا نوسیویەتی و نوسینەکانی تریشی وئەوەی بانگەشەی بۆ دەکا هەمووی مەبەستی دەولەتە.
حیکمەتی دەرهاوێشتەی رەفتارەکانی ئەوەیە، تیشکی خستۆتە سەر کاروانی میر ، هەروەها لە نوسینەکانی هەمان ئەو دەستەواژانەی بەکار هێناوە کە لە کلیلەو دمنەدا هاتون وەکو ئاماژەی دەولەت بە ئاقل وپیاوەکەو میر و حاکم و

سولتان و دەسەلاتدار ناوی هێناوە ، بەلام مكیافیللی لە نمایشەكانی راشكاو و ورون بوە ، هەركاتەی هەستی بەوە كردبێ ئاراستەو ئاماژەكان لای خوێنەر شاش دەبن ناوی كۆماری میرنشین یا پادشانشین وئیمپراتۆریەتی هێناوە بە ناوی شارەكانەوە .
لەژێر روانگەی ئەم كورتە باسە دا ، دەتوانین لەمەبەستی كلیلەو دمنە بگەین كاتێك باس لە دۆست و دوژمن ، قەرس و دەستكراوە، ئازاو ترسنۆك، راراو باوەربەخۆ، مەبستی بواری سیاسەتی دەولەتە ، نەك رەفتاری تاك.
چیرۆكەكانی كلیلەو دمنە سەرچاوەیان لە خەیالەكانی بیدباوە گرتوە ، وەكو پالەوانێكی گیان لەبەر، بەلام خۆی كەسایەتیەكی گونجاو بووە.
لە پەیوەندیە كۆمەلایەتیەكانیشدا ، هەر گفیانلەبەرێكی بەنمونە بۆ توێژێك هێناوە كە بەهۆیەوە باس لەو توێژە بكاو رەفتار وشێوازەكانیان رونبكاتەوە لەكاتی روبەرو بونەوەیان لەگەل بەرژەوەندیەكانی ، بەنمونە شێر ، لوتكەی دەسەلاتە، پلینگ خاوەنەكەیە،وەزیر وەدادوەر ئەوانیش ئەوكەسانەن كە هەردەم لە ململانیدان لەگەل ژیانا بۆ وەدەست هێنانی زیاتری پلەو پایەكان لە ناو كۆمەلگاو دەسەلاتدا ، فیل خاوەن پێچ وپەناكەیە وەكو لوتی ،سەگیش توێژێكی گوێرایەلە ، جورج نوێنەرایەتی چینی رۆشنبیر وزیرەكەكان دەكا ، كلیلەو دمنە كەسایەتیەكانی بە پێی پێویست لە هەر بۆنەیەك وەرگرتوە .
رەخنە گرەكان وێرای چەند ناكۆكیەك ،لەسەر ئەوە یەك بون كە ئیبن موقفع بە كلیلەو دمنە چەند سودی گەیاندوە.
بەلام مكیافیللی پشتی بە نمونەكانی مێژوی ئیتالیا بەستبوو ، بۆیە بە رونی ناوەكانی دەهێنا ، بێئەوەی نازناو یا ناوێكی نهێنی لە جیات بەكار بێنێ ، لەگەل خۆی كەوتە گفتوگۆ ونمونە هێنان ، بۆ هەر بۆچونێك نمونەیەكی دەهێنایەوە وەكو پالپشتی بۆچونەكانی ، نمونەش لای مكیافیللی بریتیە لە روداوێكی سادەی لاوەكی كە پالپشتی بابەتەكەی بكا و بۆچونەكەی پێ بەهێز بێ ، بەلام نمونەهێنان لای كلیلەو دمنە دیاردەی چیرۆكێكە دەبێ پێداگری لە سەرتاپای ئەو چیرۆكە بكا، ئەم نمونانە زۆر دەسەواژە و پەندی سیاسی لەخۆ دەگرن كە گرنگی ئەو دەستەواژانە لە ناونیشانی ئەوبەشە كەمتر نەبن .
لە هەردوو بیردۆزەكانی مكیافیللی وكلیلە و دمنە دا ئەم دەستەواژە پەسند كراوە كە دەلێ : (مرۆڤ بە سروشتی خۆی مەیلی فتنەو دوزمانیی هەیە ) ، ئەمە رای هەردوكیانە لەسەر مرۆڤ و تێروانینەكانی ، لەگەڵ ئەوەی هەردوو كتێب بروایان بە خۆدانە دەستە بە قەزاو قەدەر ، هەردوكیان دەلێن نابێ مرۆڤ بە

هەرمەکی خۆی بخزێنێتە ناو کارەکانەوە ، بەڵکو دەبێ بە وشیاری وئاقلانەو خۆپارێزی لە هەموو کارێکی مەترسیدار و بە بەرنامەوە کارەکە ئەنجام بدا تا لە بەرژەوەندی ئەودا تەواو بن ، لە هەردوو کتێبدا نمونەی زۆر هاتون ، دەڵێ: بەخت وەکو ژن وایە ئەگەر بتەوێ بەسەریدا زاڵ بی دەبێ بەهێزو تەوژمەوە دەستدرێژیی بکەیتەسەری.

لە لاپەرەکانی کتێبی لوبنانیەکە دا بەراوردکاریەکی تر هەیە لەسەر هەندێک هزری لەیەکچوو کۆپیی کراوی یەکترلە نێوان مکیافیللی و کلیلەو دمنە دا ، بە پێوەرێکی وردی زیرەکانە نوسەری کلیلەو دمنە هەندێک هاوبەشیی لە نێوان هەردوو کتێبەکەدا دۆزیوەتەوە، لەو روانگەیەوە ئاشکەرای دەکا دەڵێ: مکیافیللی کۆنە و جارێکیان لە سەردەمی عەباسیەکان بینراوە ، لە کتێبێک دەڵێن : ئیبن مقفع لە هندی یا فارسی یا عەرەبیی وەرگێراوە .

**مکیافیللی و تەرتوش**

**--------------------**

دەوترێ کە هزروانی ئیتالی ئەم هزرانەی لە کتێبی ( سیراج الملوک) ی ئیبن ئەبیرندقەی تەرتوش وەرگرتوە ، دەڵێن هەندێک بەش هەن لە کتێبی میر، زۆر بە کتێبەکەی تەرتوش دەچن،وەکو ئەوەی دەقاودەق لەو کتێبەکەی تەرتوش وەرگیرابن .

**کەوابێ تەرتوش کێیە؟**

**----------------------**

تەرتوش لە پیاوەکانی سەدەی دوازدەهەمە ، خوێندکاری ئیبن حزم ی گەورەزانای ئەندەلوسە، لە ئەسکەندەریە ژیاوە کە خاوەنی قوتابخانەیەکی مەزن بوە لەوێ ، کتێبی هونەری سیاسەت ودەسەلات ی نوسیوەتەوە ، تیایدا شیکردنەوەی بۆ دەسەڵاتدارو هاولاتی کردوە ، بەیەک ساڵ ئەم کتێبەی تەواو کردوە ، ناوی نا ( سیراج الملوک )و لەساڵی 1122 بردیە قاهیرە تا پێشکەشی بکا بە (مامون البطائحی ) ی وەزیری فاتمیی نوێ .
کتێبی (سراج الملوک ) شەست و چوار بەش لەخۆ دەگرێ ، باس لە سیاسەتی پادشا وهونەری حوکمران و کاروباری هاولاتیان دەکا ، لەو کتێبە باس لەو خوو رەوشت ورەفتارانەی پادشا دەکا کە لەسەری بەردەوامە ، لەوانە ئەو کردارە باشانەی کە توانیی ئەنجامیان بدا ، هەروەها ئەو رەفتارانەی کە دەکرێ بەهۆیەوە رەخنە لە پاشا بگیرێ واتە کارە نابەجێکان ، لە حالەتێکا ئەگەر پادشا رەفتارێکی نابەجێی کرد چین ئەو حالەتانەی هاولاتی دەتوانێ بەهۆیەوە رەخنە لە پادشا بگرێ ؟، دیسان باس لە هاوەڵ و هەلوێستەکانی لەگەل سەربازەکان و حالەتەکانی رێگەپێدراو بە کۆکردنەوەی باج و چەندینبابەتی تری رۆژ دەکا .
تەرتوش لە کتێبەکەی هەروها باس لە رەفتارو خەسلەتی وەزیرەکان دەکا لەگەل تیشک خستنە سەر ئامۆژگاری و راسپاردەکانی پادشا و هەلوێستی پادشا بەرانبەر بە باج و سامانەکانی دەولەت . سەبارەت بە سیاسەتی پادشا لەسەر کارو ئەرکەکانی بەرانبەر بە شار و هاولاتیان و حوکمەکانیان لەم کتێبەیدا بەوردی باسیان لێوە دەکا، جگەلەمەش کاروباری جەنگ و پێداویستیەکانی بەشێک دەبن کە تیشکیان دەخاتە سەر .
ئیبن خەلدون لە پێشەکیی کتێبەکەدا باسی ئەم کتێبە دەکاو ستیاشی دەکا .

هزرو بیرەکانی لەسەر سیاسەت وێرای هەندێک لەیەک چون  کە هەردوکیان باس لە (سولتان،میر) دەکەن بەلام گەلێک جیاوازن لەگەڵ هزر و بیری مکیافیللی، ئامۆژگاری یەکێکیان بۆ سولتان جیاوازە لەگەل ئامۆژگاریی ئەویتریان بۆ میر، لەکاتێکا مکیافیللی لە کتێبی میر ئامۆژگاریی میردەکا کە بە هێز و فرت وفێل و ساختەکاری و چەواشەکاری ، بەسەر خەلکدا زاڵ بێ و پێیدەڵی :

(ئەوانەی روبەروت دەبنەوە لە رەگ و ریشە هەڵیان کەنە و لەناویان بەرە )، بەلام تەرتوش لە کتێبێ (سیراج الملوک)(چرای پادشا) دەڵێ:

جەستەیەکی بێسە( ئەگەرئاماژەو قسەکانی پادشا بۆ چاکسازی میلەت بۆ بەهێز بونی ئاینییان و بەرەو کاری باشی بردن بوو ، بەلام رەفتارەکانی خۆی خەراپ ودور لە رەوشت بون ئەمە وەکو کارکردنە بۆ مانەوەی ر ، یا مانەوەی جەستەیەکی بێ رۆح .

لەم روەوە زانا هندیەکان دەڵێن:

(هەزار کەس ناتوانن تەنها بە ووتە تاقە کەسێک بهێننە سەر رێگای راست ئەگەر خۆیان رەفتاریان باش نەبوو ، هەروەها یەک تاقەکەس بە رەفتاری باش دەتوانێ هەزار کەس بهێنێتە سەر رێگای راست بێ ئەوەی یەک دانە ووشەش لە دەمیا بێتەدەر).

ئەمە لە کاتێکایە کە مکیافیللی دەڵێ:

( ئەگەر خەلک بە خۆرسکی نەهاتە ژێربار ئەوا دەبێ بەهێز بیهێنیتە ژێربار)، تەرتوش بە وەزیری فاتمیی لە میسر دەڵێ:

(ئەوە بزانە ئەو پادشایەتیەی  ئەمرۆ بۆتە هی تۆ،  لە ئەنجامی مردنی پادشایەکی ترەوە بوە ،ئەمەش بە هەوەستی خۆی نەبوو کە ئەمە روبدا ، ئەمەش بزانە کە بێ هەوەست ورازی بونی تۆ، ئەم پادشایەتیە لەدەستت دەردەچێ و یەکیکی تر شوێنت دەگرێتەوە ، بۆیە پشت بەخوا ببەستە چاوت لەو کەسانە بێ کە بەدەورتەوەن  چونکە ئەوان چاویان لەدەستی تۆیەو خواش تۆ باش دەبینێ چونکە لە بەرانبەر خوا تۆ لە هەموو وورد و درشتێکی ئەم وولاتە بەرپرسیاری ، خوا دەفەرموێ :

(ئەوە خواکەتە کە لە هەموو شتێک لێت دەپرسێتەوە ..)

لەوکاتەی مکیافیللی خوازیاری ئاژاوەو دوبەرەکی دەبێ بۆ دوژمنە سەرسەختەکانی، تەرتوش فەتوا دەردەکا بە حەرام کردنی ئەو پەنیرەی لە

رۆمەوە بۆ شار دێت ، واتە گەمارۆی ئابوریان دەخاتە سەرو قەدەغەی کرینی کەل وپەلیان دەکا.
ئابەم شێوەیە جیاوازی هەیە لە نێوان ئەو فەرمانانەی ئەمیرە موسلمانەکان دەریدەکەن، لەگەل ئەوەی میرە ناموسلمانەکان لە رۆژئاوا دەریدەکەن .
ئەو هزرمەندە موسلمانانە ئەوانەی لەسەر ئەوە رێککەوتبون کە بیردۆزە سیاسیەکان لە نێو ئیسلام ریشەکێش بکەن ، ئەو پرۆسەیەش بە ( سیاسەتی شەرعی) ناو بنێن، بریتی بوو بەو سیاسەتەی بەرژەوەندیەکانی هاولاتیان وخواو وولات دەستەبەر دەکا کە لە بازنەی بەرژەوەندیە گشتیەکان دەرناچێ ئەمانیش ( بەرژەوەندیی نێردەن) بە پێچەوانەی بۆچونەکانی مکیافیللی کە دەڵێ نیفاق و دوبەرەکی بنەمای سیاسەتن و دەبێ سیاسەت لە کەلیسا جیابکرێتەوە.

## مکیافیللی و مۆسۆلینی
------------------

لەنێو کەلوپەلە کانی مۆسۆلینی یەکێک لە سەرسورهێنەرترین شت کە لە ناویان دۆزرایەوە ئەو دیاریە بەنرخە بوو کە لە گروپی کراس رەشانی فاشیستەکانەوە بۆی هاتبوو، ئەویش بریتی بوو لە شمشێرێک کە دەستنوسی مکیافیللیی لەسەر بوو ، دەڵێ:
(پاراستنی دەولەت تەنها بە قسە نابێ).
سەرەرای گەیشتنی ئەم دیاریە بە درەنگ وەختانێک ، بەلام لەوەوە بژاردەکانی مۆسسۆلینی ئاشکەرا دەبن ، لەو کاتەی گەنجێک دەبێ لە 1924 بریادەدا کە نامەی (ئەتروحە)کەی لەسەر کتێبەکەی (میر) ی مکیافیللی بێ. بە ماوەیەکی کەم وا هەلدەکەوێ، رێبەرایەتی ئیتالیا دەکا و بەرەو سەردەمێکی فاشیزمانەی دەبا ، لە دەستی راستیەوە کتێبەکەی میر دەبێ وهزرو بۆچونەکانیشی هەلدەگرێ و پیادەیان دەکا تا بەم شێوەیە ولات بەرەو ئەو هەڵدێرە دەبا کە بردی .
مۆسۆلینی لە ئەتروحەکەیدا جەختی لەسەر سێ خاڵ کردۆتەوە :

یەکەمیان/ تێگەیشتنی مکیافیللی بۆ سروشتی ئادەمیزاد.
دوەمیان/ هەلوێستی لە سیستەمی پادشایەتی .
سێهەمیان/ پەیوەندیەکانی هزر بە هێز و سروشتی مرۆڤایەتی.
بە گوێرەی تێگەیشتنی مۆسۆلینی لە هزرەکانی مکیافیللی مرۆڤ لای ئەو کەسێکی پیس وناپەسندە، هەردەم کار بۆ بەرژەوەندیەکانی خۆی دەکا ،ئامادەشن بە خێرایی بروسک حەز وئارەزوەکانی خۆیان بەپێی بەرژەوەندیەکان بگۆرن ، بۆیە دەبینین کاتێک یەکێک سامانێک لەدەست دەدا بە رادەبەدەر دەتۆرێ و دڵتەنگ وتورە دەبێ ، دڵتەنگ بون لەسەر سامان و سەروەت گەلێک لە دلتەنگی لەسەر دایک و باوک مەزنترە لای ئەوان ، چونکە مردوو لەبیر دەکرێ بەلام سامان وسەروەت هەرگیز لەبەر چاویان ناچێ.
لەم تەوەرە ئەو فکرەی مکیافیللی وەرگیراوە و دواتر پەرەی پێدراوە، کاتێک دەگوترێ پێغەمبەرە چەکدارەکان سەردەکەون و پێغەمبەرە بێچەکەکانیش ژێردەکەون ، چونکە سروشتی مرۆڤ راراو نا سەقامگیرە ، زۆر ئاسانە لەسەر کارێکیان رابێنین یا لە کارێکیان دور خەینەوە ، بەلام ئەستەمە بتوانین بۆ ماوەیەکی دورو درێژ لەسەر یەک بروا بیان هێنلینەوە، ئەگەر هەرەشەی هێز وترساندنیان لێ نەکەین.
بەگوتەی مۆسۆلینی ، چونکە مکیافیلليش کەسێکی ناپاک بوو، ئەوپەری داهێنانەکانی لە بەشی پێنجەم دەردەخا، ئەم بەشەی باس لە چۆنیەتی نیشاندانی ناپاک و ئاژاوەگێران دەدا ، لە رێگەی بیردۆزەکانیەوە دەیسەلمێنێ بەجۆرێک شارەزاییەکی زۆری لەم بوارە هەیە کە هیچ نوسەرو سیاسەتمەدارێک ئەم شارەزاییە یان نیە.
لە بۆچونە گلاوەکانی مکیافیللی، دوای جیا کردنەوەی وەزیر و راوێژکارەکان ، وەکو ئەوەی وا نیشانی بدا کە ئەم دوو توێژە بونەتە بەربەستی نێوان پەیوەندیەکانی گەل و لوتکەی دەسەلاتی سیاسی.
مکیافیللی تێبینی ئەوەی لەو دەستەی حوکمرانانەی ئیتالیا کرد ، زۆربەی گەندەلیە سیاسیەکانی سەردەمی پادشاکان لە وەزیرەکانەوە سەرچاوەیان گرتبێ، چونکە ئەوان نە فەرمانبەری بچوکن گوێرایەلی بەرپرسەکانی خۆیان بن، نە لە لوتکەی دەسەلاتن کە بتوانن بەبێ پرس و لێپێچانەوە سیاسەتەکانیان بەسەر دەسەلاتدا بسەپێنن .

**ئەوانەی بەرگری لە مکیافیللی دەکەن**
**-------------------------------**

گەلێک لە نوسەران بەرپەرچی هێرشەکانی سەر مکیافیللی یان دایەوەو بەرگریان لێی کرد، بۆئەوەی ئەو وێنە ناشیرنەی ئیتالیا کە بە هەلپەرست وێنە کێشراوە لەبەرچاویان لابەرن ، یەکێک لەو نوسەرانە مێژوو نوسی عێراقی (د.کەمال مەزهەر) (مێژوو نوسێکی کوردە .و) کە ئەرکی گێرانەوەی ناوبانگە جوانەکەی ئیتالیای لە دونیای عەرەبی خستە ئەستۆ خۆی، ئەمەشی لە رێگەی ئەو کتێبەیدا پێی هەڵساوە کە بەناوی ( مکیافیللی ومکیافیللیزم) بلاو کردۆتەوە ، ئەو کتێبە لە فەرمانگەی کاروباری رۆشنبیری وبلاوکردنەوە دەرچوە لە بەغدا لە ساڵی 1984.

**دەسەلاتدارە مکیافیللیستەکان.**
**------------------------**

د.کەمال مەزهەر دەڵێ:
( دەسەلاتدارە مکیافیلیستەکان رۆلێکیان گێراوە کە مەترسیداری وخەتەرناکیی کەمتر نیە لە رۆلی (ئەلجزویت) بۆ ناشیرن کردنی ناوی مکیافیللی).
ئەوان ئەوەی بۆ خۆیان شیاو بوایە لە راو بۆچونەکانی مکیافیللی دەست بژێریان دەکرد بێ ئەوەی رەچاوی بارو دۆخی شوێن یا کاتی جێبەجێکردنەکە بکەن .
پادشای فەرەنسیی بەرەگەز ئیتالی (کاترین میدیتشی) کتێبی میر بە کتێبی پیرۆزی خۆی دەزانێ ، ئەمە بێئەوەی پابەندی ناوەرۆکی بێت، چونکە رەفتارو کردەوەکانی دەقاو دەق لەگەل بیرکردنەوەکانی مکیافیللی دێنەوە ، بۆیە بەراست زانینی فکرەکانی وهاندانی بەچاپ گەیاندن و بلاوکردنەوەی کتێبەکەی ، گوزارش لەوە دەدەن کە مکیافیللی لەو کردەوە ناشیرنانەی ئە وبەرپرسیارە

ورەنگدانەوەی لەسەر هەبوە ، بەنمونە ئەوکاتەی پرۆتستانتە فەرەنسیەکان لە 1572 لە (سان برثلومیو) لە یادێکی ئاینیی خۆیاندا ئاهەنگێک دەگێرن وسەرقالی بەزم ورابواردن دەبن ، ئەو ئەم ئاهەنگە بە کۆکوژیی ئاهەنگێران کۆتایی پێدێنیَ ، ئەمەش دەبێتە مایەی تورەبونی پرۆتستانتەکان لە مکیافیللی.
بە پێنج سال دوای ئەو کارەساتە ، (گاتییە) کتێبێک لەسەر مکیافیللی دەردەکاو رەخنە لە هزرو بیرەکانی دەگرێ و بەرپرسیارێتی ئەو کارەساتەش دەخاتە ئەستۆی مکیافیللی ، نەک هەر بەرپرسیارێتی ئەم کارەساتە بەلکو دەڵێ: بەرپرسیارێتی ئەنجام دانی هەر روداوێکی لەم شێوەیە لە لایەن پادشاکانی فەرەنسا ( هنریی دووەم ، شارل ی نۆیەم، هنریی سێیەم) مکیافیللی لێی بەرپرسیارە ، مکیافیللی دەبێتە یەکەم قوربانیی کاسۆلیک چونکە پرۆتستانتەکان بەرگریان لێی نەکرد بە مامۆستای کاسۆلیکەکانیان دەدایە قەڵەم .
فریدریکی مەزن پادشای بروسیا کە بەناوبانگترین پادشای مکیافیلیست دەبێ ، زۆر بە جۆشەوە دژی مکیافیللی جەنگی و بەر لەوەی بێتە سەر دەسەلات لە رێگەی نامەکانیەوە کە بۆ هزرمەندی فەرەنسی (ڤۆلتێر)ی ناردوە هێرشی زۆری کردۆتە سەر مکیافیللی ، ئەمەش یەکێک بوە لەو خەسلەتانەی پادشا ئەوروپیەکان کە خۆیان بە ناوبانگێکی باش وبێگەرد پەردە پۆش کەن و خۆیان دەمامک کەن بەشێوەیەک وا نیشان بدەن کە لەگەڵ ئەو چەرخ وسەردەمەدا دێنەوە ، دوای سالێک لە دەسەلات گرتنەدەست کتێبێک بەناوی (ئەنتی مکیافیلی) دەنوسێ تیایدا نیکۆلۆ بە بەرگریکاری تاوانەکان ناودەبا دەلێ:
( یەکێکە لە وانەی لە کردەوە لە شەیتانیان تێپەر کردوە ).
لە کتێبەکەیدا فردریک دەڵێ مکیافیللی دەیەوێ حکومەتێکی ستەمکارو زالم و توندو تیژ هەبێ و جەنگی نارەوا هەڵگیرسێنێ ، هەرچەندە مکیافیللی بە راستەوخۆ لە هیچ لە کتێبەکانی خۆیدا بانگەشەی ئەم بۆچونەی نەکردوە ، بەلام فردریک لە ماوەی دەسەلاتیدا کە چل و شەش سال حوکمرانی دەکا، گەلێک لە کاری لەم جۆرە خەراپتر ومالّ وێرانتر ئەنجام داوە ، وەکو یەکێک لە مێژوو نوسان لەسەر رەفتارەکانی گوتەیەک دەدا دەڵێ:
( لە رێگەی ئەم کارە خەراپانەیەوە ناوبانگی دەرکردوە ).
بە رادەیەک ستەمکار بوو کە وەزیری دانەدەمەزراند ، بە بیانوی ئەوەی موچەیان دەبێتە بارگرانی بەسەر دەولەتەوە ، (ئەمە بە گوتەی خۆی) ، بەلام بۆ خۆی و دەوروبەری هیچ کاتێک لەوە سلی نەدەکردەوە کە مەزنترین کۆشک بۆ خۆی یا بۆ دار ودەستەکانی دروست بکا ، لەوکاتەی لە هەموو نوسین و

کتێبەکانی نیکۆلۆ ستایش و پێداهەڵگوتنێک بۆ ئەم میرە نابینینەوە کە بە تاکرەوانە حوکمی دەکرد ، وەکو د. مەزهەریش دەڵێ: (تاکرەوی فردریک گەیشتبوە ئاستێک کە خۆی راستەوخۆ سەرپەرشتی سەرجەم رەهەندەکانی دەولەتی دەکرد) ، لەم کارەیدا ئەسپەوانەکەی هاوکاریی دەکرد ، بەیانیان نامەکانی بۆ دەخوێندنەوە ، بەیانیان زوو خۆی و باوەشێک لە نامەوە دەهاتە لای پادشا وئەم نامانەی دەخستنە بەرچاوو بۆی دەخوێندنەوە کە بەبێ ئەو کەس بۆی نەبوو وەلامیان بداتەوە .
ئەگەر مکیافیللی بانگەشەی ئەوەی کردبێ کە بایەخ بە سوپا بدرێ ، بەلام ئەوەی رانەسپاردوە کە میرەکەی لە بودجەی ولات بە رێژەی 80% بۆ بواری جەنگ وسوپا تەرخان بکا وەکو ئەوەی فردریک دەیکرد ، لە راستیشدا لەو لێدوانەی (ڤۆلتێر) جوانتر نابینین کە بۆ کتێبەکەی فردریکی ووتوە :
ئەگەر میرێکی مکیافیلیستم لەبەر دەست بوایە پێیم دەوت ، کتێبێک دژی مکیافیللی بنوسێ .
( مەبەستی ئەوەبوە کە ئەوانەی دژی مکیافیللی و کتێبەکەی(میر) دەنوسن مەبەستیان دژایەتی راو بۆچونەکانی نەی، بەلکو بۆ چەواشەکردنی ئەو خەلکەیە ، دیارە لێرە زیاتر مەبەستی پادشای بروسیایە (فردریکی مەزن) کە خۆی بە رەفتار مکیافللیستە وکتێبی ئەنتی مکیافیللیی داناوە .
هەرواش بوو فردریک ناوبانگی بەو کتێبە دەرکرد ، بەلکوو ئەمە دوا کەس بێت رێگەی پێبدرێ ناوی زاناکان بزرێنێ و لەبەر چاوی خەلکیان ناشیرن بکا.
دیارە ئینکاری ئەوە ناکرێ کە فردریک یەکێک بوو لەوانەی بەشداریان لە گەلالە کردنی بۆچونێکی هەلە کردوە لەسەر مێژونوسێکی مەزنی سەردەمی رێنسانس.

## لاسایی کردنەوە

------------

ئەو وێنە ناشیرنیەی بۆ مکیافیللی کێشرا ، بوە مایەی بەرپا کردنی هەڵمەتێکی جەماوەریی مەزن، دژی مکیافیللی ولاسایی کەرەوەکانی لە سەدەی شازدەهەم ، ئەم هەڵمەتەش ئەوەی لێ کەوتەوە کە نەوە بۆ نەوە ئەو وێنە ناشیرنیەی مکیافیللی لەیەک وەرگرن و ئەو کەسە لەبەر چاوی خوێنەرو خەڵک ناشیرن کەن ، ئەمە لە کاتێکا زۆربەی ئەوانەی دەستەواژەی مکیافیلیزم بەکار دێنن هێشتا کتێبەکەیان نەخویندۆتەوە ، ئەگەر خوێندبیتیانەوەش ئەوا بە سەرپێی چاوێکیان پێدا خشاندوە بێ ئەوەی بچنە ناو قولایی بۆچونەکانی ،چونکە کتێبەکانی و بەتایبەتی کتێبی(میر) پیویستیی بە خوێندنەوەیەکی ورد ولێکدانەوەیەکی واقعبینانەهەیە ، بۆئەوەی بە شێوەیەکی زانستیانە بەکاری بێنن نەک بۆ رێکلام و ناو زراندن، هەندێک لە نوسەرو مێژوو نوس هەن دەڵێن کە زیاتر لە جارێکیان کتێبی میر خوێندۆتەوە ، جاری یەکەم رقیان لێی بۆتەوە ، جاری دوەم بۆ هەڵسەنگاندن ولێکدانەوە بوە ، جاری سێیەم سودیان لە گوتەو بۆچونەکانی وەرگرتوە و راستی نیازەکانیان بۆ دەرکەوتوە .
لاسایی کردنەوەی کوێرانە وپشتگوێ خستنی رەها (وەکو د. مەزهەر دەڵێ) بۆ کتێبەکانی مکیافیللی، بونە بەربەست بۆئەوەی خەڵک لە نیازە راستەقینەکانی بگا و بچێتە قولایی ناوەرۆکی نوسینەکانی و بەدلسۆزی مامەڵەیان لەگەڵدا بکا .
ئەگەر مرۆڤ کتێبەکانی مکیافیللی بە وردی و بۆیەکەمجار بخوێنێتەوە بەتایبەتی کتێبی (گوتارەکان) ئەوکات بۆی دەردەکەوێ کە مکیافیللی لە بەرەی جەماوەربوە زیاتر لەوەی لە بەرەی پادشاو دەسەلاتدارە ستەمکارەکان بێ ، لەوکاتەی منداڵ بوە لە کەش و هەوایەکی کۆماری ژیاوە ، چ لە شەقامەکانی فلۆرەنسا یا ناو ماڵی خۆیدا ، باوک و باپیرەی لە وکەسانە بون کە بانگەشەی کۆماریان دەکرد ، دواتر بەدلسۆزی و ئومێدەوە خزمەتی کۆماری فلۆرەنسایان کرد، بە حکومەتی گەل ناویان دەبرد.
لە ئەزمونی مێژوی کۆنیان ئەوە فێربون کە هێزی روماو گەورەیی لە سیستەمی کۆماری دایە کە زۆرینەی خەڵک بەشداری لە حوکمرانیدا بکەن ، واتە حوکمرانی لەسەر بنەمای توانا نەک بۆماوە (ویراسی) کە بەهۆیەوە کەسی شیاو لە شوێنی شیاوو پێویست دادەنرێ ، بۆیە دەبینین مکیافیللی کاری بۆ ژیاندنەوەی ئەم سیستەم ورژێمەی کۆماری کردوە ، لەکاتێکا لە کتێبی (میر)

ئەمە بە پێچەوانە دەکرێ هەروەها لە (گوتارەکان)، تەنانەت (روسو) کتێبی میر بە کتێبی کۆماریخوازەکان دەناسێنێ.
بەلام مکیافیللی سەرکەوتنی سیستەمی کۆماریی بە وشیاری خەلکەوە بەستۆتەوە کە دەبێ لە ئاست ئەو بەرپرسیارێتیەو وشیاریە دابن ، پابەندی رەوشت وياساکان بن .
لە بارەی گەندەلی وگەندەلکارانیشەوە ، ئەوکات سەرتاپای ئەوروپای گرتبۆوە لە سەروی هەمویانەوە ئیتالیا ، مکیافیللی پێی وابو دەبێ دەسەلاتێکی رەها هەبێ بتوانێ سنور بۆ ئەم کارانە دابنێ وسزایەکی توندیان بەسەردا جێبەجێ بکا، بۆئەوەی رێگە لە خەراپەکاری و کاولکاری بگرێ و میللەت و نیشتمان لەم رەوشانە دورخاتەوە .
ئەمەش لەگەل رای زۆربەی هەرە زۆری راگەیاندکارانی سەردەمی رێنسانس دێتەوە ، بۆیە دەبینین کە لەو روالەتی ئەو سەردەم دەرنەچوە کە ئەوکات هەندێک لەدەسەلاتداران بە حوکمی رەهاوە رێگریان لە پێشکەوتنی کۆمەلگای ئەوروپی دەگرت، دەرنەکوتنی ئەو جۆرە حوکمرانیە رەهایانە کە سەرکەوتنی مسۆگەر بەدەست دێنن نیشانەی دواکەوتویی ئیتالیاو هۆکاری لەیەک ترازان وپارچە پارچە بونی ئەو ولاتە بوو، مایەی لاوازیی بوو بەرانبەر بە ولاتانی ئەوروپی کەتیایدا رژێمی سەرکەوتو دەسەلاتیان گرتبوە دەست .
فاشیست ونازیەکان دوایین کەس بون کە هزرە کۆماریەکانی مکیافیللیان پشتگوێ خست بوو و کاریان پێ نەدەکرد .

## فاشیزم و نازیزم
---------------

له دیمەن و بۆچونە تەسکەکانیانەوە دەردەکەوێ کە فاشیستەکانی ئیتالیا ونازیەکانی ئەلمانیا، گرنگیان بە مکیافیللی و هزرەکانی داوە. هەولیشیان داوە کە لەم روانگەیەوە هزرەکانی لە نوێوەو لە چوارچیوەیەکی تەسکدا بەرجەستە بکەن ، ئەمە دوای ئەوە دێ کە بۆماوەیەکی زۆر فشار خرابوە سەر نوسینەکانی مکیافیللی درابوو ، کۆمەڵێک لە نوسەری ئەلمانی هەلسان بە دوبارە چاپکردنەوەی کتێبەکانی و بە شێوەیەکی ناشیرن بۆچونەکانیان شیکردنەوەو لەسەر حوکمی رەها شتی شێوێندراویان نیشانی خەلک دا ، بێ ئەوەی ئاماژە بە مەرج وپرسی کات و شوێن بدەن لە پیادە کردنی بیردۆزەکان، کە ئەمەش مەرجی سەرەکی جێبەجێکردنی دروستی هەر بریارێکەو ناوەرۆکی یاسا یا بریار هیچ کاتێک لە کات وشوێن جیا ناکرێتەوەو هەردوکیان بەیەکەوە بەندن.
دوای چوار سەدە مۆسۆلینی مەزهەبی مکیافیللی بۆ حوکمێکی ستەمکار بە زیندوو دەزانێ ، ئەمە گەیشتە ئاستێک کە  فاشیست ونازیەکان مکیافیللیان پیرۆز زیندوو راگرت بەرادەیەک هیتلەر کتێبی (میر) ی لە کتێبخانەکەی خۆی دانابوو ، وەکو باسی لێوەدەکەن گوایە هەموو شەوێک بەر لە نوستن بەشێکی لێ دەخوێندەوە.
مۆسۆلینیش لە لەسەر کتێبی (میر) دکتۆرا نامەکەی نوسیبوو، بە پلەیەکی باش هەلسەنگێندرا ، کە تیایدا دەڵێ بۆ حوکمران کتێبی(میر) مەرجە .

## کەم و کوریەکان

----------------

د.مەزهەر دەڵێ ئەو هۆکارانەی نیشانی دابون بەس بون بۆ شێواندنی کەسایەتی هەر زاناو نوسەرێک کە چۆن راو بۆچونەکانیان گۆریبون وبەلارێیان دابردبون ، ئەوانەی ویستویانە لە ناوبانگی مکیافیللی کەمکەنەوە لە راستیدا دەستیان نە خستۆتە سەر کەم و کوریە راستەقینەکان یا لایەنە لاوازەکانی هزرەکە ، ئەم پیاوە وەکو هەر زانایەکی تری راگەیاندنکاری سەردەمی رێنسانس و وەکو کوری ئەو چەرخ ، هەموو چارەسەریەکانی دەست نیشان نەکردوە ، بەلام ئەو پێشرەوی چاکسازیەک بوە کە چارەسەری ئالۆزترین گرفتی ئەو سەردەمی کردوە ، پەنای بۆ ئەو وەلامانە بردوە کە ئەو وەکو تاک بروای وابوە ئەمە چارەسەرین ، وەلامی ئەو پرسیارانەی داوەتەوە کە پێشتر بە پراکتیزە نەکراون.

مکیافیللی لە فکرەکانیدا نوێنەرایەتی بۆرجوازیی چاوچنۆک دەکرد ، ستایشی بازرگان وپیشەوەرە بەتواناکانی دانیشتوانی شارەکانی ئیتالیای کرد بە (گەل) ناوی دەبردن ، داوای لە میر کرد کە بایەخیان پێبدا و بار ودۆخێکی گونجاویان بۆ برەخسێنێ تا بتوانن مومارەسەی کارەکانیان بکەن کە قازانج وپێشوەچون بەدوای خۆیانەوە دێنن ،بەلام بۆرجوازیی ئیتالیا بە ماوەیەکی کەم لە گەشەبون وەستا ، بەر لە سەردەمی مکیافیللی وپێشتر توشی قەیرانێکی نوێ هات ، بۆیە نەیتوانی ببێتە ئەو هێزەی چاوەروان دەکرا ئەو ئامانجانە بێنێتە دی و ئیتالیا بە دۆخێکی پر قەیران وقورسدا تێپەری .

ئەمەش ئاسایی بوو کە ئەو دۆخە نوێیە رەنگدانەوە لەسەر بۆچونەکانی مکیافیللی پەیدا بکا لەسە رژێمی پادشایەتیی رەها ، ئەمەش جۆرێک لە مساوەمەی دروست کرد لەگەل هزری دەرەبەگایەتی ، چونکە سەرەرای ئەوەی رێگر بوو لە دەرەبەگایەتی بەلام خۆی بە بەرزتر لە رژێمی دەرەبەگایەتیی سیاسی دەبینیەوە ، لەگەڵ ئەمەشدا دەسەلاتی سەردەمی مکیافیللی لایەنی ئەرێنیی خۆی لەدەست نەدابو و ناتوانین ئەمە ناو بنێین ، دووفاقیی مکیافیللی گوایە ئەم بەر و ئەوبەری کردوە لە نێوان رژێمی کۆماری ورژێمی رەها .

ئەمەش بەوە دیسەلمێنێ بەو دوژمنایەتیەی بۆ دیموکراسی وبونی ترسی لە جەماوەر ، کە بەرای ئەو سەرکێشیەکانی جەماوەر کە ناوی نابوو ( رەشایەتی ، گشتگیری) لێی بەرپرسیارە . بە هەلوێستەکانی راشکاوانە دوژمنایەتیی بۆئەو

راپەرین وخۆپیشاندنانەی جەماوەر دەربری کە لە ئیتالیا رویان دا ، بەم بۆنەیەوە مکیافیللی هەردەم روو دەکاتە (میر و خاوەن دەسەلاتەکان و دۆست و هزرمەندەکانی ، بەم بۆنەیەوە دەنوسێ و دەڵێ : نا بۆ جەماوەر.
لێرەشدا کە ئەمەش هەر گوتەی د. کەمال مەزهەرە دەبێ ئاماژە بە دوو راستی بدەین:
یەکەمیان/ ئەو گەلەی مکیافیللی بە خرۆشەوە بەرگریی لێ کرد ، لە کۆی 90000 کەسی دانیشتوانی فلۆرەنسا ، ژمارەیان 3200 کەس دەبون.
دووەمیان/ مکیافیللی لە روی کۆمەلایتیەوە لەو چینە نەبوو ، بەلام رۆلی ئەوانی بەرز دەنرخاند لە گەشە سەندنی کۆمەڵگا، بەهۆی ئەو هەلوێستەشی لە جەماوەر، کار لە پەیوەندیەکانی ئەوو (سودیرینی) کرا کە لە بۆرجوازە فلۆرەنسیە پێگەیشتوەکان بوو .

**لێکۆڵینەوەی مێژوویی**

---------------------

مکیافیللی بە رای خۆی لە بەر خەراپی پێکهاتەو ناخی مرۆڤ ، رەشبینێکی توند رەو بوو ، مرۆڤ ئەوەندە خۆپەرستە ، ئەو خۆپەرستیەی کار دەکاتە سەر باشی وخەراپیی بەرژەوەندیەکانی و دەبنە هۆکاری رەفتارەکانی لە هەرشوێن وهەر کاتێک بێ ، هەرچەندە ئەو دەڵێ:
( گۆرینی رژێم کاردەکاتە سەر گۆرینی رەفتارەکانی مرۆڤ ، بەلام ئەم گۆرینە لە رێگەی گۆرینی یاسای نوێوە دەبن کە سنور بۆ داخوازی وچاوتێبرینەکانی مرۆڤ دادەنێ) .
هەڵەی مکیافیللی – بەگوتەی د. کەمال – هەنگاوی گرنگن لە بواری لێکۆڵینەوەی مێژوییدا بەلام کێماسیی لە روی ئاسۆی مێژویی هەمەلایەن هەیە ، بە نمونە ، نەیتوانیوە لەو گۆرانکاریە مێژوییە بگا کە لە قۆناغێکەوە بۆ قۆناغیکی تر هەنگاوی ناوە ، پێی وابوە مێژوی رابردوو کە سەرچاوەی حیکمەت وئەزمونەکانی بوە، لەو کتێبانەی پێیوابوە لە هەموو روێکەوە لە داهاتوو حالی حازر دەچی ، لێرە بۆچونی مکیافیللی لەسەر مێژوو جۆرێک بوە لە ئەزمونە گرێدراوەکان بە حالی حازرەوە کە بەهۆیەوە مرۆڤی زیرەک

دەتوانێ سروشتی ئادەمیزاد بناسی ، بەشێوەیەک کە باشتر بێ لە ئەزمونەکانی تایبەتی خۆی .
د. کەمال وای دەبینێ کە ئەم لایەنە نەرێنیانەی هزرەکانی مکیافیللی بە شێوەیەکی ئەوتۆ بێ سود نین ، بەتایبەتی ئەگەر ئەم هزرانە بەشێوەیەکی سروشت و بە پێی کات وشوێنی تایبەتی و بەبەستنەوە لەگەل ئامانج وبەرژەوەندیەکانی خۆی هەلسەنگاندن ولێکدانەوەی بۆ بکرێ . سەرەرای ئەو رەشبینی وبێ ئومێدیەی لە کەسایەتی تاک، مایەی پاساو هێنان نیە ، لەگەڵ ئەوەشدا نابی ئەو راستیە لەسەر مکیافیللی بکەیتە ماڵ کە ویستویەتی مرۆڤی ئیتالیی نوێ بخولقێنێ کە لە مرۆڤی تەواو(متكامل) ەوە نزیک بێ . وێرای هەلوێستی نەرێنیی لە جەماوەر، بەتایبەت لە کاتبی (میر) بەلام عبرەت وحیکمەتی نوێی لێ وەدەست هێناون کە تایبەتە بەو سەردەم.
لە کتێبێ (گوتارەکان) پێی وایە گشت(جەماوەر) و میرەکان بە دروستی لەیەک دەچن ، ئەگەر ئەرکی ئێمەش بێ کە لایەنێکیان کار بکەنە سەر لایەنەکەی تر، ئەوا ئەو لایەنەی کاریدەکرێتە سەر دەبێ لایەنی جەماوەر بێ، ئەمەش لەسەر رۆشنایی ریز گرتن لە پاساو نەریتەکانە.
یەکیکی تر لە گوتەکانی :
(گومانی تیانیە کە پاساوی بەهێز هەن بۆ ئەوەی خەلک دەنگی گەل بە دەنگی خوا بشوبهێنی، چونکە دەنگی گەل لە زۆر روەوە تا ئاستێکی بەرز راستن ئاماژەن بە راستیەکان ، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە لە ژێرەوە هێزێکی نادیار هەیە هانی گەل دەدا درک بە راستی و چاکەکان بکا .
هەروەها لە گوتەکانی:
ئەمەش سەلمێندراوە کە چینی گشتی لە دەستنیشان کردنی جۆری حوکم زیرەکتر و وردبینترە لە میر ، چونکە ئەستەمە بتوانرێ بروا بە جەماوەر بێنی کە کەسێکی گەندەل وخەراپەکار بۆشوێنێک یا پۆستێکی بالا دەست نیشان بکەیت وپێی بسپێری ، بەلام بۆ رازی کردنی میر بەلکوو بە ئاسانی رازی ببێ ، لەو دوو کتێبەیدا بروای بە پێدان و سپاردنی پۆست بە خەلکانی شایستە، بەم شێوازە هەیە .
د.مەزهەر جەخت لەوە دەکاتەوە کە لە هەموو حالەتەکاندا ئەگەر حوکم لەسەر کەم و کوریەکانی مکیافیللی بدەیت، دەبێ بە چاوی سەدەی بیستەم ئەو حوکمە نەدەیت ، نا بێ وەکو (روتینبورگ) حوکمەکان بدرێ ، بەلکو حوکمەکان دەبێ بەچاوی حوکمەکانی پشت شورەی قەلاکانی سەدەی شازدەهەمی سەردەمی

دەرەبەگایەتی بدەین، بەم شێوەیە مکیافیللی سەرتاپای لە هەوای سەردەمی خۆیدا دەخولایەوە، عەودالی ئەو سەردەم بوە ، کارە سیاسیەکانی نمونەی فەلسەفەی ئەو سەردەمە بونە کە هەولی بۆ رێکخستنی مولکدارێتی نیشتمانیی رەها داوە .
لە کۆتاییدا کەم و کوریەکانی مکیافیللی ئەوانەی ئاماژەمان پێیان داو ئەوانی تریش ، لە روی لایەنی ئەرێنی و دەربرینی هزریەوە ، ئاسایین .
لەم بوارەدا مکیافییلی سەلماندنێکی ئاست بەرزی ئەنجام داوە، باشتر لەوانەی پێشتر لە خۆی ، راو بۆچونەکانی مکیافیللی رۆلی باشیان لە گۆرانکاریەکانی دیراساتی مێژوییدا بینی، لە توێژینەوەکانیدا سنوری لێکدانەوەی (پراگماتیکی) تاکرەویان بەزاندن کە پێشوەختانە درک بە روداوەکان بکا ، وەکو واقع و لەسەر بنەمای ئەزمون سەیری دەولەت ویاساکانی دەکردن نەک بە دیدی خەیال بۆ حوکمی خواوەندی، برواشی بە حەتمیەتی روداوە مێژوییەکان و پەیوەندیان بەیەکەوەو هاوبەشیان لەگەل یەکتردا هەبوو.
لە کتێبە مەزنەکەیدا بەناوی (مێژوی فلۆرەنسا) بەدواداچون بۆ خەباتی جەماوەر دەکا لە دژی ئوروستوکراتەکان ئەو خەباتەی بە درێژایی مێژوی ئیتالیا پێی هەڵساون ، لێرەوەو واتە لە میانی لێکۆڵینەوە لە فاکتەرەکانی جولانەوەی روداوە مێژوییەکانەوە بە فەرامۆش نەکردنی رۆڵی تاک ، دەتوانین بڵێین کە مکیافیللی پێش مێژوو نوسەکانی سەردەمی رێنسانس کەوتوە، ئەمەش گرنگی خۆی هەیە ، ئەگەر بەوەمان زانی کە مکیافیللی بەر لەوەی مێژو نوسبێ وەکو سیاسەتمەدارێک مێژوی نوسیوەتەوە ، واتە لە سیاسەتەوە وەکو زانستێک خزمەتی مێژوی کردوە ، بۆیە بەوە نەوەستاوە روداوەکان بە ووشکی و میکانیکی بگێرێتەوە ، بەڵکو توێژینەوەی لەسەر کردوەو پەندی لێ وەرگرتوە.
وەکو د. مەزهەر هدیبینێ مکیافیللی خاوەنی رای سیاسی وکۆمەلایەتیی ترە لەسەر یاساکانی دیموکراسی و سەرکەوتن وژێرکەوتنی سیاسەتمەداران و لە رۆڵی بەخت لە مافی چارەی خۆنوسین و روداوەکان و کەسەکان وهی تریش.
مکیافیللی لە هەموو چارەسەریەکاندا هەولی داوە بچێتە ناو ناخە شاراوەکان فاکتەرە نادیارەکان دەست نیشان بکا، لەم روەوە گەلێک جار بەر لەوەی بە کۆتاییەکان بگا دەست نیشانی لەم دەرگایەی دابێ و باسی لەو خەسلەتانە کردبێ چارەسەریەکان دەکا . ، ئەوسا شتێکی نوێ و باش دادەهێنی، لە باسکردنی جەنگ و هونەری جەنگ وسەرکەوتن وژێرکەوتنەکاندا دەبی کەسێک هەبێ لە مکیافیللی باشتر کە ئە وکردویەتی ؟
لەم روەوە دەڵی :

سەرکەوتن هەموو ئاسەوارەکانی شکستەکان دەسرنەوە، لەکاتێکا ژێرکەوتن زۆربەی نەخشە سەرکەوتوەکان دەسرێتەوە.
وەکو د. مەزهەر دەڵی: ئا بەم شیوەیە نیکۆلۆ لەگەل زۆربەیان جیایە ، بەم شێوەیە داستانی ژیانی دەست پێدەکاو زۆرترین ئەزمونی لێ وەرگرتوە کە تاییدا سەرکەوتو بوە، ئەمە بۆتە کارتێکی ئاشکەرا لەم مەیدانەدا . جێی داخە بۆ هەلسەنگاندنێک بایەخی شایەستەی پێ نەدراوە .

**ئەزمون**

**--------**

ئەوکاتەی ئیتالیا روبەروی داگیرکاری بێگانە دەبێتەوە، مکیافیللی تەمەنی لە 55 سالیدا دەبێ ، لە بیستەکانی سەدەی شانزەهەم ئیتالیا توشی جەنگ دەبێ (1494-1559) کە لە نێوان ئیسپانیا وفرەنسا لە پێناو دەستگرتن بەسەرئیتالیا بەرپا دەبێ ، ئەمە دەبێتە دەستپێکی قۆناغێکی ترسناک، ئەو کاتەی پادشا چاوبرسیەکەی ئیسپانیا (شارلی یەکەم) دێتە سەر حوکم و چاوی لەوە بوە کە ئیمپراتۆریەتێکی کریستیی یەکگرتو دابمەزرێنی ، لە ترسی خۆپاراستن لەو هێرش وپەلاماریەدا پاپا و فلۆرەنسیەکان هاوپەیمانی لەگەڵ فرەنسا دەبەستن ، بەڵام فەرەنسیەکان لە 1525 لە شەرێکی یەکلاکەرەوە بەرانبەر بە سوپای ئیسپانیا تێکدەشکێن و پادشای فرەنساش (فرانسوای یەکەم) بە دیلی دەکەوێتە دەست سوپای ئیسپانی کە بەهۆیەوە زەویەکانی ئیتالیا لەبەردەم سوپای ئیسپانی کرانەوەو دەستیان بەسەردا گیرا ، لەم دۆخە ناسکەدا ژمارەیەکی کەمی دلسۆزانی نیشتمان پەروەر رێگەی بەرگری کردنیان هەڵبژارد وبەرەنگاری سوپای داگیرکار بونەوە بۆ پاراستنی سەروەری ولات و ئابروی هاولاتیان ، مکیافیللی یەکێک دەبێ لە دیارترین ئەو پاڵەوانە دلسۆزو نیشتمانپەروەرانە .
بەگوتەی د.کەمال هەلوێستەکانی رۆژە تەنگەکانی ئەوسای مکیافیللی پر بون لە سەروەری و نیشتمانپەروەریی راست ، تەنانەت ئەوکاتەی دوودلی دەکەوێتە ناو دڵی زۆرینەی خەلکەکە، بە پاپا شەوە، ئەوکات مکیافیللی لەسەر هەلوێستەکانی رشتتر دەبی وخەلک بۆ کۆری خەبات جۆشدەدا ، هانی پاپا دەدا

به بەردەوامبونی لەسەر هەولیستە نیستمانپەروەریەکانی ، دەستی بە گەشت وگەران کرد لە شوێنیکەوە بۆ شوێنێکی تر وبە نوسین وگوتارەکانی خەلکی کۆدەکردەوە ، لە پەیوەندیی بە دەسەلاتدارەکانەوە بەردەوام دەبێ، داوای دریژە پێدان وخۆوەدەست نەدانی لی دەکردن ، هەروەکو خۆی دەڵێ :
( هەموو شتێکی لەبیر چوبۆوەو هەول وبیرکردنەوەکانی لەسەر رزگارکردنی ولات چرکردبونەوە ، چۆن ئەم ولاتە رزگارکەن وئازادیەکان بەرقەرار وەدەست بێنن و بەرجەستەیان کەن ).
ئەوکات دوو پرۆژە پێشکەش بە پاپا دەکا :
یەکەمیان / توند کردنی شورەکانی فلۆرەنسا دەبێ .
دوەمیشیان/ بە ئامانجی دامەزراندنی سوپایەکی گەلەری لە توسکانیاو شوێنەکانی ژێر دەسەلاتی پاپا دەبێ.
هەرچەند مەترسیەکان زیادیان دەکرد مکیافیللی رشتتر و چالاکتر دەبوو ، دەستی بە پەیوەندی کردن کرد بە دۆستەکانی و وەرگرتنی رای هزرمەندەکان، زۆر بەگەرمی بەشداریی لە توند کردنی سنورەکانی فلۆرەنسادا کرد ، بێ گوێدانە هەلوێستە ناجوامێرانیەکەی هەندێک کەس ولایەن ، ئەوکات کە زۆرینە بە پاساوی جیا جیا ، لە ترسی فرەنسا خۆیان لەم ئەرکە نیشتمانیە دەشاردەوە، بەلام مکیافیللی بەراشکاوی رایدەگەیەنێ کە بێ دواکەوتن ئەرکی سەرشانمانە چەک هەلگرین و لە چاوەروانی ئەوەدا نەبین ئاخۆ فرەنسا چی دەکا .
نیکۆلۆ تەنها بەمە نەوەستا ، بەرنامەو پلانی بۆ روبەرو بونەوەی ئەو دۆخە دارشت و بریاری بوێرانەی لەم روەوە دەرکردن ، لەم کاتە بێترس وبێ گوێدانە هیچ بەربەستێک باس لە میری نوێدەکا ، ئوەی گرنگ وپر بایەخ بوو، دێت ئەو ئەرکە قورسە دەخاتە سەرشانی، بۆ دۆست و دوژمنانی ئیتالیا رادەگەیەنێ کە ئامادەیە لەم رۆژە ناسکە ولەم سات و وەختە پر مەترسیەی بەسەر ئیتالیا تێدەپەرێ بەرگری لە کەرامەت وئابروی ئیتالیا بە هەموو شێوەیەک بکا ، خودی پاپا دانی بە ئازایەتی مکیافیللی نا ، بەلام دودڵی وهەندێک هۆکاری تری جیا ، بونە مایەی ئەوەی لە جێبەجێکردنی بریارەکەی دوا بکەوێ .
ئەمانە نەبونە هۆکاری وەدەرنانی بەرنامەکانی مکیافیللی ، وولات لە مەترسیدابوو ئەویش دەبوایە ئەوەی لە توانایدایە پێشکەشی بکا ، بەلام گێلی دەسەلاتدارەکان ودوودڵی وکورت بینیان بونە رێگر لە جێبەجێ کردنی ئەو برایەر ، لەوکاتە هێزەکانی ئیسپانیا سود لەو کاتە وەردەگرن و پێشرەوی دەکەن بۆ داگیر کردنی خاکی ئیتالیاو لە فلۆرەنسا نزیک دەبنەوە ، ئەمە ترس ناخاتە

دلی نیکۆلۆ و پێی ناتۆقێ ، بۆیە بەردەوام لە هەولەکانیدا بەرەو پێش دەچێ، ئەوتا نەخشەو پلانێکی نوێ دادەرێژی ، بریتیە لە هێرشێکی کتوپر بۆ ناپۆلی وبەدیل گرتنی جێگری پادشای ئیسپانیا و چەککردنی لایەنگر وپاسەوانەکان تا لەوێوە فشار بخاتە سەر ئیسپانیا .
بەلام پاپا ئەم پرۆژە گرنگەش رەت دەکاتەوە کە دواتر خۆی باجەکەی دەدا ،ئەوەتا ( گریمو بومبیو کالونا) بەهاوکاری سەربازەکانی ئیسپانیا کە فاتیکانیان تالانکرد ، دێتە ناو رۆما و کلیمەنت ی حەوتەمیش ناتوانێ تەنها خۆیشی دەرباز بکا کە تا سالی دواتر ئەم شکستەی دەبێتە رێخۆشکەر بۆ روخانی یەکجارەکیی.
جارێکی تر مکیافیللی پاشگەز نابێتەوە، لە هەولەکانی بەردەوام دەبێ ، نەخۆشی پیری لە بیردەکا ، ئەوکاتەی خەلکەکە رایان دەکرد خۆیان لە سۆنگەکانی خەبات دەشاردەوە، ئەو بە نەفەسی گەنجایەتی لە فلۆرەنسا لە نێوان ئەم بەرەی جەنگ وئەو بەرەی جەنگ دەخولایەوە ، نامەی دەنوسی وخەلکی هاندەدا ، پەیوەندیی بە دۆست ولایەنگرانەوە دەکرد ، خاوەن رایەکانی کۆدەکردنەوەو لەیەکی نزیک دەکردنەوە ، لەم هەموو روداوانە ئەو گوتە بەناوبانگەکەی خۆی لە یاد نەدەکرد:
وولات لە مەترسیدایە دەبێ ئەوەی هەمانە پێی ببەخشین، خەبات و سەرشۆرنەکردن تا کۆتایی.
گەردەلولەکە هەلّی کردوە ، بەلام کەشتیەکە دەبێ بە ئازارەوە بەرێبچێ ، بەم ووتانە نیکۆلۆ هەستەکانی دەردەبرێ ئەوکاتەی هێزەکانی دوژمن نزیک دەبنەوەو هیچ چارەسەریەکیش نیە لەم تەنگەژەیە دەرچی ، جگە لە لێدەرچونی ئاشتیانەی سەربەرز نەک بە خۆوەدەست دانی شەرمەزاریانە .
لێرەشدا دەبێ بزانین چۆن لەم بارو دۆخە بۆ شەر و ئاشتی میری نوێ هەلّدەبژیرین. وەکو د. مەزهەر جەختی لەسەر دەکاتەوە ، دەلّێ:
( ئەمە رونە مکیافیللی وەکو هەر مێژوو نوسێکی رەسەن ، پرسەکانی لە نێوان پراکتیک وبیردۆزدا یەکخستن ، کۆکراوەی کارەکانی سەردەمی ئەزمونە تالەکانی ، بە دروستی لەگەلّ بەشی دوایی کتێبەکەیدا دێنەوە ، ئەوەتا بە گەرمی هانی خەلک دەدا بۆ رزگار کردنی ئیتالیا و ئومێد بەخشین بەوەی خوا کەسێکیان بۆ ببژێرێ کە رزگاریان بکا ، ئەمیش دەبێتە میری نوێ .
مکیافیللی ئاوەها بوو ، هەر ئاوەهاش مایەوە ، ئەو کاتەی هاوشێوەکانی مکیافیللی لە سەرمێزی خواردنەوە و شەوەتاریکەکانیان بە رابواردن و کەیف وسەفا دەبردەسەرو تەخشان و پەخشانی سامانی ولاتیان دەکرد، بەدوای ئارەزوەکانی خۆیاندا وێلّ بون و خانویان ئاوادەکرد، بەهەوەستی خۆیان گوندو

ئاواییان کاول دەکردن و لە هەلویستە نیشتمانپەروەریەکان و دلسۆزانی نیشتمان بەگومان بوون ، مکیافیللی ئەوکات روبەروی مردن دەبوەو هزرەکانی دەسوتاندن وخەلکی بە پرسە نیشتمانیەکانی ئیتالیا سەرقاڵ دەکردن ، چونکە بەراستگۆیانە نیشتمانەکەی خۆی خۆشدەویست، ئەوکات ووتە بەناوبانگەکەی خۆی سەلماند، کاتێک دەیگوت :

خۆشەویستیم بێ ئەوەی بۆ نیشتمانم بێ ، بۆ روحمە .

هەولەکانی مکیافیللی بە فیرۆچون، رۆما خۆی دایەدەست پاش ئەوەی نیکۆلۆ ئەوەی توانیی بەخشیی هیچی تری لەبەردەم نەمایەوە جگە لە گەرانەوەی بۆ گوندەکەی بۆئەوەی ئەوەی ماوە لە دوا تەمەنی لەوێ بیباتە سەر ، بەلام بۆئەوەی بوو کە بە هەلویستە نەگۆرەکانی دور لە بەرژەوەندیە تەسکەکانی خۆی ومزایەدەکردن بە دروشمی بریقەدار لە تەنگترین بارو دۆخ ، جارێکیتر بسەلمێنێ کێیە نیکۆلۆ دی برناردو مکیافیللی (وەکو د. مەزهەر دەیلێ).

ئەی هەلویستی چاوچنۆکەکانی مکیافیللی چی بوو ئەوانەی لە دورەوەو لە بەرزاییەوە سیەری هەلویست و دۆخەکەیان دەکردو لە دواجار دەچونە پال سەرکەوتو ؟ ئەوان لەمە زیاتر لە تواناییاندا نەبوو هیچ بکەن ، گومانی دەستکردیان لەسەر ئەو شۆرشگێرە دلسۆزە دروست کرد ، بە گیانێکی هەلپەرستانە هەولی زۆریاندا تا ئەو شۆرشگێرە لەو پۆستە دورخەنەوە کە پێش روداوەکان بۆی کاندید کرابوو .

لە کۆتاییدا د. مەزهەر بە پرسیارێک دەوروژێنێ ، ئەگەر ئەمە سەرزەنشتی مکیافیللی وبەهرەداریی بکا ، چۆن دەبێ بروا بەوە بکەین کە ئەو دوو بابەتە لە دەستکردی خواوەندە ونە لێی تێدەگەن ونە وەکو پێویست مامەلەی لەگەڵدا دەکەن؟ ئایا پرسەکە بەم شێوەیە بوو؟

**بەرزترین هەڵسەنگاندن**

**--------------------**

د. مەزهەر وەلام دەداتەوەو دەڵێ:

لە جوانترین یاساکانی ژیان ، ئەوەیە کە راستیەکان نابێ تا دوایی بشاردرێنەوە ، کارەکەش لەگەڵ مکیافیللی بەم شێوەیە بووە ، هەموو هەولەکان بۆ چەواشە کردنی راستیەکان وشێواندنیان بون، لەسەرەتاوە نەتوانرا راستیەکان لەبەر چاوی زانا وفەیلەسوفەکان ون بکرێن وبابەتەکە لەبەرچاوی خوێنەران ناشیرن بکرێ ، بە دەگمەنیش هەر کاتەی هزروانێک ناوی ئەو کەلە پیاوە بێنێ لە ستایش و ریز بەولاوە هیچی تری بۆی نیە ، زاناو فەیلەسوف و پیاوی دەولەتی ئینگلیزیی مەزن ( فرەنسیس بیکون 1561-1626) نوسین و کتێبەکانی مکیافیللی بە وردی وبە هۆشەوە خوێندۆتەوە و کاری تێکردوە و لەو راو بۆچونە نوێیانە سەرسام بوە ، بیکون یەکەم کەس بوە کە درکی بەوە کردوە کە مکیافیللی بەشێوەیەک باسی لە تاک کردوە وەکو ئەوەی کە هەیە نەک وەکو ئەوەی دەبێ وابێ کە بە خەیال باس لێوە بکا ،لەم روەوە دەنوسێ و دەڵی:

دەبێ لە مکیافیللی وئەوانەی وەکو ئەون لە نوسەرەکان سوپاس گوزار بین، چونکە ئەوان بە راشکاوی باسیان لە چۆنیەتی مرۆڤ کردوە نەک مرۆڤ دەبێ چۆن بێ .

لەگەرمەی هێرشەکانی سەر هزرەکانی مکیافیللی دا هەندێک لە نوسەران ئاماژەیان بە بۆچونەکانی داوەو لە هەلسەنگاندنەکانیان بەرز نرخاندویانە. (لیسموس) لە کتێبەکەی خۆیدا بەناوی (کتێبەکانی سیاسی)کە لەساڵی 1950 بلاوی کردۆتەوە تیایدا هەلوێستی مکیافیللی نیشانداوە سەبارەت بە شوێن وپێگەی ئاین لە سیاسەت ودەولەت، لە ساڵی 1613 ک.شوببیە ، لە نوسینەکانیدا راکانی

مکیافیلی لەسەر زەرورەتی جیاکردنەوەی پرسە سیاسیەکان لە پرسی چاکە بلاو دەکاتەوە ، دوای ئەو بە دوو سەدە (جبرائیل نودیە) لەسەر شێوازو رەفتاری سیاسیی مکیافیللی دەنوسێ ، تیایدا دیاری کردوە کە ئەو بەدوای میرێکی تیرۆریست دا ناگەرێ ، بەڵکو بەدوای حاکمێکی سەرکەوتو لە شێوەیەکی نوێدا دەگەرێ کە هاولاتیان پێویستیان پێیەتی .

دوای ئەوان فەیلسوفی ماتماتیکی فرەنسیی ناسراو بە دیکارت ( 1596-1650) دێت ، ناوبراو لەو هزروانە یەکەمانەیە کە لەژێر کاریگەری مکیافیللی دابون ، راو بۆچونەکانی لە چوارچیوەیەکی دادپەروەر بۆ حاکمێک دارشت  کە بۆ رژێمێکی رەوشەنگەر بگونجێ ، ئەمیشیان بە ماوەیەکی درێژ بەرلە فەیلەسوفی ئینگلیزیی بەناوبانگ( هۆبز) (1558-1679)     دەگاتە ئەو رەستیەی رۆلی خۆپەرستی تاک وچاوبرسێتیەکانی دیاری بکاو حەزو ئارەزوەکانیشی بۆ پاراستنی خود دەست نیشان بکا .، ئەمەش رەنگدانەوەی لەسەر باخی فەیلەسوفی ئینگلیزی هێشتەوە

هەروەها جۆن لۆکی فەیلەسوفی ئینگلیزی(1632-1704) دوایین کەس دەبێ کە دەکەوێتە ژێر کاریگەری  فکرەکانی مکیافیللی، ئەگەر بێینە سەر رۆلی ئەدەبی ئینگلیزی لە شێواندنی ناوی مکیافیللی بە شێوەیەکی بەربلاو لە ئینگلتەرا ، ئەوکاتە لە ئەهمیەتی هەڵسەنگاندنی ئەو فەیلەسوفانە دەگەین کە بە زیرەکی و ووردبینی دەستیان خستۆتە سەر نوسین وکتێبەکانی مکیافیللی و لە مەبەستی نوسین وئامانجەکانی گەیشتون.

هەندێک لە فەیلەسوف و زاناکان ستایشیان لە رۆلی مکیافیللی کرد وەکو مەزنترین ودیارترین فەیلەسوفی سەردەمی رۆشنگەری و جولانەوەی نەتەوایەتی لە ئەوروپا. لەوانە نوسەر و مێژوو نوسی فرەنسی ڤۆلتێر(1694-1778) و فەرهەنگ نوسی بەناوبانگ دیدور (1713-1784) و فەیلەسوف ونوسەر و مۆزیکژەنی فرەنسی جان جاک روسو (1712-1778) و شاعێرو هزروان وپێشەنگی نەتەوایەتیی ئەڵمانی گوتە (1749-1820) ، هەروەها هێگلیش رۆلی ئەم کەڵە پیاوەی بەرز نرخاندوە ، ئەمەو یەکەمین کەس بوە کە توانای رازی کردنی پادشاکانی هەبوە .

هانی فردریکی مەزنیدا کە کتێبێک لەسەر مکیافیللی بنوسێ پاش ئەوەی لە نامەیەکیدا بۆی سازشی مکیافیللی کردبوو رۆلی بەرز نرخاندبوو ، چونکە ئەم دەیزانی ئەم جۆرە کتێبە لەسەر ئەم کەسایەتیە چەندە ناوبانگ بۆ پادشا ئەڵمانیە

وەدەست دێنێ ، ڕۆسۆش کاتێک لە بەناوبانگترین نوسینەکانی لە کتێبی (گرێبەستی کۆمەلایەتی) لە بەشی سێیەم وشەشەم باس لە مکیافیللی دەکاو هەلسەنگاندنێکی باشی کارەکانی دەکا ئەمەش دەقەکەیەتی:
مکیافیللی وا خۆی نیشان دەدا کە وانە بە پادشاکان دەڵێتەوە ، بەلام لە راستیدا وانەی بە گەلان وتۆتەوە ، کتێبی (میر) هی کۆماریەکانە کاتێک پالەوانە رەزا گرانەکەی کتێبەکە بەم شێوەیە دیاری دەکا ، ئەمە نیشانەی نیازەکانی نوسەرە کە بە شاراوەیی دەری دەبرێ ، دواتر کاتێک کۆشکی پادشایەتیی رۆما رێگە نادەن ئەم کتێبە بلاو بکرێتەوە ئەو راستیەمان بۆ دەسەلمێنێ کە لە بەرژەوەندی پادشاکان نەنوسراوەتەوە ، ئەوە دیاربوو کە نوسەر چۆن بێباکانە ئەو کۆشکە پێناسە دەکا .
هەروەها دەزگا سۆشیالیستە زانستیەکان، وەکو کارل مارکس وفریدریک ئینجلس چەندین جار هەلسەنگاندنی باشیان بۆ فکرەکانی کردوە ، مارکس بە ووردی کتێبەکانیی خوێندۆتەوە بەتایبەت کتێبی (گوتارەکان) دیارە سودیشی لێوەرگرتوەو هەندێکیشی لێوەرگرتوە بەتایبەتی لەو بابەتانەی تایبەتە بە دۆخی جوامێرەکانی فلۆرەنسا و بوندقیە.
لە نامەیەکدا کە مارکس بۆ ئینجلس دەنێرێ بە ( نوسەری پایەبەرز ) ناوی دانەری کاتبی (میر) دەبا، ئەمەش چونکە دانەرەکەی یەکێکە لەوانەی بە چاوی مرۆڤ سەیری دەولەتیان کردوە ، سەرچاوەی یاساکانیان ئەقل وئەزمونەکانیان بوە نەک خەیال.
ئینجلس ناوی لە چوار لە مەزنترین راگەیانکارەکانی سەردەمی رێنسانس ناوە، زەبەلاحەکانی رێنسانس چونکە ئەو سەردەم پێویستیی بەو زەبەلاحانە بوو بۆیە سەردەمێکی زەبەلاحیان خولقاند ، ئەو راگەیانکارانەش بریتی بوون لە هەریەک لە : لیوناردو دافنشیی وێنەکێشی ئیتالی ، چاکسازخوازی ئاینی مارتن لۆسەر ، مەزنترین وێنەگری ئەلمانی لەو چەرخ ئەلبریخت دورير و مکیافیللی بوون.
هەروەها کتێبی هونەری جەنگی زۆر بەدڵ بوو، ناوی نابوو مارسیلیزی سەدەی شازدەهەم ، ئەوەی شایەنی باسە لە دیدی ئەو مکیافیللی یەکەم نوسەری جەنگ بوولە چەرخی نوێ.
د.مەزهەر بەم شێوە کۆتایی بە گوتەکانی دێنێ و دەڵێ:
لە سەردەمی ئێمە دەیان کەس ، بەلکوو سەدان لە هزروان و مێژوو نوسە رۆژئاواییەکان ستایشی رۆلی مکیافیللی وهزرەکانیان کردوە و چەندین دیراسەو لێکۆلینەوەیان لەسەر فکرەکەی ئەویان ئەنجام داوە ئەمەش ئاماژەیەکە بۆ پر بایەخی وپر بەهایی رێچکەی بیرکردنەوەو هزرەکانی .

**ئایا بەراست مکیافیللی شەیتانە ؟**

**---------------------------**

ئەم پرسیارە کازم الحسن کردویەتی ، وەلامەکەشی ئەو کەسانە دەیدەنەوە کە بەرگری لە مکیافیللی دەکەن گوایە ئەو هیچی خەراپی نەگوتوەو نە کردوە ، ئەوەی کردویەتی ، خوێندنەوەی واقیع بوە زیاتر نا.

شێوازی مکیافیللیش شیوازێکی براگماتیی سود بەخشە . خاوەنی ئەو شێوازە ناویان ناوە مەدرەسەی روالەتی(واقعی) .

پەیرەوی واقعی لای مکیافیللی بەمانای ( دەولەتێک نوێنەرایەتی رێکخستن بکا بەتەواوەتی ، بەلام خۆپەرستیی مرۆڤ وادەکا کە ئەو بەرگە داکەنێ و روەو تەمبەلی کۆمەلایەتی هەنگاو بنێ ، تاکی مرۆڤ هەردەم روو لە راکردنە ، حەزی لە یاخی بونە لە یاسا و خۆی لە باجەکان بشارێتەوەو نەیدا و روبەروی شەریش نەبێتەوە ، واتە بە ئارامی دور لە ئەنجام گەیاندنی ئەرکەکانی سەرشان و بە سود وەرگرتن لە مافەکانی خۆی بە زیادەوە، کەم لەو مرۆڤانە پالەوان دەردەچن یا خۆبەخش دەبن، لە پێناو بەرژەوەندی کۆمەل بەرژەوەندیەکانی خۆیان ناکەنە قوربانی ، هەمووشیان لە شۆرشێکی بێدەنگ دان دژی دەولەت.

ئەوەی پێشتر باس کرا بەمانای ئەوە دێ کە مکیافیللی کەسێکی ناپاکە ، کاتێک ئەرستۆ بانگەشەی جێبەجێ کردنی پەیرەوی رەوشت دەکا ، مانای ئەوە نیە کە ئەرستۆ کەسێکی پاک وبێگەردە ، ئەوەی ئێمە مەبەستمانە بێتەدەستمان ، بەکارهێنانی پەیرەوی شیکاریە کە چۆنایەتی کوالێت بەسەر خەلکدا دەسەپێنێ.

دواتر کاتێک بەدوای نامەکانی مکیافیللی دادەچینەوە دەبینین چەند رێنماو پێشنیارێک دەخاتە روو بۆ ئەو کەسانەی نیازیانە حوکمرانی بکەن :

**دیمەنی یەکەم/ خەلک ئەو کەسەیان خۆش دەوێ کە بەرژەوەندیەکانیان دەپارێزێ .**

کاتێک خەلکی میلان داوایان لە لویسی دوانزەهەم کرد، بێت و شارەکەیان داگیربکا ، دەرگای شارەکەیان بۆ والا کرد تا داگیری بکا ، بەلام کاتێک بێ ئومێد بون لەوەی مەرامەکانیان بۆ جێبەجێ بکاو ئەوەی ئەوان بیریان لێی دەکردەوە ئەوە نەبوو ، ئومێدەکانیان بە خێرایی بروسک دەڕمێن و لە ناودەچن ، چونکە ئەو ئومێدانەیان نەهاتنەدی میرە نوێکەی بەم شێوەیە داوای بوردنی لێکردن لە جێبەجێ کردنی داخوازی وئومێدەکانیان ، ئەمە ئەو وێنەیە بو کە مکیافیللی کێشابوی ، ئەو دروستی نەکردوە بەلکو گواستۆتیەوە و بەس . ئەمە حالی گەلی میلان بوە .

**دیمەنی دووەم/ کەلێن تێخستنی پێکهاتەی شارستانێتی گەل و دواتر حوکمرانی کردنیان.**

تورکەکان ئەمەیان بە ولاتی گریک کرد ، وێرای ئەوەی تورکەکان هەموو ڕێگەکانیان بەکار هێنان بۆئەوەی گریکستان لەدەست نەدەن ، بەلام ئەم لەدەست نەدانە نەدەکرا ئەگەر تورکەکان نەیان گواستبایەتەوە گریکستان و بارگەیان لە وێ نەخستبایە و لەوێ نەژیابانا .

**دیمەنی سێیەم/ کاتێک دەست دەگری بەسەر گەلێکدا ، خۆشەویستترین کەسیان بکە بە ناشیرنترین کەس ، ناشیرنەکەشیان بکە بە خۆشەویستترین.**

حاکمی هەرێم دەبێ بەهێزەکان لاواز بکەن ، رۆمانەکان لە کۆلۆنیەکانیان( ولاتە داگیرکراوەکان) ی خۆیان کەسایەتیە بچوکەکانیان هەلخەلەتاندن ودەستەرۆیان کردن ، بێ ئەوەی لاوازیان بکەن، دەسەلاتی بەهێزەکانیشیان دامرکاندو سەرکوت کردن .

**دیمەنی چوارەم/ هاوپەیمانەکەت لەناو بەرە.**

ئەگەر لە کاتی قەیرانەکاندا داوای هاوکاری وخزمەتگوزاریەکت لە توێژ یا پێکهاتەیەک کرد ، دوای ئەوەی سەرکەوتن بەدەست دینی ودەگەیتە ئامانج ،

ئەوكات كێشەیەكی نوێت دێتە پێش، ئەویش ئەوەیە كە هاوپەیمانەكانت دەبنە هاوبەش لەگەڵتدا، دەبێ دەستكەوتەكانیان لەگەڵدا بەش كەیت . بۆیە باشترین رێگە چارە ئەوەیە لەناویان بەری ، چونكە هەنگاوی داهاتوو لەگەڵیاندا یا دابەشكردنی دەسەلات یا لێسەندنی دەسەلاتە.

**دیمەنی پێنجەم/ لەحالەتی ئەوەی كۆلۆنیالەكەی ناخاتەوە سەر خاكی خۆی**

دەكرێ هەندێكجار رێگە بەو خەلكە بدەیت لەژێر یاساكنیاندا بژین و بمێننەوە لەو ولاتەی داگیركراوە، بەلام دەبێ باج یان سەرانەیان لێ وەربگیرێ، حكومەتێكی كەمینەشیان بۆ پێكبهێندرێ.

**دیمەنی شەشەم/ ئەو فەرمانبەرەی تا ئاستی تۆ كاردەكات دەبێ لەناوی بەری.**

فەرماندە دەبێ زیاد لە پێویست لەگەل ئەو وەزیرە نیان وبە حورمەت بیت كە چاوی لە زیاترە، تا ئەو كاتەی وەزیر هەست بەوە دەكا كە دەسەلات و تواناكانی لە فەرماندەكەی كەمتر نیە ، بەلام مكیافیللی لە ئەزمونی خەلكانی تر بۆی دەركەوت ، ئەگەر فەرماندە ویستی دەستبەرداری وەزیرە چاو برسیە كەبێت (طماع) دەبێ پێشتر لەناوی بباو شوێنەواری نەهێلێ چونكە تەنها بە درەوشانەوەی وەزیر ، دوا بزمار لە تابوتی دەدرێ.

**دیمەنی حەوتەم/ هێزی چەكدار**

دەكرێ بەسەر چواربەشدا دابەشی كەین:
هاولاتی، بەكرێگیراوەكان، تێكەلاوەكان ، یەدەك( مەبست لە هێزی بێگاەن لە كاتی پێویست بۆ هاوكاری دێت).
ئەلبەت زۆربەی مەدرەسەكان لەگەل بۆچونەكانی مكیافیللی یەكن كە هەمویان مەترسیدار وخەتەرناكن زیانیان لە سودیان زیاترە، جگە لە هاولاتی نەبێ ئەویش هەندێک جار، چونكە شەر مانای ئەوەیە گیان بە مردن ببەخشی ، بەرنامە وپەیرەوی براگماتیش لەسەر بنەمای بەرژەوەندی بنیات نراوە ، ئەوەی

بەرژەوەندیشی دەویَ نایەویَ بمریَ چونکە دەیەویَ رابویَریَ و لە ژیاندا بمێنیَ ، بەلام لەوانەیە ئەو کەسانەی نیشتمانپەروەر ودلسۆزی گەل و نیشتمانن ئامادەبن گیانیان ببەخشن و لەو پێناوەدا بمرن ، هەرچەندە هەمویان لە ئەرک و مافدا یەکسانن ، یا خۆبەخشیەکە لە پێناو سومبولێکی تردا دەبیَ جیا لە نیشتمان ئەویش ئاین یا ئایدیۆلۆژیایەکی سیاسی دەبیَ کە هەمویان کۆکاتەوە ، لێرە بروا بەو گوتە بەناوبانگە بێنە کە دەڵیَ ( لە گەلەکەت ووشیار بە و لە سوپاکەشت هەزارجار).

**دیمەنی هەشتەم/ پیاوێکی نیان وباش بە تا دەگەیتە دەسەڵات**

لێرە واقعبینی مەدرەسەکەی مکیافیللی وەدەر دەکەویَ ، دەڵیَ لاری نیە پیاوێکی نیان وباش بیت لە کاتی هەولدانت بۆ گەیشتن بە دەسەلات ، بەلام کاتێک گەیشتیتە وێستگەی مەبەست و بەدەسەلات گەیشتیت، هیچ لاریەک نیە بۆ ئەوەی بگەرێیتەوە سەر نەریتە قەرس و چاو چنۆکیەکەی جارانت ، ئەمە تەنها ئەو کاتە ناگرێتەوە کە ئەگەر هەستت کرد دەسەلاتەکەت دەلەرزیَ .

**دیمەنی نۆیەم/ توند وتوش وستەمکار بە**

پەندی مکیافیللی لێرە ئەوەیە کە لە میانەی ئەزمونەکانی بۆی دەرکەوتوە کە خۆشەویستی بەهەوەستی مرۆڤ دەبیَ، بەلام ترس بە هەوەستی میرە.

**دیمەنی دەیەم/ یاری کردن بە یاسا**

ئەگەر بتەویَ دەسەلات لەدەست یەکیکی تر دەربێنی وبگریتەدەست خۆت، دەبیَ هێز بەکار بێنی ، بەلام بۆ ئەوەی حوکمرانی گەل بەکیت و ئەوانیش گوێرایەلت بن ، دەبیَ یاسا پیادە بکەیت، چ یاسایەک؟ ئەلبەت دەبیَ سولتان یاسایەک دارێژیَ کە لە بەرژەوەندیەکانی خۆیدا بن و وابکا بەم یاسایە گەل لەژێر فەرمانی ئەودا بن.

## دیمەنی یانزەهەم/ ڕێگەی گەیاندنی فەرمانەکان بە گەل

گەل لە نێوان زۆرینە وکەمینە دابەش بوە ، ئەگەر بتەوێ پرۆژەیەکی نوێ جێبەجێ بکەیت ، دەبێ بەخێرایی بخەیتە بەر چاوی زۆرینە وبریارێکی خێرای لەسەر وەرگری بەر لەوەی کەمینە دەست بخاتە ناوی و کارەکە بشێوێنێ و ئاژاوە بخولقێنێ، لای مکیافیللی لەروی پراگماتیزمیەوە گرنگ ئەوەیە بتوانرێ کۆنترۆلی بنکە جەماوەریە زۆرینەکە بکرێ ، نەک نوخبە کەمینەکە .

## دیمەنی دوانزەهەم/ پیلانگێڕەکان

لێرە مکیافیللی ناکۆکیەکانی نێوان هەردوو مەدرەسەی رەوشتگەر واقعبین و ئاشکەرا کرد ، لەم میانەشدا لە لایەنگری کردنی لایەنێکدا رارا بوو ، بەلام دوا جار لایەنگری مەدرەسەی رەوشتگەریەکانی کرد ، ئەمەش دژی زۆربەی نامە ونوسینەکانی دێتەوە کە دەیوت :
( ئەو میرەی خۆشەویستی گەل وەدەست دێنێ ، لە پیلانەکانیان دور دەبێ و مەترسیی لێیان نامێنێ )

## دیمەنی سیانزەهەم/ ناحەزەکان

سەیرکە لێرە مکیافیللی بەتوندی دەگەرێتەوە بۆ مەدرەسەی واقعبینەکان (ناحەزەکانت بەیەکجارەکی لەناو مەبە ، لەگەڵ هەندێکیان هاوپەیمانێتی ببەستەو ، هەندێکیشیان لەناو بەرە ، تا ئەوکاتەی وردە وردە هەمویان لەنا دەبەیت ).
لێرە ئەمەی لە مەدرەسەی رۆمانی وەرگرتوە ( ئەگەر بە یەکجار لەگەل هەموو دوژمنەکانت بجەنگیت ، ئەوکات هەمویان دژت یەکدەگرن و ، تەنگەتاوت دەکەن بۆیە دەبێ لەبەر یەکیان بەری و پارچە پارچەیان کەیت ، ئینجا وردە وردە لەناویان بەرە)

## دیمەنی چواردەهەم / دروست کردنی سەرکەوتن

هەندێک جار پێویستیت بە دەستکەوت هەیە ، ئەوکات دەبێ پرسێک بتەقێنیتەوە، بەمەرجێک لەوە دڵنیا بیت کە دەتوانی بەسەریدا زاڵ بیت ، ئەنجامەکەشی سەرکەوتن بێ ، بەر لە سەرکەوتن دەبێ نەخشەو پلانێکی توکمەت هەبێ کە بە مسۆگەری بتگەیەنێتە سەرکەوتن ، ئەو ئالیەت و ئامرازانەش دەستەبەر بکەیت بۆئەوەی سەرجەم گەل ئاهەنگی سەرکەوتنت لەگەڵدا بگێرێ .

## دیمەنی پانزەهەم/ قەلات لە ناو دڵی دوژمن دروستکە

لێرە سەیری ئەو ناکۆکیەی مکیافیللی کە لە نێوان مەدرەسەی واقعبینەکان ورەوشتگەرەکان ، مکیافیللی دژی قەلاو زێدە پێهەڵگوتنی پادشاکان بوە ، لەم روانگەیەوە دەڵێ:
( باشترین قەلات کە دروستی کەیت ، ئەو قەلاتەیە کە لەدڵی گەڵدا دروستی دەکەیت) . ئەمەش لوتکەی پەیرەوی رەوشتە ، مەبەستمان ئەوەیە ، ئەگەر کەسێک پەیرەوی بەرنامەی پراگماتی بکا گەل بڕوای پێناکا و خۆی بە لایەنگری نازانێ تا ئەو کاتەی ناچار دەبێ پەیرەوی بەرنامەی رەوشتگەراییەکان دەکا .

## دیمەنی شانزەهەم/ چۆن سەرکردە ناوبانگ پەیدادەکاو تواناکانی گەل بەفیرۆدەدا؟

ئەلبەت لەسەر فەرماندەیە ، پرۆژەی مەزن ئەنجام بدا ، ئەمەش گرنگ نیە ئەم پرۆژە چیە ئەگەر ڤیللا بێ یا کۆشک ، چونکە لە میانی دروست کردنی ئەم پرۆژانە گەل توشی شۆک و سەرسورمان دەبێ و بەم پرۆژانە سەرسامی دەیگرێ ، بەمەش بەسەر ئەقلیاندا زاڵ دەبی ، ئەوکات ئەوانیش هەر بە ئەنجامەکەیەوە خەریک دەبن ، هەر کە لەو پرۆژە تەواو بویت دەبێ خێراو بێ پسانەوە دەست

بکەیت بە پرۆژێکی تر ئەگەر بێ سودیش بێ ، بەم شێوەیە خەریکیان کە تا ئەو کاتەیان نەبێ بیر لە دەسەلاتی تۆ بکەنەوە .

**دیمەنی حەڤدەهەم/ پەندی رۆژگار**

لێرە ئەوەمان بۆ دەردەکەوێ کە مکیافیللی ئەمەی لە کەسێکی ئاسایی زۆرینەی گەلی عەرەب وەرگرتوە ، کاتێک دەڵێ :
( هەلەی کوشندەی مرۆڤ ئەوەیە ، لەوکاتانەی با هێمن ولەسەرەخۆیە ، حساب بۆ گەردەلول ناکەن)
کازم الحسن وای دەبینێ کە ئەوەی مکیافیللی وتویەتی ئەمە جەوهەری روالەتی سیاسیی زۆربەی سەردەمەکانە ، کابراش بۆ میرەکەی بێگەرد و دلسۆز بوە ، بۆیە جەخت دەکاتەوەو دەڵی :
لە کۆتایی پێداچونەوەی نامەکانی مکیافیللی دا، دەبێ لەگەڵتان راست گۆ بم و بڵێم ئەم نامانە ، زۆر ئاستەمە ئەمرۆ جێبەجێ بکرێن، جگە لە هەندێکی کەمیان نەبێ، ئەوانیش کۆمەلە کەسێکی گێل پێشرەوایەتیان دەکا ، چونکە حیکمەتی نامەکانی مکیافیللی ئەوەیە کە لەکاتی جێبەجێکردنی ئەو نامانەدا نابێ گەل پێی بزانێ کە ئەمانە دژی بەرژەوەندیەکانی ئەوانن ، واتە نەک وەکو هەندێکیان لەم سەردەمە لە هەندێک شوێن جێبەجێ دەکرێن ، وەکو گوتەیەکی قەتەری هەیە دەڵێ :
(ئەگەر گێلەکان خورمایان خوارد ، واتە گەلەکان خواردن ئامادە دەکەن).
سەبارەت بە دونیای هاوچەرخمان کە گەیشتۆتە ئاستی دوای دەولەتی نەتەوایەتی ، ئەم بەرنامەیە هەرگیز جێبەجێ ناکرێ تەنها بە پارچە کردنی نەبێ .

# سەرچاوەكان


1- نیكۆلۆ مكیافیللی، میر، وەرگێران و پێشەكیی ،خلیل حنا تادرس ، كتێبخانەی (النافذ،قاهره)
2- نیكۆلۆ مكیافیللی،(گوتارەكانی مكیافیللی)وەرگێرانی بۆ عەرەبی خیری حماده،بلاوكراوەكانی ئاسۆی نویَ ، بیروت،1982
3- نیكۆلۆ مكیافیللی ، مێژوی فلۆرەنسا ، دەقە ئەلكترۆنیەكە.
4- جەنەرال، فون كالوزفیتر، وەرگێرانی لە عەرەبیەوە ، سلیم شاكر ئیمامی، دەزگای عەرەبی بۆ دیراسات وبلاوكردنەوە،بیروت1977.
5- د.احمد ادریس الطمعان، شۆڕشی ئەقلی ئەوروپی،دیراسەیەكی بلاوكراوە لەسەر تۆری زانیاریی نێودەولەتی.
6- عبدالجبار خضیر عباس، كۆمەلگای مەدەنی دەستەواژەو دەركەوتنی جیهانیی، وتارێكە لەسەر تۆرەكانی زانیاریی نێودەولەتی.
7- د.سمیح شبیب، ئازادی ئاین و بروابون و ئازادی فكر، وتار لەسەر تۆرەكان.
8- كازم الحسن، ئایا مكیافیللی راستە شەیتانە؟ ووتار لەسەر تۆرەكان.
9- دلال بسما، مكیافیللی روخساری رێنسانسی هونەری شەر، گۆڤاری بەرگری نیشتمانیی ەئلەكترۆنی.
10- د.فهد عبدالتحمان ال الثانی، دۆسیەی رەش لە سیاسەت ، كتێبی ئەلەكترۆنی.
11- عصام عبدالله، ئاینی فەیلەسوفەكان، وتار لەسەر تۆرەكانی ئەنتەرنێت.

## یەکەی یەکەم

## لەسەر میرنشینە جێماوەکان

----------------------------

لەم بەشەدا قسەکانم لەسەر حکومەتە پادشاییەکان کورت دەکەمەوە، باس لەو ڕێگایانە دەکەم کە میر و پادشاکان بەهۆیەوە دەتوانن میلەتان بخەنە ژێر دەستی خۆیان و حوکمرانیان بکەن ، بۆ ئەم پرسە دەڵێم:

بۆ وەرگرتنی دەسەلاتی جێماو بۆ پادشاکان هیچ فرت وفێلێکی سیاسیی پێویست بە راهێنانی میللەت ناکا تا لەسەر حوکمی ئەم بنەماڵە رابێن ، چونکە وەرگرتنی دەسەلات لە باوکەوە بۆ کور یا لە براوە بۆ برا هیچ ئازایەتییەکی ناوێ تەنها ئەوەی پێویستە لاسایی کردنەوەی رابردوو لانەدان لەسەر ڕێچکەی پێشوو داب ونەریتەکانی گەرەکە ، دواتر دەبێ لەوپەری ئامادە باشیدا بیت بۆ هەر ئەگەرێکی کت و پر ، بەم دوو ڕێگایە ، میرئەگەر هەرچەندی لاوازیش بێ دەتوانێ حوکمرانی بکا و شانشینەکەشی بپارێزێ و بیبا بەرێوە ، ئەمە ئەگەر روداوێکی مەزندە نەکراو رونەدا ببێتە مایەی لەدەستدانی حوکمرانی، ئەمە هەموو کارەکەیە ، ئەگەر میر بەم شێوەیە ی کە باسمان کرد ئامادە باشیی هەبوو بە دڵنیایەوە ئەگەر دەسەلاتیشی لەدەست بچێ دەتوانێ بیگێڕێتەوە لەوکاتانەی دوژمنەکانی لە سربون یا تەمبەڵی دابون ، ئەم دەرفەتانەش ئەوەی بیەوێ و لە چاوەروانییدابێ زۆرن دەتوانێ بیان قۆزێتەوە .

بۆ سەلماندنی ئەم راستیەمان میرنشینی (فرارە) بە شایەدییێکی مێژویی دەهێنینەوە ، لە ساڵی 1484 خەلکی بوندقیە بەرگریان لە شارەکەی خۆیان کرد، دواتر پاپا یولیوسی دووەمیش لە 1510 بەرگریی کرد ، لەم تەنگەشەیەدا تەنها خانەوادەکەی قۆلیان لێ هەلمالی بوو وەکو باپیرە دێرینەکانی ، ئازار پێنەگەیشتنیان نیشانەی خۆشەویستی گەلەکەیان بوو بۆیان ، ئەمە پەیوەندیی بە ئامانجەکانی کۆشکی پادشاوە هەبوو ، ئەم بەرگریە بۆ کەسانێک دەکرێ کە دور بن لە خەسلەتەکانی گەندەلی وخەراپی واتە پاک وبێگەرد بن، بە دوریشی نازانین کە ئەو خەلکە سڤیلە ئەو خەراپییانەی رابردوو کە لە سەردەمی پادشای پێشتر لەگەڵیان کراوە ، لەبیری بکەن، چونکە ئەوان لەسەردەمی پادشایەکی باش و نیاندا دەژین، لەو خەراپەکاریانە وەکو ، مال زەوت کردن ، دارشتنی یاسای زالمانە و چەندین جۆرە

خەراپەکاریی تر کە ماوەیەکی زۆریان بەسەردا تێپەریوەو زامی برینەکان ووشک بونەتەوە .
ئەگەر میرێک بیەوێ بە خۆشەویستی بمێنێتەوە دەبێ خۆی لە گۆرینی کۆن دورخاتەوەو دەستیان پێوە بگرێ .ئەگەر ئەو کۆنە چەندی بێ کەلکیش بێ ، چونکە ئەو خەلکە ئەوە دەزانن کە گۆرینی بەشێک، رێخۆشکەر دەبێ بۆ گۆرینی زۆر ، ئەمەش دەبێتە مایەی تورە بونی ئەو خەلکە .

**یەکەی دووەم/**
**لەسەر میرنشینەکانی تێکەڵاو**

لە یەکەی پێشوودا باسم لە ئاسانی حوکمرانی پادشانشینە کۆنەکاندا کرد ، ئێستاش باسی سەخت و قورسی حوکمرانی پادشانشینە نوێکان دەکەم ، سەرەتاش نمونە بەو ویلایەتانە دێنمەوە کە کاتی خۆی بەشێک بون لە دەسەلاتدارێتی مەزن ، ئەم ویلایەتانە زیاتر هەستیان بە ستەم و زۆرداری حاکمەکانیان کردوە ، هەوڵی لابردنیان داوە ئەگەر دوای ئەوان هەر حوکمێکی تر بێت گرنگ نەبێت لای ئەوان ، ئەگەر دوای ئەو پادشایە پادشایەکی تر بێت ، خۆشحال دەبون وبەخێرهاتنیان دەکرد ، بەهیوای ئەوەی لەو باشتر بێ و ئەوەی ئەو تێکی داوە ئەمیان چاکی کاتەوە ، لەوانە ستەم وزۆرداری نەیەلێ، خەراپەکاریەکان راست وچاککاتەوە ، چونکە ئەو ئومێدانەن کە وا لەو خەلکە دەکەن شمشێر بەروی پادشاکانیان راست کەنەوە و هەوڵی لادانیان بدەن ، لە رێگەی هەڵگیرساندنی شۆرش ، بەلام گەلێک جار هەندێک لە چاوچنۆکان ئەم خەلکە دەستە رۆدەکەن ولە راستیەکانیان دوردەخەنەوە بە چەواشەکردنیان، لە ئەنجامدا لە جیات گەل ئەوان دەست بەسەر خێر و بێری ولاتدا دەگرن و خاکی داگیر دەکەن ، ئەم راستیە لە گەلێک لە ویلایەتەکان سەلمێندراوە کە لە جیات چاک خەراپتر کراوەو ئاوی زیاتریان کردۆتەسەر قورەکە .
دواتر ئەو دۆخە گەندەلیەی سەردەمی پادشا خۆسەپێنەکە ئەنجامێکی ئاسایی و پێشەکیی داهاتوێکی خەراپترە. چونکە ئەوەی خۆی دەسەپێنێ ناتوانی پەیوەندیەکی

باش لە نێوان هاولاتیە مولک لێ زەوتکراوەکان لەلایەک و حکومەت و سوپاکەی لەلایەکدا دروست بکا . هەروەها ناتوانێ لە روداوو کارەساتەکانیان رزگاری بکا ئەوانەی لە ئەنجامی پیادەکردنی ئەو دەسەلاتەوە روو دەدەن.
پێویست بە رونکردنەوەو ئاماژە ناکات کە هەلوێستی خۆسەپێنەکە هەرچەندی دادپەروەرانە و بەهۆی سوپاکەیەوە بەهێز بێت ، هەردەم هەلوێستێکی لەرزۆک و لاوازە ، چونکە خەلکە زۆرلێکراوەکە هەردەم لە هەلوێستی دوژمنکارانەدا دەبن بەهۆی ئەوەی مافیان لێ زەوت کراوە ، ئەمەو دەسەلاتی خۆسەپێن ناتوانێ دلسۆزی خۆفرۆشانیش بەدەست بێنێ ، چوونکە هەرچەندی بیانداتێ ناتوانێ رەزامەندیان وەرگرێ و لەهەمان کاتیشدا ناتوانێ لەگەڵیاندا توند و بە هەرەشە بێ چونکە ئەو خۆی بە قەرزاری ئەوان دەزانێ ، ئەگەر پارەو پولی زۆریشیان پێدابێ .کەواتە هیچ کاتێک کارەکەی بۆ مەیسەر نابی ئەگەر لەگەل خاوەن ماڵ باش و دادپەروەر و خۆشگوزەر نەبێ .
دەبا نمونەیەک بێنینەوە : لویسی دوانزەهەم کە بە سوپاو سامان و سەروەتەکەی توانیی میلانو داگیر بکا ، بەلام نەیتوانی بۆ ماوەیەکی دور بیپارێزێ ، نە بەهۆی لاوازی سەربازی و هێزەکانی ونە بەهۆی کەم دەرامەتیەوە بوو ، بەلکو لەبەر ئەوەی ئەو چاوەروانیەی خەلکی میلانو لە لویسی دوانزەهەمیان دەکرد وا دەرنەچوو بۆیان نەبوە مایەی خێرو خۆشی ، لە خەراپەو کاولکاری بەولاوە هیچی تری بەدوای خۆیدا نەهێنا بۆیە رقیان لیی بۆوەوە بە ئاسانی خۆیان رادەستی میر ردویچ دی سفورزا کرد و فەرماندایەتیان دایە دەست ئەو .
دیارە کاتێک کەسێک ولاتێک رزگار دەکاو دواتر لەلایەن کەسانی ترەوە داگیر دەکرێ ، ئەمجارەیان ئەگەربۆ جاری دوەم رزگار کرایەوە، هەرگیزاو هەرگیز لەدەست نادرێ و هاولاتیانی ئەو ولاتە رزگاربوە سۆز ودلسۆزیان بۆی دەبێ و پشتگیریی لێ دەکەن ، بەهۆی ئەوەی لە دەست داگیرکار خێریان نەبینی وبە رژێمی یەکەم دلخۆشتر بون ، لەم شۆڕشەش فێری دەرسی نوێ دەبن. پاش ئەوە ئیتر ولاتە روخاوەکە یەک لەم دوو رێگایە دەگرێتە بەر:

یەکەم / سزای ئەو کەسانە دەدات کە ئاژاوەو گێرەشێوێنی دەخولقێنن .
دووەم/ خالە لاوازەکانی حکومەت دەست نیشان دەکاو چارەسەریان بۆ دەدۆزێتەوە، لەم میانە هیچ بەربەست و دوژمنێکی ناوەخۆ وەکو جارانی بەر لە رزگاری نایەتە پێش ، بۆیە وەکو پێویست دەتوانێ هەنگاوەکان بهاوێژێ ، ئەوەی ئەم بیردۆزە پشتراست دەکاتەوە رزگارکردنی میلانو بوو ، هەر بە وەدەر کەوتنی

نیشانەکانی سوپا و راگەیاندنەکانی میر لودیچ لەسەر سنورەکان ، میلانو لەدەست فرەنسیەکان رزگارکرا ، ئەمە لە یەکەم رزگاری بوو ، لە خولی دوەمی رزگاری ، نەتوانرا میلانۆ لەدەست فرەنسا دەر بهێندرێ تا ئەو کاتەی ولاتانی ئەوروپا یەکیان نەگرت . هەرچەندە ئەم یەکگرتنەی ئەووپا ورەی فرەنسای دانەبەزاند، بەلام میرەکانی گێژو سەرقاڵ کردن و ناچاری کردن لە ئیتالیا رابکەن ، بەهۆیەوە سەرتاپای ئیتالیایان جێهێشت بە میلانۆشەوە، ئەم سەرکەوتنە لە ئەنجامی پیادەکردنی سیاسەتی دووەمەوە بوو ، ئەو سیاسەتەی خاڵە لاوازەکانی حکومەت بەهێز دەکا ، جا سەردەمی حوکمرانیی فرەنسا لە میلانۆ ئەگەر درێژی خایاندبێ یا کورت گرنگ ئەوەیە تا هەتایە نەمایەوە ، دەبێ هۆکارەکانی لەدەست دانی دوەمی میلانۆ لەدەست فرەنسا باس بکەین ، هەروەکو هۆکاری لەدەست دانی یەکەممان باس کرد دەبێ هی دوەمیش رونکردنەوە بدەین ، ئێستا ئەو هۆکارو پیویستیانە باس دەکەین کە دەبوایە فرەنسا ئەنجامیان بدا بۆئەوەی بتوانێ میلانۆی لەدەست نەچێ ، کە ئەگەر پادشایەکی تر لە شوێنیان بوایە چی دەکرد .
ئاساییە هەردەولەتێک کە رزگار دەکرێ لەگەڵ دەولەتی کە هاوکاریی کردوە بۆ رزگار بون لە روی رەگەز یا زمان هەر لەیەکچونێکی تر لەیەک دەچن، بەلکو ئەم لەیەکچونەشیان نەبێ ، ئەگەر پاساوی داگیرکردن لەیەکچونی زمان بێ ئەوا داگیرکردن کارێکی ئاسان دەبوو ، بەتایبەت ئەگەر خەلکەکەی پێیان خۆشبێ هاورەگەزەکانیان رزگار بکەن ، بۆ دەستگرتن بەسەر ولاتێک یا رزگار کردنی ، لەناو بردنی دەسەلاتی پادشای ولاتە داگیرکراوەکە یەکەم مەبەستە ، چونکە ئەوانیتر وەکو خۆیان دەمێیننەوە تەنها ئەوەی دەگۆردرێ لەناوچونی دەسەلاتی پادشکەیە، نە رەوشتەکان دەگۆردرێن نە داب ونەریتەکان ، بەم شێوە خەلکەکە لەگەل پادشا نوێکە رادێن ، بەنمونە :
ولایەتەکانی برجاندیە ، بریتانیە ، جاسکۆنیە ، تورماندیە . ئەمانە ئەو ولایەتانە بون کە فرەنسا دەستی بەسەردا گرتن و خستنیە ژێر حوکمرانی خۆی ، ماوەیەکی زۆر لەگەل خۆیدا یەکخستن و بەیەکەوە بە ئاشتی وئارامی دەژیان ، ئاشکەرایە رەوشتی ئەو ولایەتانەی ئاماژەمان پێیاندا لە رەوشتی فرەنسیەکان دەچی ، تەنها زمان نەبێ ئەگینا هیچ جیاوازیەک لە نێوان کۆمەلگای ئەوان و کۆمەلگای فرەنسیەکاندا نیە ، تەنانەت هەندێک لەیەکچونی کەمیش لە دیالەکتیکە کانیاندا هەیە ، فرەنسا بەو دوو رێگایەی باسمان لێوە کرد حوکمی ئەو ویلایەتانەی دەکرد ، سەرەتا خانەوادەی پادشایەتیانی لە ناوبرد ئینجا دواتر یاساو رێنماکانی وەکو خۆی

هێشتنەوە و لەسەری رۆیشت ، تا ماوەیەکی زۆر باجەکانی زیاد نەکردن تا توانیی هەمویان لە یەک ویلایەت کۆبکاتەوە .
بەلام ئەگەر ویلایەتە داگیرکراوەکە جیاوازیی زمان ورەوشت و یاسا هەبوایە لەگەل ولایەتە داگیرکارەکە ، ئەو کات کارەکان ئاسان نەدەبون ، حوکمرانیە رەهاییەکە کارێکی قورس دەبو ، چونکە داگیرکار ئەوکات پێویستی بە بەختێکی باش و کاری زیاتر دەبوو تا بتوانێ ولایەتەکان لەدەست خۆی بپارێزێ ، باشترین رێگەش بۆ مانەوەی داگیرکار ئەوەیە کە بۆ ولایەتە نوێکان بگوازێتەوە و لە ناویاندا بژێ، چونکە لەوێ دەتوانێ پێگەی خۆی بەهێزکا ودەسەلاتەکانی داکوتێ ، دەبا بۆ ئەم رەوشە نمونەیەکی تورکەکان لە ولاتی گریک بهێنینەوە ، تورکەکان هەر رێگایەکیان بەکار بهێنابایە تێیدا سەرکەوتو نەدەبون کە بتوانن ولایەتی گریکەکان بە داگیرکراوی بهێلنەوە ئەگەر خۆیان لەوێ لەگەل خەلکەکە نیشتەجێ نەبونایەو بارگەیان لێێ نەخستبایە .
سودەکانی ئەم سیاسەتە گەلێک زۆرن:
بە مانەوەی داگیرکار لەو ولایەتە هەردەم لەبەر چاوی خەلکەکە دەبێ ، بۆیە خۆیان لە تورەو تۆلەی ئەو دەپارێزن ، بەهۆیەوە تابتوانن لە هێلی راست لانادەن ، چونکە ئەگەر ئەوانی جێهێشت وولایەتەکەی رادەست ئەوان کرد ئەوا بە دلنیاییەوە دەست دەکەن بە خەراپەکاری وگەندەلی و تێکدانی یاساو سیستەمی حوکمران ، ئیتر ئەم رەفتارە دەبێتە مایەی گوێنەدانە فەرمانەکانی داگیرکار و پێشێلکاری .
لەوانە : دواتر ولاتە دراوسێکانیتر زاتی ئەوە ناکەن ولاتە داگیرکراوەکە دوبارە داگیری کەن ، لە ترسی داگیرکاری یەکەم چونکە سوپاکەی لەو ناوە بونیان هەیە ، باشترە لە دەروازەی ویلایەتە داگیرکراوەکەو دەرگای چونەدەری ، چەند ئۆردوگایەکی بێگانەکان دروست بکا ، ئەگینا دەبێ سوپا لە ناوەوەی ویلایەتەکان بەکار بێنێ .
ئەمە زانایەک بوو ئاماژەی بە دروست کردنی ئۆردوگای بێگانەکان دا لە دەروازەی ویلایەتەکان ، ئەمەش بە دەستگرتن بەسەر کەمێک لە روبەری زەویی خەلکی ویلایەتە داگیرکراوەکەو دابەشکردنی بەسەر بێگانەکاندا دەکرێ ، بەهۆی ئەوەی خەلکی ویلایەتە داگیرکراوەکە کە زەویان لێ زەوت دەکرێ ، لاواز وبێ دەسەلاتن ، لەترسی هێزی داگیرکار ناتوانن ئازاری خەلکە بێگانەکە بدەن ، دواتر ئەم کەمینەی زەویان لێ داگیرکراوە ناتوانن هەستی خەلکە زۆرینەکەی تر کە بێگانەکانن ببزوێنن وتورەییان بوروژێنن ، چونکە زۆرینە زەویان لێ زەوت نەکراوە ، بۆیە پرۆسەو پیلانەکە بە ئاسانی ئەنجام دەدرێ ، خۆئەگەر کەمینە

زەوی لێ زەوتکراوەکە بیتوانیایە زۆرینەکە هەلسێنێتە سەرپێ و بیانخاتە سەرهێل ئەوسا کاری حوکمرانیەکە ئاسان نەدەبوو .
ئەم سیاسەتە سودێکی تریشی هەیە :
زۆرینەی خەلکی ویلایەتە داگیرکراوەکە لە حالەتی ترس دا دەمێننەوە ، هەردەم ترسی ئەوەیان دەبێ کە ئەوەی بەسەر هاولاتیانیاندا هاتوە بەسەر ئەوانیشدا بێ لە دەستگرتن بەسەر زەوی وزولمی تریش ،بۆیە بە ئارامی وبێدەنگی دەمێننەوە وبە بەشەکەی خۆیان رازی دەبن .
سودی ئەو ئۆردوگایانەش جگە لەوەی باسمانکرد ، لەسەر داگیرکار شتێکی ئاوەها ناوەستێ ، خەلکەکەشی بۆ داگیرکار دلسۆزتر دەبن ، دواتر داگیرکار لە شەری ئەوان دور دەبێ چونکە پەرتەوازەو بێ سەرن .
لێرە دەمەوێ سەرنجی خوێنەر بۆ بنەمایەکی سیاسی رابکێشم ، ئەویش ئەوەیە ، ئەگەر بتەوێ خۆت لە کەسێک ئاسودە کەیت، یەکێک لەم دوو رێگایە بگرە بەر:
1- ماستاوی بۆ ساردکەوەو چاکەی لەگەلْدا بکە .
2- هەناسە بری بکە ، لێی بێخەم دەبی.
رەوشتی مرۆڤ ئاوەها خولقاوە ، سەربە یەکێک لەم دوو جەمسەرەیە . هەردەم هەولْی ئەوە دەدەن تۆلە لەو دوژمنەیان بکەنەوە کە ئازاری پێگەیاندون ، بەلام کاتێک ناتوانن ئازار بگەیەننە خودی دوژمنە راستەقینەکە ، باشتر وایە رق و کینەی ئاراستە بکا.
دامەزراندنی ئۆردوگای نیشتەجێ باشترە لە دامەزراندنی سەربازگە ، چونکە دامەزراندنی سەربازگە لەروی ئابوریەوە لەسەر دەولەت زۆر دەکەوێ پیویستیی بە پێداویستیی لۆجستیک و حەوانەوەی زۆر هەیە ، جگە لەمە مانەوەی سەرباز لەبەر چاوی خەلکی ویلایەتە داگیرکراوەکە دەبێتە مایەی دروست بونی کینە ودوژمنایەتی ، چونکە بە چاوێکی رقەوە سەیری سەربازی داگیرکار دەکرێ، نەزان ئەو کەسەیە کە ترسی لە دوژمن نیە لەو کاتەی بە ئارامی لە بنکەکانیان دانیشتون . کورتەی باسەکان ئەوەیە :
(ئۆردوگاکان پر بەسودن و سەربازگەکانیش زیان بەخشن) .
دەبێ داگیرکەر خۆی بە سەرۆک وفەرماندەی دراوسێکانی بزانێ و وەکو بەرگریکارێکی بەهێز خۆی نیشان بدا ، دوو خالْی گرنگیش لەبەرچاو بگرێ :
1- ئەوەی پێشتر بەهێز بوو ، لاوازی بکا .
2- دەرگای ویلایەتەکەی بە روی بێگانە بەهێزەکاندا دابخا ، چونکە هەردەم ویلایەتە زولم لێکراوەکان پەنا بۆ ویلایەتە بەهێزەکان دەبەن تا نەجاتیان بدا

، ئەوکاتیش دراوسێ بەهێزەکان هەر زوو بە پیر داخوازیەکانیانەوە دەچن ، جا یا لە ترسی ئەوەی داگیرکاریەکە ئەوانیش بگرێتەوە یا لە چاو تێبرین لە سامان و سەروەتەکەیان دایە .
دەبانمونەیەکتان بۆ بێنمەوە  لەسەر رۆمانەکان کاتێک ئەتیلیەکان پەنایان بۆ بردن تا لە دەست داگیرکاری گریکەکانیان رزگار بکا ، هەرکاتەی یەکێک لە ویلایەتە داگیرکراوەکان پەنایان بۆ دەبرد وداوای هاوکاریان لێ دەکرد ئەم بە پیر داخوازیەکانیانەوە دەچوو دەیخستنە ژێر دەستی خۆی .
 دەبا داگیرکەرە بەهێزەکان بزانن هەرکاتەی ولاتێکی نوێیان داگیر کرد ، خانەدان وجوامێرە لاوازەکان زوو لایەنگریی دەکەن و هاوکاریی دەکەن ، نەک لەبەر ئەوەی حەزیان لە خیانەتکردنی نیشتمانە ، بەلکو وەکو تۆلەکردنەوەیەک لە رژێم ودەسەلاتدارانی پێشو کە لە سەردەمی ئەوان دەسەلاتیان لێ سسەندرابۆوەو لاواز کرابون ، بەلام دەبێ داگیرکەر لەم جۆرە کەسانە ووشیار بێ ، چونکە هەرکاتەی بەهێز کەوتن و لە توانای خۆیانرا بینی بتوانن تۆلە لە داگیرکەر بسەننەوە بێ سلەمین ئەنجامی دەدەن ، ئەگەر لەگەلیان باش رەفتار بوو دلیانی راکێش کرد بە چاکەو لاواز کردنی دەسەلاتدارانی پێشو ئەوا دەتوانێ زیاتر لەوەی کە دڵی بۆ دەچێ بیخوا و سودی لێ وەربگرێ ، ئەگەر وانەکا ئەوەی بە ساڵێک قازانجی کردوە بە ماوەیەکی کورت لەدەستی دەدا.
 رۆمەکان ئەو سیاسەتەیان پیادە دەکرد ، هەرکاتەی ویلایەتێکی نوێیان داگیر دەکرد ئۆردوگای نوێیان لێ دروست دەکردن  و خۆیان سەرپەرشتیان دەکردن، لەگەڵیان بە چاکە هەڵس و کەوتیان دەکرد بێ ئەوەی بەهێزیان بکا ، پەرو باڵی دەسەلاتدارە بەهێزەکانیان  لە پادشا ومیرەکان دەکردن ، و لەروی ئەوانیش بە چاکەو دلسۆزی رەفتاریان دەکرد ، وردەکاری ئەم  سیاسەتە لە ولاتی گریک زۆرن :
 کاتێک رۆمەکان ئەو ولاتانەیان رزگار کرد ( ئاتای وئیتیلی) یان خۆش ویستن و پادشاکانی مەکەدۆنیشیان لە ناو بردن ، ئەنتۆکیۆسیشیان دور خستەوە ، فلیبس تا لاواز نەکرا دۆستایەتیی ئەوانی وەدەست نەهێنا ، هەروەها رێگەیان بە ئەنتیوکس نەدا بگەرێتەوە ولاتی گریک ، ئەوکاتەی پیادە کردنی ئەم سیاسەتە سەرکەوتن بەدەست دێنێ ئەوسا رۆمانەکان شانازیان بە سیاسەتەکەی خۆیانەوە کرد کە سیاسەتی دەسەلاتدارو پادشاو میر وزاناکانیان بوو ، ئەوان تەنها گرنگیان بە حالی حازر نەدەدا ، بەلکو گرنگیان بە داهاتوش دەدا ،

بەرنامەی مکوم یان بۆ دادەرێشت بۆ ئەوەی لە خەراپەو شکست بەدور بن ، چونکە ئەگەر مرۆڤ حسابی بۆ کارەسات ونەهامەتیەکان کرد لە شکست و خەراپە دوردەکەوێتەوە ، بەلام ئەگەر سەبری گرت تا ئەوکاتەی دەرگای لێگیرا، بەلکو ئەوکات هیچ رێگەچارەی بۆ چارەسەریەکان نەبێ ، ئەمەش وەکو ئەو تایە وایە کە دکتۆرەکان ناتوانن پێشتر درکی پێبکەن و خۆپاراستنی بۆ ئەنجام بدەن تا رونەدا . بەلام ئەگەر بە ئاسانی ئاشکەرا کراو لە پێشهاتەکانی بە ئاگا بوو ئەوکات دەتوانرێ چارەسەریی بۆ بدۆزرێتەوەو خۆی لێ بپارێزێ .
ئەم حساب کردنەو هەست کردن بە داهاتوە هەموو کەسێک ناتوانێ ، تەنها کەسە زانا و بسپۆرەکان نەبن ، زۆرجار کەسێک بە هۆی زیرەکی ولێزانییەوە توانیویەتی میلەتەکەی لە کارەساتێکی مەزن دوربخاتەوە ، بەلام ئەگەر لە سەرلوتکەی سیاسەت کەسانی زانا نەبون وەکو ئەوەی باسمان لێیانەوە کرد ، بەدوری مەزانە وولات بکەوێتە تەلەیەکی مەزن وکوشندەوە .
دەولەتی رۆمان کاتێک دروست بوو کەسانی زانا وسیاسەت مەداری لە پشت بوو ، ئەوەتا وێرای دروست بونی گەشەی سەند وپەرەی سەند بوو ، ئەمە بە کەسانێک کرا کە دەیان بەلکو سەدان حساب وگریمانیان بۆ داهاتوو هەبوو، هەردەم خۆیان لەو کارەسات وترازانە سیاسیانە دەپاراست ، ترسیان لە هیچ شەرێک نەبوو کە روبەروی سیاسەتەکانیان بوەستێتەوە ، چونکە ئەوەیان دەزانی کە سیاسەت وجەنگ جمکی(دوانە) یەکترن ، هەرکەسەی بیەوێ لە یەکیان بەسەر کەوێ ، بە دلنیاییەوە لە دوەمیشیان سەردەکەوێ ،بەلکو دواخستنی شەر لە قازانجی دوژمن دابێ ، خۆی بۆ ئامادە دەکا ، ئەو ئامادە باشیە دەکا کە بە خواستی رۆمانەکان نیە ، بۆیە شەریان دژی فلیپس وئەنتۆکیوس لە ولاتی گریک راگەیاند، ئەم راگەیاندنە بۆ ئەوە بوو شەرەکە لە ئیتالیا دورخەنەوە ، چونکە سیاسەت مەدارانی رۆمانیەکان بەهۆی زیرەکی وشارەزاییان لە فاکتەرەکانی جەنگ ، دلنیابون لە سەرکەوتنی ئەم جەنگە بۆیە باکیان لەو شەرە نەبوو ، بەم هۆیەوە ئەوان دەیان بینی کە ( ناخۆشیەکان ئاوەژو بونەتەوە وئەمرۆش رێگە بۆ سەرکەوتنەکانی بەیانی خۆش ناکا )
دەبا بێینەوە فرەنسا ، ئاخۆ ئەوانیش هەمان پلانی رۆمانیەکانیان پیادە کرد ؟ سیاسەت مەدارو پادشاکانیان هەمان بەرنامەو سیاسەتیان هەبوو ؟ دەبا نمونە لەسەر لویش بێنین ، ئەو هۆکاری ئەوە بوو تەمەنی بەریتانیەکانی ئەوەند ەدرێژ کرد ، ئەومان بۆیە هەلبژارد چونکە بە پێچەوانەی ئەو سیاسەتە بوو ، ئەمەش ئاشکەرایە کە خەلکی بوندقیە پەنایان بۆ پادشا لویس برد تا بە هانایانەوە بچێ ،

لەسەر ئەوە ڕێککەوتبون کە ویلایەتی لومبارديا لە نێوان خۆياندا بە نيوە کەن ، من هيچ ڕاستيەک لە خۆ بە خاوەنکردنەکە نابينم ، چونکە نيازی وابوو پێگەی فرەنسا لە ئيتاليا قايم بکا، ئەمە لە کاتێکا خەڵکی ئەو ويلايەتە ڕقيان لە پادشاکەی پێش ئەو بوو ، کەواتە هيچ گلەييەک لە لويس ناکرێ کاتێک بە هانای بوندقيەوە دەچێ ، بە ديدی ئەو لەم حالەتەدا هەردوو لايەنی بوندقيەو فرەنسا لەم مامەڵەيە سودمەند دەبن ئەگەر لويس لەسەر سياسەتەکەی بەردەوام بێ .

ئەگەر ئەو هەڵە سياسيانەی نەکردبايە ، لەخۆی تێک نەدەداو لە ئيتاليا سەرکەوتنێکی باشی بەدەست دەهێنا . کاتێک کارەکان بۆ لويس لە لومبارديا مەيسەر دەبن، لە ماوەيەکی کورتدا ئەوەی لە سەردەمی پێشو لە فرەنسا لەدەستی دابوو توانيی بيگێڕێتەوە ، لەم ڕووەوە دەرفەتێکی باشی بۆ ڕە خسا کە هەندێک لە نيازپاکەکانی فلۆرەنسا بۆی هاتن وهاوکاريان کرد ، لەوانە مارکيزمانتوو ميرەکانی ميرنشينی ، فرارە ، بنتفولجی ، فاينزە ، بيتزارو ريمنی و خەڵکی ميرنشينی لوقە و دانيشتوانی بيزەو سينە، کاتێک خەڵکی بوندقيە بەمە دەزانن ، لە هەڵوێستەکانيان پەشيمان دەبنەوە چونکە ڕاستيەکانيان بۆ دەردەکەوێ . هيچيان پێ نامێنێ تەنها ئەوە نەبێ گلەيی لە خۆيان بکەن ، چونکە بەهۆی ئەوەی چاويان لە داگير کردنی بەشێک لە خاکی لۆمارديا بوو ، پادشای فرەنسا توانيی سێيەشی خاکی ئيتاليا داگير باکا.

ئەگەر لويس پادشا لەسەر هەمان سياسەت و ڕێچکەی پادشاکانی ڕۆمانی بچوبايە ، زۆر بە ئاسانی دەيتوانی دەست بگرێ بەسەر ئەو ويلايەتانە ، هەروەکو پێشتر لەم بەشەی نوسينماندا ئاماژەمان پێيدا بەهۆی لاوازی هەندێک لەو ويلايەتانەی بوندقيە پەنايان بردبوە بەر يەکتر بۆئەوەی يەکتر لە مەترسيەکان بپارێزن ، هەندێکی تريش پەنايان بۆ کەليسا بردبوو ، واتە قەبولکردنی هاوکاريەکانی ويلايەتە لاوازەکان باشترە لە وەرگرتنی هاوکاريی ويلايەتە بەهێزەکان ، بەلام لويس سياسەتەکانی تێکەڵ بە يەکتری کردن ، خۆی توشی گێرەشێوێنی وئاراستەيەکی هەڵە کرد ، لەوە نەدەچو کارەکانی لە ميلانو بۆ مەيسەر بێ، بۆيە پەنای بۆ پاپا ئەسکەندەر برد تا هاوکاريی بکا لە داگير کردنی ڕومانە ، کەچی لويس هەستی بەو هەڵە مەزنە نەکرد کە بوە مايەی هەژاندنی ستونەکانی حوکمرانيی ، ئەوەندەی نەمابوو ديواری سياسەتەکانی بروخێ ، چونکە کاتێک بە هاوکاری پاپا ويلايەتێک داگير دەکا ، لەوسەر ويلايەتێکی تری هاوپەيمان لەدەست دەدا ، لە هاوکاری کردنی پاپا هيچ دودڵی

نەنواند بەلام ویلایەتەکانی تر لێی کەوتنە گومان ومتمانەیان پێی نەما ، ئەوان مەترسی ئەوەیان لێ نیشتەوە کە ئەوەی بەسەر رومانەی هێنا بەسەر ئەوانیش بێنێ ، هەروەها بەم هەنگاوەی کەلیسا فشارەکانی توندتر کردن و دڕکەکانی ئاینیش تیژتر بون و دەسەلاتەکان گەیشتنە نێو دەسەلاتی ئاینی .

کاتێک لویس ئەم فاولە مەزنە دەکا ، مانەوەی لەسەر ئەم هەلەیدا هیچ سودی نامێنێ ، بەردەوام بونی زیان بەخشە ، بەلام ئەوکاتەی دەسەلاتەکانی پاپا دەگەنە توسکانا ، لەوە دەگا کە مەینەت وئازارەکان روەو زیاد بون دەچن و بەمەش ناوەستن ، بەلکو لەناوی دەبا ! بۆیە رادەکا بۆ ئیتالیا ، بەلام هەرچەندی بە ئاگا دەبێ سودی نابێ، چونکە کاتەکە بەسەر چوبوو لەوەدا نەمابوو بتوانێ کۆنترۆلی بکا ، کورتیەکەی ئەوەیە کە سیاسەتە هەلەکانی جاری یەکەمی کە لە ئەنجامی لاوازیی هاتە رێی ، بەتایبەتیش دوای ئەوەی دۆست و هەڤالانی خیانەتی لەگەڵ دەکەن ویشتی تێدەکەن و لە پەیمانەکانیان پاشگەز دەبنەوەو دەستی لێ هەڵدەگرن، دەبێتە مایەی ئەوەی کەلیسا لە پەرش و بلاویی هەڵسێتەوە سەرپێ ، ئیتر ئەو بوە خاوەنی چارەسەریەکان دور لە ویستی ناحەزانی ،بەلام لویس ویستی پادشا نشینی ناپۆلی وەدەست بێنێ بۆیە لەگەڵ پادشای ئیسپانیا یەکیان گرت و سامانەکانیان دابەش سەر خۆیان کردن ،ئەمە دوای ئەوە دێ کە پێشتر لە ئیتالیا خۆی تاقە پادشاو خاوەن دەبێ ئەمجارەیان هاوبەشێکی بۆ پەیدا دەبێ لە ئەنجامی سیاسەتە هەلەکانی .

سیاسەتە هەلەکانی بەسەر خۆیدا شکانەوە چونەکە تەماحکارەکانی خەلکی ناپۆلی ، ئەوانەی لە سیاسەتە تاکرەویەکانی پادشا زیان لێکەوتو بوون، یەکێکی ترینا لە جیات ئەو بینیەوە کە لە کاتی تەنگانە بە هانایانەوە بێ ، لویس قەناعەتی بە هاوپەیمانە لاوازەکەی نەهات کە هەردەم دەتوانێ بۆ هەر فەرمانێک ناچاری بکا ،بۆیە لە پادشایەتیی دور دەخاتەوە ، پادشایەکی بەهێزی لە شوێن دادەنێ ، ئەم بەهێزەش توانیی بەسەر دەسەلاتەکانی لویسدا زاڵ بێ و لە رەگ وریشە هەڵی تەکاندو لە شوێن ئەو خۆی سەپاند.

من ئەمە دەڵێم کە لۆمەیی لەو پادشایانە ناکەم کە چاویان بریوەتە داگیر کردنی ویلایەتەکان ،چونکە خەسلەتی چاوتێبرین وتەمەلک و تەماحکاری و زاڵ بون لە ناخی هەموو میرێکدا جێی خۆی گرتوە ، خەریکە منیش ستایشی هەموو ئەو پادشاو میرانە بکەم کە نیازی داگیرکردنیان هەیەو لە رەفتارەکانیان باش دەجولێنەوە، بەلام ئەوەی دەیەوێ بە رێگەی سیاسەتەوە وولاتێکی هەبێ وداگیری بکا ئەو کەس بە هەلە داچوە و حەز وئارەزوەکانی بون بە پادشا تیا

دەچن ، ئەو جۆرە کەسانە شایانی ئەو لۆمەییانەن چونکە ئەوان لە خۆ بایی ببون ، لویس پادشا لەو جۆرە کەسانە بوو ، چونکە زۆر چاوچنۆک و کەم زانیاری ونەشارەزا بوو ، بۆئەو زۆر باش بوو ئەگەر ئەوکاتەی فرەنسای بینی بەلاوازی و ناتوانیٚ پادشانشینی ناپۆلی بپارێزێ بۆ ئەو باشتر بوو دەست لەو نیازانە هەڵگرێ ،نەک هەندێکی تریش بەشداری پێ بکا، بەتایبەت ئەوکەسانەی نەیان توانی بوندقیەی بۆ دەست بەسەردا بگرن، ئەمجارە بەشداریان پێ بکا لە لومبارديا. چونکە هەر ئەو کۆمارە بوو کە بانگێشتی ئیتالیای کرد ، بەبێ هیچ پاساوێک بەشداری بەم کەسانە دەکا لە داگیر کردنی ویلایەتەکانی تری ئیتالیا ،جگە لە لومبارديا، چونکە ئەو پەیوەندیانەی نێوان ئەو و کۆماری بوندقیە هەبون ، هاوشێوەی نەبوو .

پوختەی گوتەکان : لویس پادشا لە تێکەلاو کردنی پێنج پرس توشی هەلە هات.

1- هێزی ویلایەتە بچوکەکانی لاواز کردن .
2- فێری پادشاکانی ئیتالیای کرد ، چۆن تاکرەوانە حوکمرانی دەکەن .
3- بێگانەی بەهێزی بۆ ولات هاوردە کرد.
4- چونکە لە ئیتالیا دانەدەنیشت ، نەیتوانی لە نزیکەوە خۆی لە مەترسیەکان دورخاتەوە .
5- هیچ کۆلۆنیالێکی فەرەنسیی لەو شوێنانە دانەمەزراندن کە داگیری کردبون ،لەکاتێکا لە تواناى لویس پادشادابوو خۆی لەو روداوە سیاسیە نەخوازیارانە بپارێزێ ئەگەر هەلەی شەشەمی نەکردبایە.
6- ئەمەیان مەزنترین هەلەیەتی، دەسەلاتی لە خەلکی بوندقیە زەوت کرد ، لە کاتێکا پێویستیی پێ نەبوو ، ئەو خەلکەی سەرگەردان ودەستەرۆ کرد ، سزاکەی بوە لەدەست دانی لایەنگرانی و کاول بونی سامان و سەروەتەکانی ، ئەگەر لویس دەسەلاتی لە ڤینیسیەکان زەوت نەکردبایە و کەلیسای نارەحەت نەکردبا ونە چوبایەتە ناو ئیتالیا ، ئەو کات دەبوە کارێکی وردبینانە وبە حیکمەت وشارەزا ، پێگەی سیاسیی بەرز دەبۆوە ، چونکە ئەوکات لەتوانای دابوو تاکرەوانە حوکم بگێرێ و لایەنگرێکی زۆریش بۆخۆی پەیاد بکا . بەلام لەوکاتەی ئەم دوو کارەی ئەنجام دان بۆئەو باشتر وابوو ئەگەر هاوکاری خەلکی بوندقیەی بدابا تا ببێتە قەلغان بۆ پاراستنی لومبارديا ولە دوژمانی بپارێزێ و هاوکاری دۆستانی بکا ، کەچی ئەم

ئەنجامانە بەقەدەر روناکی رۆژ رون وئاشکەرا بون کەچی پێی هەڵنەستا ، چونکە خەلکی بوندقیە رێگەیان بە داگیرکەر نەدەدا دەستدرێژی بکاتە سەر لومباردیا ، خەلکی بوندقیە کەس و کارو بەرژەوەندی زۆریان لە ویلایەتە هەبوو ، بۆیە هیچ کەسێک ئەم هەولەی نەدەدا کە لومباردیا داگیر بکا ورادەستی بوندقیەی بکا و خۆیشی وەکو ئامۆژگارکار و ریش سپی لێی دەرچێ ، لەو سەردەم کەسێک نەبوو بتوانێ دوژمندارێتی فرەنساو بوندقیە بکا بۆئەوەی ویلایەتەکە وەدەست بێنێ ، بەلام لویس ئەقلی بە وسیاسەتەدا نەشکا بۆیە کاری بۆ نەکرد .

دەڵێم :

ئەگەر داوای بوردنی لە لویس پادشا بکردبایە ، ئەوکات رومانەی بە ئەسکەندەر نەدە بەخشی و بۆ بەرژەوەندی ئیسپانیاش دەستی لە پادشایەتی هەڵنەدەگرت ، دیارە ئەم دوو بەخششە بۆئەوەبوو لە شەڕ بپارێزرێ ، بۆیە بریارە سەرەتاییەکەی دوبارە دایەوە کە دەڵێ:

(سولتانی بێتوانا ، خۆی گوێ بەو کێشانە نادا کە لە ولاتەکەی رودەدەن ، ئەنجامی گوێنەدان وپشتگوێ خستنیش شەرو ئاژاوە لەگەڵ خۆیدا دێنێ بەهۆیەوە ولات توشی شەر وجەنگ دەبێ ، چونکە شەر بە پشتگوێ خستن لەناو ناچێ ، بە پشتگوێ خستنی کێشە دوژمن دەرفەتی باش وەردەگرێ کە سودی لێ ببینێ و زیان بە بەرانبەر بگەیەنێ ، ئەگەر لویس پادشا داوای بوردنی لە پاپا کرد بەهۆی بە جێنەگەیاندنی پەیمانەکانی و هاوکاریی کرد لە جیابونەوەی لەگەڵ هاوسەرەکەی ، ئەم کارەشی بە قەشە توهانی یاریدەدەری کاردینال سپارد) ، ئەوکات دەڵێم:

(ئەمە داوای بوردنی رەوا نیە ، چونکە من بۆ پەیمانی پادشاکان رای خۆم هەیە) کە دەیڵێم:

(لویس پادشا سۆز ولایەنگریی لومباردیای بۆیە لەدەست دا چونکە لە رێچکەی ئاقلمەندانی کۆلۆنیالەکە دەرچو و رێچکەیەکی جیای گرتبوە بەر ، بەهۆیەوە توشی هەلەی سیاسی بوو کە لە مەزندەی کەسدا نەبو بۆیە توشی هەڵەی مەزن هات ، ئەمەش کارێکی سەیر نیە ، چونکە هەموو شتێک لەم دونیایە یاسای تایبەتی خۆی هەیە ، سزای پشتگوێخستن و کەمتەرخەمیش ، شکست وبێ ئومێدیە . چونکە من ئەوکاتەی کاردینال روهانم لە نانت بینی سەبارەت بەم پرسە قسەم لەگەڵی کرد ، ئەوکات کوری پاپا (ئەسکەندەر) کاری بۆ داگیر کردنی رومانە دەکرد) ، لەم بارەیەوە کاردینال لە درێژەی قسەکانی پێی ووتم :

(ئیتالیەکان لە هونەری شەر هیچ نازانن ) ، منیش وەلامم دایەوە :
(فرەنسیەکانیش هیچ لە سیاسەت نازانن،چونکە ئەگەر هیچیان لە سیاسەت بزانیایە کەلیسا لە سەردەمی دەسەلاتیان نەیدەتوانی ئەو هەموو هێزو دەسەلاتەی هەبێ لە کاتێکا پێشتر نەیبوو چونکە روداوەکان سەلماندیان کە فرەنسا خۆی ئەو هێزەی پێ بەخشی بون ، هەر ئەویش بوو ئیسپانیای بانگێشتی ئیتالیا کرد ، وەکو ئەوەی بەدوای مردنی خۆیدا بگەرێ و گۆری خۆشی بەدەستی خۆی هەڵکەنێ )، لەم هەلویستە بیردۆزێک هەیە دەڵێ:
( ئەو بەهێزەی کار بۆ بەهێزکردنی لاواز دەکا ، کار بۆ کوشتنی خۆی دەکا ، چونکە هیچ هێزێکی بەدەستەوە نامینێ بیشارێتەوە ئەوەی هەیە دەیهێنێتە بەرچاوان ، ئەوکات ناحەزەکەت لە بن وبناوانت دەگا ، ئەوکاتیش ئەیهاوار بۆ ئەو بەهێزکەوتوە نوێیە ئاخۆ بەچی رازی دەبی ) .

**یەکەی سێیەم/**
**ملکەچ بونی دەسەلاتدارێتی دارا بۆخەلیفەکانی ئەسکەندە**
**-------------------------------------------------------**

دوای ئەوەی بە تێرو تەسەلی باسمان لەو تەنگ و چەلەمانە کرد کە دێنە رێگەی داگیرکار لە کاتی داگیرکردنی ولاتێکی نوێ ، پرسیارێک هاتەوە بیرم کە زۆرجار روو بەروم دەکرێتەوە لەلایەن ئەوانەی لەسەر پێوەری رابردوو حالی حازر هەڵدەسەنگێنن و روداوەکانی دوێنێش بە ئەمرۆ دەبەستنەوە ، پرسیارەکەش :
(چۆن ئەسکەندەری مەقەدۆنی توانیی لە ماوەیەکی کورتدا دەست بەسەر گشت ولاتەکانی کشوەری ئاسیادا بگرێ ؟ دواتر هاوپەیمانەکانی چۆن تانیان ئەوەی لەم داگیرکاریە کە بۆی جێهێشتن بیپارێزن ؟ لەکاتێکا ئەوەندەی نەبرد دوای داگیرکردنەکە خەریک بوو لەدەستیان بدا؟)
هەندێک جار وا بیر دەکەینەوەکە لە دوای مردنی داگیرکەرشۆرشی یاخیبوەکان بەرپا دەبێ . ململانێ و رکابەریەکان زیندوو دەبنەوە ، بەلام ئەوەی لە دوای مردنی مەقەدۆنی بەسەر هاوپەیمانانی داهات ، پێچەوانەی ئەو هەلسەنگاندن و مەزندانە بوون ، هیچ کێشەیەک بۆ هاوپەیمانانی دروست نەبوو کە ببێتە مایەی بێزاریان ، جگە لەو کێشانە نەبن کە بەهۆی جێگرتنەوەو تەماحکاری و چاوتێبرین لە سامان و سەروەتەکانی یەکتریان رویاندان، نەبن .

بۆ وەلامی ئەم پرسیارەش دەڵێم :

1- پادشایەک حوکمی میرنشنێک دەکات ، لە دەورو بەریدا ئەو کەسانەبن کە فەرمانیان بەسەردا دەدا، خۆیشی لەسەر لوتکەی حوکم بێ رکابەر و هاوبەش، سەرپەرشتی کاروبارەکانی ولات دەکاو لە دەسەلات وسامان و سەروەتەکانی بە تاقی تەنیا دەستی دەروا ولێی دەخوا واتە کەس لەگەڵیدا برابەش نیە .

هەرچەندە پێویست بە گوتن ناکات کە ئەو میرانەی لە میرنشینە کانیاندا بێ رکابەر وهاوبەشن خۆیان گەورەو خاوەن سامان و دەسەلاتن ، کەس لە ململانێ و رکابەریدا نیە لەگەڵیاندا بۆ وەرگرتنی سامان ودەسەلات ، ئەوەی هەیە بەردەست و خزمەتکار ورەش و روتەکەیە ، ئەم جۆرە میرە لە جۆری دوەم بە دەسەلات تر وتواناترە بۆ خەرجی وتەخشان وپەخشان کردنی سامانی ولات ، ئەمەش بەهۆی ئەوەی کەسێک نابینن تەگەرەیان بۆ دروست بکا یا داوای بەشێک لە مافەکانی بکا ، ئەوەی هەیە دەستی بۆ بەرزدەکاتەوە وەکو رەزامەندی و جولە کردن لە ژێر فەرمانەکانی ئەو ، واتە هەموو ئەو خەلکانە کۆیلەن . نمونەی ئەم جۆرە لەو سەردەم سولتانەکانی تورک بون .

2- پادشا حوکمرانی دەکاو لەدەوریدا چینێکی خانەدان وجوامێرەکان دەبن ، ئەم جوامێر وخانەدانانە لە دەسەلات بەشدارن هەروەکو لە سامانی ولاتیش تایبەتمەندیان هەیە برابەشی پادشان کە بێ بەشکردنیان لە دەسەلاتی پادشادا نیە واتا پادشا بۆی نیە بریارێکی لەم جۆرە دەربکا ، ئەم خانەدان وجوامێرانەش خاوەنی خزمەتکار و بەردەستن لە چینی رەش و روتی ولات ، هەر چەندە دەسەلاتەکانیان لە دەسەلاتی پادشا کەمترە بەلام ئەوان دان بە گەورەیی پادشا دەنێن وبە گەورەی خۆیانی دەزانن . نمونەی ئەم جۆرە پادشایانە پادشای فەرەنسایە . لەدەوری پادشای فەرەنسا کۆمەڵێک لە چینی جوامێرەکان وخانەدانەکان هەن ئەمان بە رەچەلەک دەگەرێنەوە سەر پالەوانانی سەدەی یەکەم ، بۆیە لە سامان و دەسەلاتەکانی پادشای فەرەنسی پشک دار و هاوبەشن ، پادشاش لەدەسەلاتیدا نیە لەم سامان و دەسەلاتەیان بێبەش بکا ، ئەم خانەدان وجوامێرانەش پارت ورێکخراوی تایبەتی خۆیان هەیە کە لە خزمەت ئەواندا کار دەکەن ، بۆ بەرز و پیرۆز راگرتنی ناوو ناوبانگیان لەبەر چاووی ئەو خەلکە ، مافی تایبەتی ئەوان هەردەم پارێزراوە کەس ناتوانێ لێیان زەوتکا. تەنانەت ئەگەر پادشاش ئەم هێلە سورە ببەزێنێ و دەست بۆ تایبەتمەندیەکانیان ببا ئەوا خۆی رووو بەروی

مەترسیەکان دەکاتەوە ئەو مەترسیانەی کە خۆی حەزیان لێ ناکا . ئەگەر سەیرێکی ئەو دوو جۆرە داگیرکاریە بکەین و بەراوردێکیان بکەین ، ئەوا داگیر کردنی پادشانشینی جۆری یەکەم کارێکی ئەستەمە بەهۆی ئەو دەسەلاتە رەهاو حوکمە توندەی لە دەستیدایە ، ئەگەر لە حالەتێک بۆ ماوەیەکی کورت ئەو ولاتە داگیرکرا ، ئەوا رزگار کردنەوەی کارێکی لەو ئەستەم تر دەبێ ، ئەمەش لەبەر ئەوەی کەسێک لەو میرانەی کە دەسەلاتیان هەبێ نەماوە تا بەهۆی بێزار بون لە داگیر کەر بتاوانێ راپەرین یا شۆڕش دژی داگیر کەرە نوێکە بەرپا بکا ، دیارە وەکو باسمان کرد حوکم تەنها سولتان دەیبرد بەرێوەو دەسەلاتەکانیش لەو کۆکرابونەوە خەلکەکەی تر رەش و روت و بێ دەسەلات بون .

هەروەکو لە نمونەی یەکەم ناوی سولتانەکانی تورک مان هێنا ، لە سیستەمی دەسەلاتی سولتانەکانی تورک ، وولات دابەشی چەند ویلایەت کراوە بۆ هەر ویلایەتێک فەرمانرەوایەک وەکو نمایندەی سولتان دیاری کراوە ، سولتان خۆی بێ گەرانەوەو راوێژ ئەو کەسە دیاری دەکا کە دەبێتە فەرمانرەوای ئەو ویلایەتە . ئیتر ئەو لە دەسەلاتەکانی خۆیدا هەموو کارێک دەتوانێ بکا ، ئەم دادەمەزرێنێ و ئەو لەسەر کار لادەبا بە هەوەستی خۆی ، هیچ لێپرسینەوەیەکی لەگەلْدا ناکرێ ، نە رکابەر نە ململانێکەر بۆ وەرگرتنی بەشێک لە دەسەلات یا سامان، لەم جۆرە سیستەمانە بونی نیە ، کاتێکیش ئەم جۆرە ولاتە بەهۆی نەبونی خانەدان وجوامێرەوە داکەگیر دەکرێ چونکە کەس نیە شوێن پادشا بگرێتەوە ، راپەریندا دژی دەسەلاتی داگیرکەر بەرپا بکا ،رزگار کردنی ئەم جۆرە ولاتە داگیرکراوە کارێکی ئاسان نیە چونکە کاتێک ئەو ولاتە داگیر دەکرێ ئەگەر پادشا واتە سەری مار پانکرایەوە ، ئیتر مەترسیەکان کەم دەبنەوە ، کەسێک نامێنێ ببێتە مایەی هەرەشە .

ئەمەش بە پێچەوانەی دۆخی پادشانشینی فرەنسا وپادشایەکەی ، چونکە کاتێک داگیرکەر بتوانێ سۆز ولایەنگری یەکێک لە خانەدان یا جوامێرەکان وەدەست بێنێ کاری داگیرکردن دەبێتە کارێکی ئاسان بۆیان ، بەلام مانەوەی داگیرکاری لەم جۆرە ولاتە داگگیرکراوانە کارێکی ئاسان نیە بەهۆی ئەوەی جوامێر و خانەدانەکان هێشتا خاوەنی دەسەلات وسامان وسەروەت ولایەنگری خۆیانن دەتوانن لە دەرفەتێکا کۆیان کەنەوە رژێمی داگیرکەر وەدەرنێن ، ئەوکاتەی داگیرکەر بەرێگەی چەواشەو فرت وفێل یەکێک لە خانەدانەکان رازی دەکا بەلام ئەمە نابێتە مایەی ئەوە کە ژیانی داگیرکەر لە ئارامی دایە ، بۆیە درێژە بە

داگیرکاریەکە نادرێ ولەو ماوەیەدا وەکو شەپۆلەکانی دەریا هەردەم مەترسیەکان لێیەوە نزیکن تا ئەوکاتەی دەسەلاتی داگیرکەر سەرنگون دەکرێ .
ئەگەر خوێنەر سەیرێکی دەولەتی دارا بکا بەر لە داگیرکردنی لە لایەن ئەسکەندەرەوە ، وەکو دولەتێکی تورک دەبینێ ، کاتێکیش ئەسکەندەر بەسەر ئەو دەولەتەدا زاڵ دەبی سوکایەتیی بە خانەوادەی ئەم دەولەتە کرد ، موختارەکەی بە دیلی هێنا ، ئەگەر خەلیفەکانی لەسەر هەمان رێچکەی پێشتر برۆیشتبانا ئەوا چارەنوسیان هەمان چارەنوسی حاکمەکانی پێشتر دەبوو ، بەلام ئەوان لە نێوان خۆیاندا تێک چون ، هەندێکیان لە هەندێکی تریان قەبول نەکرد ، ئەگەر دەسەلاتدارێتی دارا لە سەردەمی ئەسکەندەر لە شێوەی پادشانشینی فرەنسای سەردەمی ئێمە بوایە ، نەیدەتوانی بەسەریدا زاڵ بێ ، ئەوکات بە هێچ شێوەیەک دەستی بەسەریدا نەدەشکا بۆیە روما ئازاری زۆری لە فرەنسا وئیسپانیا و ولاتی گریک چێشت، چونکە پادشا شەریفەکانیان لە پێناو رۆما بونە رێگر، ئەم کارەیان بۆ نەچوە سەر تا ئەوکاتەی خانەوادەی جوامێرو خانەدانەکان لە ناو دەچن ، ئەوکات ئیتر رۆما ئارام دەبێ و بارو دۆخەکان بێگەرد دەبن ، هۆکاری لە ناوچونیشیان بۆ ئەو ناکۆکی ودوبەرەکیە دەگەرێتەوە کە کەوتبوە نێوانیان ، هەر میرەو ململانێی ئەویتریانی دەکرد ، ئەگەر بیتوانیبایە دەستی دەگرت بەسەر سامان وموڵکیدا ، رۆما لە چاوەروانی دەرفەتدا بوو ، حزبی میرە بەزیوەکان رادەکەنە لای میرە سەرکەوتوەکان ، گەلێک جاریش پەنابەر دان بە دەسەلات وگەورەیی پەنا بۆهێنەر ناهێنێ ، تا ئێستاش رەوشەکان بەم شێوەیە تا دوا میرەکان وون دەبن ، ئیتر سەرسام مەبە بەو سەرکەوتنانەی ئەسکەندەر لە ئاسیا بەدەستی هێنا، هەروەها لۆمەی هیچ داگیرکەرێکی تر ناکرێ لە نمونەی بیروس ، ئەوانەی بەقەدەر ئەسکەندەر دەستکەوتیان نەبوە ، هیچ کامیشیان لەوی تر باشتر نیە بەلام کارو ئەرکی پادشاکان وەکو یەک نەبوو جیاوازی لە کاروبارەکاندا هەبوو بۆیە ئەنجامەکانیش جیابون .

**یەکەی چوارەم/**
**چۆن حوکمی ئەو ولاتە دەکەی کە پێش داگیرکردنی سەربەخۆ بوە؟**

ئەگەر داگیرکەر ولاتێکی داگیر کرد وئەو ولاتە پێشتر بە یاساو رێسای تایبەتی خۆی ولاتێکی سەربەخۆو وئازاد بوە ، بە سێ رێگا دەتوانی حوکمرانی لەم جۆرە ولاتانەدا بکەیت :

**یەکەم/**
دەبێ داگیرکەر ئەو ولاتە کاول کا ، دواتر لەسەر کەلاوە ئەو ولاتە دەسەلاتێک دابمەزرێنێ.

**دووەم/**

دەبێ داگیرکەر لەو ولاتە نیشتەجێ بێ کە داگیری کردوە .

**سێیەم/**

دەبێ ئازادی سیاسی و سەربەخۆیی ناوخۆ بەو ولاتە ببەخشێ، بەمەرجێ باجی سالانە لەو ولاتە بسێنێ تا لە جیات ئەو حوکمرانی بکەن ، ئەرکی ئەم کۆمەلە جێگرەی ئەوە دەبێ کە بۆ خەلکی ئەو شارە رون بکەنەوە کە بە ئامادە نەبونی

پادشا، ژیانیان دەکەوێتە مەترسیەوە چونکە ئەگەر چاودێری پادشایان لەسەر نەبێ ئارامی وئاشتیان بەرقەرار نابێ ، دەبێ دلسۆزی ئەوان و هاوبەستەگیان بەدەست بێنن ، ئەمە وەکو ئەزمون سەلمێندراوە بە پێدانی ئازادی بە خەلکی ئەو وولاتە هاوتا بێ لەگەل ئەو ئازادیەی کە بەر لە داگیرکردنیان هەیانبوو، ئەمە باشترین شێوەو رەفتارن تا بتوانرێ داگیرکاریەکە بپارێزرێ و لەدەست نەروا ، دەبا بۆ هەریەک لەو سێ رێگایە نمونە بێنین :

خەلکی ئسپارتە ئەسیناو تیبەیان داگیرکرد وبە نیانی لەگەلیان جولانەوە و ئازادیان پێ بەخشین وخۆشەویستی لە نێوان براوەو دۆراو پەیدا بوو ، هەروەها رۆماش قورتاجە و کابو ونومانتیەی داگیر کرد، دوای ئەوەی زۆری ئازاردان ویستی ئەمجارەیان رۆمان داگیر بکا کە دەکەوێتە سەر ولاتی گریکەکان ، کە پێشتر ئسپارتیەکان داگیریان کردبوو ، بەو ئەگەرەی ئازادیان پێبدەن و لەگەلیان بە خۆشی بجولێنەوە بەلام تێیدا سەرکەوتو نەبون و زۆر لە شارەکانی گریکیان ئازار دان ، گوایە ئەوان کار بە سیاسەتی کاولکاری ناکەن ، تا بۆیان روون بۆوە کە ئەمە باشترین سیاسەتە لەسەری برۆیت، چونکە سەلمێندراوە باشترین رێگە بۆ مامەلکە کردن لەگەل ئەو ولاتانەی داگیر دەکرێن کە پێشتر ئازاد بونە ، کاولکردن و تێکدانە، چونکە ئەگەر ئازاری ئەو ولاتە نەدەیت ئەوان ئازاری داگیرکەر دەدەن ، چونکە ئەم جۆرە ولاتە ئازادە ئەگەر داگیرکاریەکەیان درێژەی خایاند ئەوکات ئەوان دەکەونە بیرکردنەوەو کارکردن بۆ هەلگیرساندن و بەرپا کردنی شۆرش و دروست کردنی گیانی دژایەتی لە دلی دانیشتوانەکەو نانەوەی ئاژاوەو گێرەشێوێنی، ئەم ئاگرانەش وا بە ئاسانی دانامرکێنەوە چونکە مێژووی باوک وباپیرانی ئەو خەلکە هێشتا لە دلیاندا پارێزراوەو بیر نەوەکانیان دێننەوە ، هیچ شتێک نیە ناوی ئازادی بسرێتەوە ، نە ئازار وزەبروزەنگی رۆژگار ، نە راوەدونان ی خەلک دەتوانێ ئەو ناوە بسرێتەوە کە لێی لەدایک بونە ولێی مەزن بونە .

دەبا نمونەی بیزە بێنینەو کە ماوەی داگیرکاری و ستەمکاری لەسەردەمی حکومەتی فرەنسی درێژەی کێشابوو ، ئەوان هەردەم باسیان لە ئازادی دەکرد ، دەیان ووت کە پر بەهاترین شت و مەزنترین خۆشیان لەدەست داوە .

ئەگەر ولات لەسەر حوکمرانی یەک خانەوادەی پادشایەتی راهاتبێ . ئەوکات بۆ داگیرکەر ئاسانترە کاتێک ئەو خانەوادەیە لە ناو دەبا ئیتر بە ئاسنتر دەتوانێ حوکمی ئەو ولاتە بکا ، چونکە ئەو خەلکە لەسەر گوێرایەلی راهاتون بۆیە حوکمرانیەکە ئاسانتر دەبێ ،هۆکارێکی تریش ئەوەیە ئەوان دوای لەدەست دانی پادشا کەیان بەدوای پادشایەکدا دەگەرێن رابەرایەتیان بکا ، لای ئەوان گرنگ نیە

کێ بێ ، دواتر بژاردنی میر یا پادشا لە نێو ریزەکانی گەل قبول نیە ، بۆیە هاتنی پیرێک لە دەرەوەی توێژی ئەوان قەبولتر دەبێ .بۆیە ئەو ولاتە لای ئەوان گرنگ نیە بە ئازادی بژین چونکە ئەوان لە نەبونی ئازادی راهاتون ، بەم شێوە سۆز و خواستی هەلگرتنی چەک لاواز دەبێ ، هەر میرێکی تر بە ئاسانی دەتوانێ دەست بگرێ بەسەر ولات و داگیری بکا . ئەمە ئەگەر حکومەتی ولاتەکە سیستەمی پادشایەتی بوو ، ئەگەر سیستەمی کۆماری بوو، تێکدانی باشترین رێگایە بۆ داگیرکردنی ، چونکە ئەوان ئەو ئازادیە لەبیر ناکەن و بەرگریی لێ دەکەن ، ئەگەر بە ئاگر و ئاسن وەلامیان نەدرێتەوە ئەوا داگیرکردنی ئاسان نیە وتوشی کاری توند وتیژیت دەکەن هەر چۆنێکی بێ روبەرو بونەوە بەردەوام دەبێ ، دیارە ئەوان بە ئاسانی ئەو ئازادیەی لەدەستیان داوە لە بیری ناکەن ، دواتر سەرکوتکردنی سەردەمی دیلی نایگۆرنەوە بەو ئازادیەی لەدەستیان داوە .

**یەکەی پێنجەم /**

**لەسەر ئەو ولایەتانەی بە هێز و سوپای میر وەدەست هاتون**

خوێنەر سەرسور نابێ لەکاتێک لە سیاقی قسەکانمدا لەسەر ولایەتە نوێکان ئەوانەی تازە بونەتە حکومەت یا میرنشین نمونەی دوریان لەسەر بێنم ، چونکە من دەبینم کە مرۆڤ لەسەر هەنگاوی پێشینین دەرۆن ، مندالەکانی ئەمرۆش هاوشێوەی مندالەکانی دوێنێن و لاسایی کارەکانیان دەکەنەوە ، کاتێک چنینەکە بەم شێوەیە دەبێ ونوێ لاسایی کۆن دەکاتەوە مرۆڤی بێ کەم وکوریش کەمە ، دەبێ لەو حالەتە زانا وشیار بێ کە نمونە لەسەر پیاوە مەزنەکان بێنێ ، باشترینیان بکاتە نمونە ، جا ئەگەر دەستی بە ئەستێرە نەگەیشتبێ ئەوا بەشێکی باش لە زیندویی وپیرۆزمەندیی دەبیتە نەسیب ، ئیتر دەبێتە ئەو تیرهاوێژەی ئەگەر مەبەستی بوو ئامانجێک بپێکێ ئەوا کەوانەکەی بۆ دەچەمێنەوەو ئامانجەکەی بە شێوەیەک

دەپێکێ کە زیاتر لەوەی خۆی مەبەستی بووە ، نەک ئامانجێک بپێکێ دورتر لە ئامانجی خۆی بەڵکو ئەو ئامانجە بپێکێ کە خۆی مەبەستی بوە ، دەڵێم:

وەدەست هێنانی ویلایەتی نوێ بەندە بە تواناو ئازایەتی میری نوێ ، دواتر گەیشتنی هەر کەسێک بە پایەی میر دەبێ یەکێک لەم دوو مەرجەی هەبێ ، یا توانایەکی مەزن ، یا بەختێکی کراوە ، سەبارەت بە وەدەست هێنانی ویلایەتی نوێ ، توانا یا بەختی کراوەی پادشا یا هەردووکیان، ئاسانکارین بۆ ئەم دەستکەوتە و گەلێک لە کۆسپ و ئاستەنگەکان وەلا دەنێن ، ئەوانەی بەخت یاوەریان نەبوو لە کەسانی تر سەرکەوتو ترن چونکە هەمیشە بە ترس وگومانن بایەخ بە کارەکانیان دەدەن لە ترسی سزادان وئەنجامەکانی حساب بۆ هەموو جولەو هەنگاوەکانی خۆیان دەکەن بۆیە هەردەم ئەوان سەرکەوتوترن ، هەروەها لە کاتی جێنیش بونی میر لە ویلایەتە نوێکان باری گرانیان سوکتر دەکا وکارەکانیان بۆ ئاسان دەبێ.
لای من مەزنترین کەس لەوانەی بەو پایە گەیشتون بە پشت بەستن بە تواناو هێزی خۆیانەوە : موسای پێغەمبەر و قورش و رومولوس و ثیزیوس و هەندێکی تر بوون کە ئێستا ناوەکانیانم نایەتەوە بیر ، هەر چەندە شیاو نیە لەم دەرفەتە ناوی کەسێکی وەکو موسا لەگەل ئەو ناودارانەی ناومان هێنان بێنم چونکە ئەو پێغەمبەرێکی خوا بوە ، خەلیفە و راسپاردەی جێبەجێکردنی فەرمایشتەکانی بوە، بەلام من دەبێ سەرسامی خۆم بەم کەسە دەربرم بۆ ئەو کارە جوانانەی ئەنجامی داوە کە بەهۆیەوە لە وتەکانی خوا نزیک بۆتەوە، هەروەها قورش و هاوشێوەکانی کە بونەتە خاوەنی پادشانشین و پێگەی تایبەتی خۆیان، ئەوان شایەنی ستایش وسەرسامین ، ئەگەر لە کارەکانیان و سیاسەتەکانیان وورد بینەوە ، جیاوازیەکی ئەوتۆیان لێ بەدی ناکەین لەگەل کار و سیاسەتەکانی موسا، لەم روەوە ناکۆکیەکی ئەوتۆیان لەگەل موسادا نەبوە چونکە رێنیشاندەریان خوای بەخشندەو مەزن بوە ، ئەگەر بۆ روداوی ئەو کەلە پیاوانە بگەرێینەوە دەبینین کە ئەوان بەهۆی مەزنی خۆیانەوە قەرزار نین ، ئەوەی لەسەر شانیان بوە ئەنجامیان داوە ، ئەوەی خزمەتی ئەوانی کردبێ ئەو دەرفەتە بوە کە بۆیان رەخساوەو ئەوان توانیویانە سودی لێوەرگرن ، ئەگەر ئەو دەرفەتە بۆیان نەرەخسابایە ئەوا تواناو بەهرەکانیان دەدرایە بەر باو بەفیرۆم دەچو ، ئازاتیەکەی ئەمەش دەگەرێتەوە بۆ هێز و تواناکانیان کە ئەو دەرفەتەیان دروست کرد و توانیان وسود لە توانا وبەهرەکانیان وەرگرن و لە خزمەتی مرۆڤایەتیدا وەگەری بخەن .

بۆئەوەی موسا سەرکەوتن بەدەست بێنێ کارێکی زەرور بوو بۆ بەنی ئیسرائیل ئەوانەی لە دۆڵی نیل ی میسر دەژیان ئەو چەوساوەو ستەم لێکراویە ببینن ، بێ پەناگەو پشتیوان بن کاتێک موسا بە هانایانەوە دێ و لەو ستەم و زۆرداریەیان رزگار دەکا و بۆ شوێنێکی ئارام کۆچیان پێ دەکا ئەمە بۆ موسا دەبێتە قارەمانی ویەکێک لە شاکارەکانی .

هەروەها سەبارەت بە رومولوس کارێکی زەرور بوو کە لە ئەلب نەبێ تا رۆژی لە دایک بونی ببێتە شوێنێکی کاولگەو دوارۆژێکی نوێ بۆ ئەو شوێنەو دواتر دامەزراندنی رۆمای لێبکەوێتەوە .

دیسان هاتنی قوروش لەو ساتە وەختەیدا بۆ فارسەکان شتێکی زەرور بوو کە ئەوان لە بارو دۆخێکی نالەبار و بێزاردا بن لە دەست دەولەتی میدیس ، میدیسیش سەخلەتەکانی فارسایەتیی لەدەست بداو هونەری جەنگ لە بیر بکا و جلی پیاوەتیشی لەبەر نەمێنێ .

هەروەها ثیریوس دەرنەکەوتنی تواناکانی و بەهۆی لاوازی خۆیەوە نەتوانێ سود لەو جیاوازکاریە وەرگرێ کە ئەوکات لە ئەسینا باو بوو .

ئەمانەی سەرەوە ئاماژەی ئەوەن کە دەرفەت وسودی زۆربوە بۆ گەیشتنی کەسان و دەرکەوتنی توانای کەلە پیاوان کە بتوانن سود لە هێز وتوانا وبەهرەکانیان وەرگرن وئەو دەرفەتانەی بۆیان دەرەخسێ ببنە دەرفەتی زێرین و کارئاسانی. دواتر خەسلەتە جوامێریەکانیان هاوکار بون بۆ مانەوەو درێژە پێدانی دەسەلات و گەشە سەندنیان لەو بوارە کە بەهۆیەوە بتوانن نیشتمانەکەیان بگەیەننە ئاستێکی بەرز ودەسەلاتەکانیشیان بەسەر ولاتەکەدا بچەسپێنن، مەزنی و زیندویی بۆ نیشتمانەکانیان وەدەست بێنن . ئەو پادشایانەی بەهۆی هێزەوە دەسەلات دەگرنە دەست توشی هەندێک ئاستەنگ دەبن تا ئەو کاتەی بە تەواوەتی رەوشەکە ئارام دەبێ ، زۆربەی ئەو ئاستەنگانەش بەهۆی گۆرینی سیستەمی کۆن دێتە رێگایان کە لە ویلایەتە نوێکان ئەنجام دەدەن. تا ئەوکاتەی لە گۆرینی سیستەم وشێوازی حوکمرانیەکان رادێن تووشی ئاستەنگی زۆر دەبن چونکە لای میللەتان هیچ کارێک لە کاری راهاتنی سیستەمی حوکمرانیی نوێ قورستر نیە ، گۆرینی شێوازی کاروباری کۆن بە شێوازی کاروباری نوێ پێویستی بە تواناو هەولی زۆر هەیە ، چونکە بە گۆرینی سیستەمی کۆن بەرژەوەندیی کۆمەڵێک کەس دەکەوێتە مەترسی و لەدەست دەدرێ ، ئەگەر ژمارەیان کەمیش بن بەلام هەندێک جار لە رژێم هەڵدەگەرێنەوەو یاخی دەبن ، هەندێکیشیان بە لاوازی لایەنگری ئەو گۆرانکاریانە دەبن ، هۆکاری لایەنگری لاواز دەگەرێتەوە بۆ ترسیان لە

دوژمنەکانیان ئەوانە وا دەبینن کە گۆرینی سیستەمی کۆن لە بەرژەوەندی ئەواندا نیە وترسیان لەو گۆرینە هەیە بۆیە بە دوژمنی دەزانن ، چونکە ئەوانەی بەر لەوەی ئەنجامەکان بە چاوی خۆیان ببینن ، لێی دەترسن ئەوان جێی مەترسین ، بۆیە هاوار لەو کەسانەی لە نێوان مەترسی ودلە راوکێدا دەژین لە نێوان حالەتی لایەنگر و دوژمنکاری دا .
ئەگەر بمانەوێ پشکنین بۆ ئەم پرسە بکەین ، راستیەک هەیە دەبێ بیزانین ئەویش ئەوەیە:
ئایا ئەو چاکسازانە بێلایەنن؟ بروایان بە خۆیان هەیە؟ خۆیان کار لەسەر ئەم پرسە دەکەن؟ یا پشت بە کەسانی تر دەبەستن تا ئەم ئامانجەیان بۆ بێننە دی؟ ئایا کەسانی لاوازو ماستاوچین؟ توانای جێبەجێ کردنی ئەم کارەیان هەیە لە رێگەی هێزەوە، یا بێ دەسەلاتن؟ ئەگەر خەسلەتەکانیان وەکو ئەوە وابن کە یەکەم جار باسم لێیانەوە کردوە واتە بێلایەن وبەهێز و بروا بەخۆ بون ، ئەوا شکست هێنانیان کارێکی ئەستەمە ، ئەگەر وەکو باسکردنەکەی دوەم بون واتە لاواز و پشت بوستو بە کەسانیتر بون بۆ گەیشتن بە ئامانجەکانیان و ماستاوچی و لە روی هێزەوە بێ دەسەلات بون ، ئەوا شکست هێنانیان کارێکی مسۆگەرە و بەدەگمەن سەرکەوتن بەدەست دێنن.
بۆیە دەبینین کە هەموو ئەو پێغەمبەرانەی بۆ چاکسازی نێردراون ئەگەر پشتیان بە هێز بەستبێ و لە رێگەی بەکار هێنانی هێزەوە رێبازو برواکانیان بلاو کردبێتەوە ، ئەوا بە مسۆگەری هەمویان سەرکەوتو بونە ، ئەوانەی لە بە ئاشتی وبە ئارامی و دور لە بەکار هێنانی کاری توند و تیژی ئەم پەیامەیان بلاو کردۆتەوە ، سەرجەمیان شکستیان هێناوەو نەیانتوانیوە بە ئامانجەکانیان بگەن .
ئەمەش بۆ ئەوە دەگەرێتەوە کە رەوشتی گەلان لەسەر یەک رێچکە سەقامگیر نیە ، ئەگەر لە رێگەی بەخشین و پێدانی پەیامی دەستکەوت توانیت تۆێژێک بگەیەنیتە بروایەک ئەوا ئەم بروایێبونە چەسپاوو هەمیشەیی نابێ ، بۆیە پێغەمبەر دەبێ هەمیشە لە حالەتی ئامادە باشی دابێ بۆ روداني هەر ئەگەرێک، ئەگەر ئەو میللەتە لە دڵەوە پێغەمبەری خۆیان خۆشویست ودلیان بە نیانی وچاکەکانی خۆش بوو ئەوا کارێکی باشە ، ئەگەر ئەم بروابونە بەم شێوازە نەچوە سەر ئەوا بە حوکمی شمشێر و تیر دەبێ ناچاریان کەیت سەر بۆ حوکمەکان دابنوێنن .
ئەگەر موسا و قورش و ثیزیوس و رومولوس لە بەکار هێنانی چەک خۆیان بە دور گرتبا ئەوا بە دڵنیایەوە نەیان دەتوانی ئەو ماوە دورو درێژە حوکمرانی بکەن و پەیامەکەیان بلاو بکەنەوە ، لەم روەوە نمونەی سەردەمی ئێمە، ( جیرولامو

سافونا رولا) كه بەم شێوەیە حوكم ناكا شكست دێنێ ، ناتوانێ برواكانی بلاو كاتەوەو ستونی حوكمەكانی داكوتێ بەهۆی بلاو بونی ئاژاوەگێران ئەوانەی لە دەوری كۆببونەوە ، چونكە ئەو جگە لەو شێوازەی ئاشتیانەی كە بەكاری دەهێنا هیچ شێوازێكی تری نەبو بۆ بروا پێهێنان بەو خەڵكە تا بتوانێ حوكمرانیان بكا وپەیامەكەی خۆی بلاو بكاتەوەو بروای پێبهێنن ، ئەو رێگە ناچاركردنی ئەو خەڵكەی نەبو جگە لە رێگەی نیانی . بۆیە من دەڵێم:
( نمونەی ئەو جۆرە كەسانە توشی كۆسپ و ئاستەنگی زۆر دەبن لەم میانە ، ئەگەر ئەوان بەهۆی تواناو لێهاتویی بتوانن ئەو خەڵكە ناچار بكەن بروا بە پەیامەكەیان بێنن و دەنگە نارازیەكان دەمكوت كا ئەوا بە دڵنیاییەوە كارێكی مەزنیان ئەنجام داوە و لەم نێوەندە بە رێز وحورمەتەوە دەتوانن بژین )
دەبا نمونەیەكی بچوكتر لەو نمونە مەزنانە بێنمەوە كە لەروی پلەوە بچوكتر بەلام لە روی چۆنایەتیەوە جیاواز وبە سود ترە ، ئەویش نمونەی (جیرون ی سرقستی) یە كە كۆیلە دەبێ و دواتر دەبێتە پادشا ، بۆگەیشتن بەم پایە هیچ كەسێك یاوەر وهاوكاری نەبوە جگە لە خەسلەت وتوانا ودەرفەتەكان نەبن ، خەڵكی سرقستە كە خەڵكانێكی هەژار وچەوساوەو بندەست بون ئەوان جیرون یان بە سەرۆكی خۆیان هەڵبژارد ،دواتر دەبێتە میر ، بەلام بەهۆی چاكەو رەوشتە باشەكانیەوە لەسەری دەنوسن كە شیاوی پادشایەتیە وبۆ ئەم پلەیەش لە هیچی كەم نیە تەنها كۆشك و تاجی پادشایەتی نەبێ ، ئیتر ئەم پلە بەدەست دێنێ و كاتێك دێتە سەر كورسیی پادشایەتی دەست دەكا بە بلاوە پێكردنی سوپای كۆن و دەستبەرداری دۆست وهەڤالە كۆنەكانی دەبێ و سوپایەكی نوێ دادەمەزرێنی و دۆست وهەڤالی نوێ دەگرێت ، دوای ئەوەی ستونی حوكمەكانی بەم شێوازە مكوم و توند دەكا لە دەستبەردار بونی سوپای كۆن و دامەزراندنی سوپایەكی نوێ و پشت بەستن بە دۆستی نوێ لەسەر بنەمای نوێ ، نیشانەكانی بەهێز بونی لێ وەدەر كەون و باشتر دەتوانێ بەسەر ستونەكانی حوكمدا زاڵ بێ وكۆنترۆلی بارو دۆخەكان بكا ، بەم شێوەیە بە كەمترین ئاستەنگ توانیی درێژە بە حوكمرانی بدا .

## یەکەی شەشەم
## ئەو ویلایەتانەی بەهۆی بەخت و هاوکاری کەسانی ترەوە دروست دەبن

ئەوانەی بەهۆی بەختەوە دەردەکەون و لە زۆرینەی خەڵک پلە بەرزتر وەدەست دێنن و دەبن بە پادشا ، ئەوانیش بە ئاسانی ناگەن بەو پلەو پایە ، ئاستەنگ وناخۆشیان دێتە رێگا ، مانەوەو درێژەدان بە پادشایەتیان لە وەدەستهێنانی پۆستەکە ئاسانتر نابێ ، ئەوان لەو کەسانە نین کە توشی گرفت وتەنگ و چەڵەمە نایەن ، نەخێر بەڵکو ئەو ناخۆشیانەی دێنە رێگایان بە کت و پری روو دەدەن، لەکاتی هەوڵدان و گەیشتن بەدەسەلات زۆرترن لە گرفت وکۆسپەکانی تر ، ئەوان دور دەبن لە هەندێک لەو گرفتانەی دێنە رێگی کەسانی تر چونکە هەن بۆیان چارەسەر دبکەن، بەلام کاتێک دەگەنە سەر کورسیی پادشایەتی ئەوکات هەندێک لەوانەی دەوریان دابوو دەستبەرداری دەبن ئەوکات دەستگرتن بە دەسەلات دەبێتە کارێکی قورس بۆیان ، ئەمە بەتایبەتی دێتە رێی ئەو پادشایانە کە لە رێگەی پارەو سامانەوە کورسیی پادشایەتی دەکرن یا بە هاوکاری ماددی خەڵک بە وپۆستە دەگەن، ئەم بەسەرهاتە لەسەر گەلێک لە پادشاکانی گریکی رویداوە لە شاری (ئەیونیە و دورگەی هیلسبونتە) لەم شوێنە لە خانوێکدا خەڵکانێکیان خۆش ویست تا گەیاندیانە ئاستی پادشایەتی ، هەروەها جەماعەتی ئیمپراتۆرەکان کە بە پشتیوانی سوپا ئاستیان لەو خەڵکە بەرزتر دەبێتەوە تا دەگەن بە پۆستی قەیسەری ، ئەمان لە ژیانی رۆژانەیانداو لە بەرێوە بردنی کاروبارەکانیان پشت بە توانای ئەو کەس ولایەنانە دەبەستن کە بەم ئاستەیان گەیاندون، بەخت و دەرفەتەکانی کاریان بە بەخت و دەرفەتەکانی ئەوان دەبەستنەوە، چارەنوسیان دەبیتە چارەنوسی ئەوان ، ئەم جۆرە کەسانە خۆشیان نازانن چۆن پلەو پۆستەکانیان دەپارێزن و رەزامەندیی بەردەوامی ئەوکەسانە راگرن کە بەم شوێنەیان گەیاندون ، بەلام ئەم جۆرە کەسانە زۆر ئاستەمە رەزامەندی دەروبەر وەدەست بێنن چونکە کاری لەم پۆستە و بەم ئاستە بێ سەروەری ودەسەلاتیە درێژە پێدانی کارێکی قورس دەبێ ، خەڵک چاوی لە داهێنان و کاری تازەیە ، کاتێکیش ئەم نوێکاری وداهێنانە بونیان نابی گلەیی و پرتەو بۆرە سەرهەڵدەدەن. ئەو کاتەی دەیەوێ فەرمانێکی خۆی جێبەجێ بکا بەهۆی نەبونی هێز و توانا وئیرادەوە بۆی ناکرێ چونکە ئەو خاوەنی ئەو هێزە بەتوانایە نیە لێپێچانەوە لەگەڵ کەسێک بکا کە سەرپێچی رێنماکانی دەکا . دواتر

ئەو پادشانشینانەی بە خێرا دروست دەبن وەکو ئەو گژو گیایانەن کە رەگیان سەرزەویەو دانەبەزیوەتە ژێر زەوی بۆیە چۆن بە خێرا دەروێن ئاوەهاش زوو بە زوو لەناو دەچن ،هەر بە یەکەم رەشەباو گەردەلول دەفەوتێن ، بەلام ئەگەر ئەو پادشایەی بەهۆی تواناو هێزەوە بەم پلەیە گەیشتبێ دەتوانێ بەرگەی گەردەلول و ناخۆشیەکان بگرێ و لەناو چونی کارێکی ئاسان نابی، هەرکاتەی توشی بە کارەسات و ئاستەنگ بۆوە بە زوترین کات خۆی دەگرێ و دەبوژێتەوە ، دوای هەلسانەوەش پەند لەو کۆسپە وەردەگرێ وئەم کارەی بە سەرکەوتنی یەکجارەکی دەگەیەنێ .

ئێستا دوو نمونە لەسەر دوو کەس بۆ خوینەری ئازی دەهێنمەوە :

یەکێکیان فرانسیسکۆ سفرزا یە کە بە هەوڵ و تواناو زیرەکی خۆی بەو پۆستەی گەیشت ، ئەویتریان قەیسەر بورڤیە بوو لە رێگەی بەختەوە بەم پۆستەی دەگا ، من لەم روەوە دەڵێم:

(فرنسیسکۆ بە هەوڵ و توانا وزیرەکی خۆی دوای ئەوەی ئەو رێگە پر لە درک و ناخۆشیانەی بری بوو بە میری میلانۆو بۆ ماوەیەکی زۆریش توانیی لەم پۆستەی بمێنێتەوە . بەلام قەیسەری بورجیە کە بە ناوی میری (فالنتین) دەناسرا بەهۆی بەختی باوکیەوە بوو بە پادشا کە بۆی مابۆوە واتە بە (ویراسی)، بەلام دوای ئەوەی زۆر هەوڵ دەدا ناتوانێ ئەم پۆستە بپارێزێ و لەدەستی دەدا چونکە کەسێکی بەتواناو زیرەک ولێهاتوو نەبوو لەم روەوە ، من پێشتریش ووتومە ئەوەی لە سەرەتاوە بناغەیەکی مکوم دانەرێژێ لە دواییدا لەدەستی دەدا چونکە ناتوانێ بیپارێزێ هەرچەندەی هەوڵی بۆ بدەن وپێیەوە ماندوو بن ، بەلام کاتێک لەدەسەلات دەمێنێتەوە ئاماژەیە بۆ ئەو بناغە مکومەی پێشتر ئەو دیوارەی لەسەر دروست کردوە ، واتە بناغەی دروست وماندوو بونی تەواوو تواناو زیرەکی بۆ پادشا مەرجی مانەوەی دەسەلاتن بۆی) .

ئەسکەندەری شەشەم گەلێک ماندوبون و ئاستەنگی هاتنە رێ بۆ ئەوەی ئاستی کورەکەی بەرز کاتەوەو تا بە دەسەلاتی بگەیەنێ ، ئەم کێشانە بۆی مانەوە بۆ ئەوکاتەی دەگاتە سەر کورسی ، بینیی کە کارێکی ئاسان نیە بیکا بە پادشایەک دور لە دەسەلاتەکانی کەلیسا ، کاتێکیش هەوڵدەدا دەست بەسەر هەندێک لە مولکەکانی کەلیسادا بگرەێ میری (میلانۆ) و خەلکی (ڤینیسیا) رێگریی لێدەکەن چونکە (فاینزە و ریمینی )هەردوکیان لە ژێر پارێزبەندی (بوندقیە) دابون.

دواتر دەبینێ کە ژمارەی ئیتالیەکان و سوپاکەی ، بەتایبەتی ئەو سەربازانەی خوازیار بون لە خزمەتیدابن هەمویان لەدەست کۆمەلێک کەسدا بوون ئەوانەی لە

گەورەیی پاپا دەترسان ، بۆیە نەدەکرا پشتیان پێ ببەسترێ و گرەویان لەسەر بکرێ چونکە هەمویان لە ژێر دەسەلاتی خانەوادەی ئورسینی وکالوناس و لایەنگرانی دابوون ، بۆیە لە پێناو دەست گرتن بەسەر ئیتالیا دەبوایە ئاژاوەیەکی مەزن بخولقێندرێ و بەهۆیەوە رژێم و سیستەمی حوکمرانی لە ئیتالیا بگۆردرێ ، ئەمەش لای ئەو کارێکی ئاسان بوو چونکە خەلکی بوندقیە دەستی پادشای فەرەنسا و سەربازەکانیان کێش کردبوە ئیتالیا و کەسیش رێگریی ئەم کێش کردنەی نەکردبوو، بەلکو هاوکاریان کرد، کارئاسانیان بۆ لویس کرد تا لەگەل هاوسەرەکەی لەیەک جیا ببنەوە ، کتێکیش لویس پادشا لەسەر داخوازی خەلکی بوندقیە و رەزامەندی ئەسکەندەر  خۆی و سەربازەکانی دێتە ئیتالیا ، هێشتا بە تەواوەتی نەگەیشتبوە میلانو کاتێک پاپا داوی لەشکرکێشیی لێ دەکا بۆ مەبەستی شەرکردن لەگەل رۆما کە دواتر لەم شەرە پاپا سەردەکەوێ ، ئەم سەرکەوتنەش بۆ ئەو پشتگیریە دەگەرێتەوە کە پادشای خاوەن ناوبانگ لێی دەکا ، ئەوکاتەی میری بوندقیەش رۆما دەگرێ و کولوناس لەدەست رادەکا ، ئەوکات دوو گرفت دێنە پێشی کە بتوانێ داگیرکاریەکەی بپارێزێ :

1/ سەربازەکانی ، لێیان کەوتبوە گومان لەوەی دلسۆزی بن و ئەمانەتی بپارێزن .

ب/ئیرادەی فرەنسا ، لەوە ترسا خانەوادەی ئورسینی دەستبەرداری بن و پشتی تێبکەن و سوپاو چەک و تەقەمەنیەکانیان بکێشنەوە کە بەهۆیەوە دەجەنگی ، دیارە ئەوکات ئەنجامەکەی دەبێتە شکست وکۆتایی هاتن بە داگیرکاری و ئەوەی وەدەستی هێناوە لێی بسەندرێتەوە ، ترسی لەوە هەبوو کە پادشا خۆی ئەمەی لەگەلدا بکا ، لەم ئەنجامە دلنیا بوو کە ئەمە لە خانەوادەی ئورسینی روو دەدا ، ئەمەش بۆ ئەو گومانە دەگەرێتەوە کاتێک دوای هێرشەکەی فاینزیە هێرش دەباتە سەر پۆلۆنیا ئەمان لە هێرشەکە دوودل و خۆکێشەرەوە دەبن .

بەلام لە دیدی لویس پادشا ، میر دوای ئەوەی میرنشینی ئوربینو داگیر دەکا و هەولی داگیر کردنی توسکانە دەدا ئیتر پادشا ئەو هێرشەی رادەگرێ و سنوری بۆ دادەنێ ، بەهۆیەوە لێی دەکەوێتە گومان، پێی وایە میرنیازی پاک نیەو بەدوای مەبەستی خەراپدا دەگەرێ، بۆیە ئەم پرۆژەی دەوەستێنێ، ئتر لەوساتەوە میریش درک بە مەترسیەکان دەکاو بە پێویستی دەزانێ داگیرکەر هەموو هێلکەکانی خۆی نەخاتە یەک سەبەتەوەو پشت بە توانا وهاوکاریەکانی یەک لایەن نەبەستێ، کەوابێ جەنگاوەر بەر لە هەموو شتێک دەبێ خاوەنی چەکی خۆی بێ بۆئەوەی ئازادی و سەروەریەکانی لەدەست نەداو خۆی خاوەن بریارو پلانی تایبەتی خۆی بێ .

یەکەم کار کە لە رۆما کردی، لاواز کردنی ئەو حزبانە بوو کە لە ئورسینی و کولوناس ەوە نزیک بون ، دواتر هەولی خۆ نزیک کردنەوەیدا لەو کەسانەی لایەنگری ئەوان بون و بە دیاری و دەستگرتنەوە بەسەری کردنەوە ، موچەو ئازوقەی بۆ دابین کردن ، هەمویانی لە پۆست و پلەی شایستە دامەزراندن ، بەم شێوەیەو بەم هەنگاوانە لە میانەی چەند مانگێکا توانیی پەیوەندیی نێوان ئەوان و سەرۆکەکانیانی پێشینیاندا ببرێ ، پەیوەندیەکی دۆستانەو خۆش و دلسۆزانەی لەگەڵیاندا بەستن ، بەم کارانەی سودی لێیان وەرگرت ، بۆ دلنیا بون لەم وتانە ئەوەبوو کاتێک خانەوادەی ئورسینی ئەم دەسەلات و گەورەیی دۆقیە و پێشوەچونی کەلیساو هێزەکەی دەبینن ، هەستیان بەوە کرد کە گلۆریان بەرەو لێژ بۆتەوە ، کاتێکیش ئاژاوەو گێرەشێوێنی سەرهەڵدەدا هەر زوو دۆقیە دای دەمرکێنێ و کۆنترۆلی دەکا ، بۆ ئەم مەبەستە پەنا بۆ فرەنسا دەبا تا ئەو کاتەی دەکەوێتە سەرپێ، کاتێکیش بەهێز دەبێتەوە پشت بە سیاسەت دەبەستێ و روو لە بێگانە وەردەگێری ، بەمە دۆقیە سیاسەتێکی تەندروست پیادە دەکا کە روی رمەکانی ئاراستەی دوژمن و ناحەزانی دەکا ، ئەم کارەی خانەوادەی ئەروسینی ناچار دەکا لە رێگەی سنیور باولۆ داوای ئاشتەوایی بکا ، ئەم داواکاریەی ئاشتەوایی، دۆقیە دلخۆش دەکا وپێگەی بەهێز دەبێ بەهۆی ئەوەی چاوی لە داهاتوی ئەم ئاشتەواییە دەبێ ، دوای ئەم ئاشتەواییە خانەوادەی ئەروسینیی دیاریباران کرد بە خشل و زێر و ئەسپی رازاوە و چەندین جۆرە دیاریی بەنرخ ، بەم شێوەیە بە دیاری و بەخشین چاویان نوساندن تا ئەو کاتەی توانیان بەسەریاندا زاڵ دەبن و لە دۆست و لایەنگریان دەکەن ، کاتێک لایەنگرەکانی لە دۆقیە نزیک دەبنەوە پێگەی سوپاکەی بەهێز دەبێ بەهۆیەوە بناغەیەکی پتەو بۆ هێزەکانی مسۆگەر دەکا بەتایبەت کاتێک دەست دەگرێ بەسەر رۆمانە دا و دۆقیەی ئۆربینۆش دەگرێتە خۆ ، دوای ئەمەش دلسۆزی و خۆشەویستی خەلکەکە وەدەست دێنێ چونکە ئەو خەلکە هەست بە دلسۆزی خۆشیەکانی حکومەتەکەی دەکەن ئیتر نایانەوێ دەستبەرداری بن ، بەم شێوەیە دۆقیە بە سیاسەتە حەکیمانەکەی توانیی بەسەر کۆسپەکاندا زاڵ بێ وخەلکی هەست بە خۆشیەکانی ئەو سەردەمی حوکمرانیە بکەن ، ئەوەی شیاوی باسە دەمەوێ باس لە بەرنامە وپلانەکانی ئەم دۆقیە بکەم و بڵێم:

ئەوکاتەی رۆمانە دەگرێ ، رۆمانە بەدەست هەندێک میری لاوازەوە بوو ، ئەو میرانە تەنها لە خەمی خۆ دەولەمەند کردندا بون ئەوەی بیریان لێی نەدەکردەوە خەمی خەلکەکە بوو ، بەهۆیەوە ململانێ و ناکۆکی لەو ویلایەتە سەرهەڵدەدا ، لە جیات یەکریزی ، ناکۆکی و دووبەرەکی دروست دەبێ ، ئەو خەلکەش روبەروی

دزی وتاوان بونەوە ، بەهۆیەوە  لە کەش و هەوایەکی دوژمنکارانە و ئاژاوەدا نەوەی کۆن سەرهەڵدەدا ، روی راستیەکان رەش دەبن ، بۆیە میر بەباش دەزانێ بەر لە هەموو شتێک حکومەت دەست بخاتە ناو کاروباری هاولاتیانی و رێگە لە زولم و ستەمکاری بگرێ  بۆئەوەی بەرگری لە مافی هاولاتیان بکاو ئەو خەلکەش هەست بە دلنیایی و ئارامی بکا ، لەم میانە فەرماندایەتیی گرتە دەست و ئەو خەلکەش گوێرایەڵی دەبن ، سنیۆر ریمرۆ دورکو بە والیی رومانە دادەمەزرێنێ ، ئەم پیاوە کەسێکی بە توانای بێ ئەندازە دەبێ ، دەسەلاتی تەواو بەم سنیۆرە دەبەخشێ لەم روەوە دەستی والا دەکا تەواوی ئازادیەکانی پێدەدا ، دۆرکو هەلسا بە چاککردنەوەی ئەو کەنالانەی لە سەردەمی پێشو خەراپ کرابون ، لە ماوەیەکی کورتدا لەتەک چاکسازی تۆوی تەبایی و یەکیەتی وخۆشەویستی و ئارامیی چاند ، دوقیە وای دەبینی ئەگەر دەسەلاتەکان درێژەیان کێشا ، توند و تیژی و دەسەلاتی رەها دەبێتە مایەی بێزاری ئەو خەلکە ، بۆیە لەوە ترسا کارو مەبەستەکان بەسەر سەریدا ئاوەژوو ببنەوەو گوریسەکەی لێ ببێتەوە بە ریس ، بۆیە لە ترسی خەراپ بەکارهێنانی حوکمرانیی توند و تیژ دادگایەکی مەدەنیی لە پایتەخت دادەمەزرێنێ و سەرۆکێکی جوامێریشی بۆ دیاری دەکا ، رێگەی بە هەموو ویلایەتەکانی تردا کە هەریەکەو پارێزەرێک بۆ بنێرێ نوێنەرایەتیان بکا ، دۆقیە ئەمەی دەزانی کە حوکمرانیی توندو تیژ کاریگەری خەراپی لەسەر دەرونی ئەو خەلکەدا دەبێ ، بۆیە ویستی ئەمە لابەرێ ، بۆیە ئەو خەلکەش لەوە دڵنیا بون کە ئەوەی لە کاری توندو تیژی روو دەدا دۆقیە لێی بەرپرسیار نیە ، ئەوەی لەم جۆرە کارانە بەرپرسە دۆرکۆیە کە بە کەسێکی توند ناسرابوو ، دواتر دۆقیە ویستی لە دۆرکۆ نەجاتی بێ و لەسەر گۆرەپانەکەی لابەرێ بۆیە بە بیانویەک تاوانباری کردو خستیە زیندانەوە، دواتر بۆ گۆرەپانی سزنەی گواستەوە، فەرمانیدا جەستەی بکرێتە دوو لەت، دواتر بە خەنجەر لاشەی ئەنجن ئەنجن کرد ، ئەم کارەی دۆقیە خەلکی دلخۆش کرد چونکە لەو حاکمە زالمە رزگاریان بوو .

کاتێک دوقیە هەست بە هێز و توانای خۆی دەکا و هەست بە دور کەوتنەوەی مەترسیەکان دەکا بەتایبەت کاتێک دراوسێکانی لاواز دەکا چونکە لە هەندێکیان ترسی هەبوو ، دڵنیا بوو لەوەی ناتوانێ بەم شێوەیە ولات بەرێت بەرێوە ئەگەر رەزامەندی فرەنسا وەدەست نەهێنێ ، ئەوەندە باکی بە هاوکاریەکانی پادشاکەی نەبوو ،چونکە دەیزانی پادشای فرەنسا لە هەلەی هاوکاریکردنەکانی  پێشوی بە ئاگا بوو، گومانەکانیشی لە درێژە پێدان بە هاوکاریکردنی لە شوێن خۆی بوون، بۆیە هیچ رێگایەک لە بەردەم دۆقیە نەمایەوە تەنها ئەوە نەبی بچێتە ریز فرەنسا لە

شەرکردن لەگەڵ پادشانشینی نوپۆلی دژی ئیسپان کە گەمارۆی جایتە یان دابوو ، مەبەستیشی لەم هاوپەیمانێتیە لەگەڵ فرەنسا ئەوە بوو کە لایەنی ئیسپانیای بێخەم بکا ، وەکو ئەوەی کە ئەمە کارێکی ئاسان بێ ئەگەر پاپا ئەسکەندەر لە ژیان مابوایە؛

ئەمە پرۆژەکەی بوو ئەوەی پەیوەندیی بە حالی حازرەوە هەبوو، ئەوەی پەیوەندیشی بە دوارۆژەوە هەبوو، دۆقیە لەوە دەترسا کە دوای مردنی ئەسکەندەر جێگرەوەکەی کودەتای لەسەر ئەنجام بدا ،ئەوکات ئەوەی لەدەست پاپای پێشو وەدەستی هێناوە ، ئەو لێی بسێنێتەوە ، بۆیە تا لەم مەترسیە دور کەوێتەوە ئەم چوار خالەی جێبەجێ کرد :

1- هەموو ئەو کەسانەی لە خانەوادەی پادشا کە دەستیان لە کوشتنی پادشادا هەبوە لە ناوی بردن ، تا دەرگا بەروی پاپا دابخا ئەگەر نیازی بوو یەکێک لە ئەندامانی خانەوادەی پادشا بۆ ئەم پۆستە دەستنیشان بکا .
2- بۆئەوەی پاپا بتۆقێنێ خۆشەویستی ئەشرافەکانی رۆمای بەدەست هێنا لە رێگەی دۆستایەتی کردنیان.
3- رێژەیەکی باش لە لایەنگرانی قەشەکانی وەدەست هێنا .
4- لە ژیانی پاپادا دۆخەکان گەیشتنە ئاستێک لە زولم و زۆرداری، کە بتوانێ روبەروی یەکەم کۆسپی ناکاو بێتەوەو بەرگریەکی باشیشی بکا، بەر لە مردنی پاپا لە چوار هۆکارەکە سیانی بەجێ گەیشتن، ئەوەندەی نەمابوو چوارەمیشیان بەجێ بگەیەنێ ، بەوەی توانیی بەسەر ئەو میرە لە دەسەلات کەوتانەدا زاڵ بێ لە ناویان ئەوانەی دەستی پێیان گەیشت ، ژمارەیەکی کەمیان توانیان لەدەستی رابکەن و نەجاتیان بێ ئەوانیتر لەناو بردران ، رەزامەندی ئەشراف و پیاو ماقولانی رۆمای وەدەست هێنا، لە کۆلیژی ئاینی لایەنگیری زۆری هەبون ، سەبارەت بە مولکە نوێکان ، نەخشەو پلانی دانابو کە دەست بە سەر توسکانەدا بگرێ لە کاتێکا ماوەیەک بوو بروجیە و بیومبینوی هەبوو لەگەڵ پاراستنی (حەما) ش بە دەست خۆیەوە بوو ، دیارە لەو کاتەی ئیسپانیەکان پادشایەتی ناپۆلی لەدەست دەدەن ئەم لە فرەنسیەکان ناترسێ چونکە ئیسپانیەکان لەو دەترسان بۆیە ئەم هەردوو لایەنی مسۆگەر کرد ئەوسا دەستی گرت بەسەر (بییزە) دا.

دواتر لۆقەو سینە بە خوازیاری رابەرایەتی خۆیان بەو سپارد ، یا لە بەر تەماحکاری فلۆرەنساوە بوو یا لە ترسا ، بەلام فلۆرەنسا لەروی دەسەلاتەوە

لاواز و بێهێز بوو ، ئەگەر ئەوەی پار سال بۆ دۆقیە چوە سەر ئەمساڵیش بۆی بچێتە سەر کە پارساڵ ئەسکەندەر کۆچی دوایی دەکا ، ئەوکات هێز و ناوبانگێکی ئەو تۆ بەدەست دێنێ کە بتوانی پشت بە هێز وتوانای خۆی ببەستێ ، بەلام ئەسکەندەر پێنج ساڵ بەسەر مردنیدا تێپەر بوەو هیچی وای بۆ کورەکەی جێ نەهێشت جگە لە ویلایەتی رومانیای پتەو نەبێ، جگە لەو ولایەتە ئەوانی تر لە نێوان دووهێزی دوژمنی زەبەلاحدا هەلواسراون و لە پشتیشیان نەخۆشیەکی کوشندە هەیە ، بەلام وێرای ئەمانە دۆقیە کەسێکی بەهێز بوو ، شارەزاو پسپۆری دڵی خەلک بوو ، شارەزا بوو لە راکێشانی سەرنجی خەلک و چونە ناو دڵیان ، لە هەمان کاتدا لە تۆقاندیشدا شارەزاو پسپۆر بوو ئەمانە بونە بنەمای بەهێز بون و هەلسانەوەی سەرپێی لە ماوەیەکی کورتدا ، ئەمە ئەگەر بەهۆی ئەو دوو لەشکرە بەهێزەی دوژمن و نەخۆشیە کوشندەکەی نەبوایە ، بەدڵنیایەوە بەسەر هەموو تەنگ و چەلەمەیەکدا زاڵ دەبوو .

بۆ سەلماندنی راستیی بنەما مکومیەکەی ئەوەیە کە رومانە ماوەی زیاتر لە یەک مانگ لە چاوەروانی دا دەبێ ، لەوکاتەی لە رۆما لە نێوان مان و نەماندا بوە وێرای هاتنی (فیلی و ئۆرسینی بۆ ولات کە هیچ رێگر وناحەزێکیان لە پێشدا نەبوە کە بیکەن بە پاپا بەلام ئەم هەر پێگەی بەهێز و جلەو بەدەست بوە ، تا ئەو کاتیش ئەو دەسەلاتانەی هەبونە هەرکەسێک شیاوی پۆستێک نەبوبێ ئەم دوری دەخاتەوە ، ئەمە هەرچەندە بە مردنی ئەسکەندەر سەرجەم کارە قورسەکان لەبەردەمی ئاسان دەبن ، رۆژێک کاتی پاپا یولیوسی دووەم پۆستی پاپایەتی دەگرێتە دەست ئەم پێی ووتم:

هەموو ئەو هەولانەی داومن و هیوام بۆی خواستوە بۆ کاتی مردنی باوکم بونە ، بۆهەموو کێشەیەک چارەسەریەکم بۆی دۆزیوەتەوە تەنها یەک کێشە نەبێ ، ئەویش دەبێ هەمان کێشەی مردنی ئەسکەندەر بێ کە خەریکە روودەدا.

پێشتر ئاماژەم بەوەدا کە کارەکانی دۆقیە دەبێ وەکو مۆمێک روناککەرەوە بن بۆ ئەو کەسانەی نوێژ بۆ پادشا دەکەن ، یا پشت بە توانای کەسانی ترەوە دەبەستن ،چونکە دۆق خاوەنی کەسایەتیەکی بە سام و بەهێز و خاوەن شکۆ بوو ، ئەم هیچ شێوازێکی تری حوکمرانیی نەبوو جگە لەو شێوازەی گرتبویە بەر، هیچ رێگریەکیش لەبەر دەم جێبەجێکردنی بەرنامەکەیدا نەبون جگە لە نەخۆشکەوتن و کورتی ژیانی ئەسکەندەر نەبێ ، جا هەر کەسێک ئەگەر بیەوێ ببێتە پادشایەکی نوێ و بەسەر هەموو ناحەزانیدا زاڵ بێ و سۆز و دلسۆزی لایەنگران وەدەست

بێنێ ولەشکری ناحەز و دوژمانانی تێک بشکێنێ و میللەت خۆشی بوێ و ترس و تۆقاندن بخاتە دڵی گەل ، سەربازەکانی لە ژێر فەرماندەو گوێرایەڵییدا بن و ئەوەی بیەوێ لەناوی ببا بە ئاسانی دەستی بەسەردا بشکێ وچاکسازی بخاتە نێو داب ونەریتە کۆنەکان وبە ئارەزوی خۆی باج بخاتە سەر کەل و پەلەکان و جارێک بەهێز و جارێک بەخشندە خۆی نیشان بدا، تواناى لە ناوبردنی هێزە کۆنەکانی هەبێ و توانای دڵخۆشکردنی میر و پادشاکانی هەبێ کە ئەگەر سودی پێ ببەخشن ئەگەر زیانی لێ بدەن بتوانێ ترسیان بخاتە دڵ ، ئەوەی بیەوێ ئەمانە هەمویان بکا دەبێ پیادەی رەفتار و رێنماکانی دۆق بکاو دەقاو دەق لاسایی بکاتەوە .
بەلام دۆق لە بەرزکردنەوەی یولیوسی دووەم بۆ پۆستی پاپایەتی هەلەی کرد ، لەکاتێکا داوای بوردنی کردبوو کە ئەم ناتوانێ ئەوەی بیەوێ بۆ پلەی پاپا بەرز کاتەوە  چونکە نەزاندراوە کاردیلێکی بەرزکردبێتەوە بۆ پلەی پاپا لەوانەی کە حەزی لێیانەوە نەبوە یا لەوانەی ترسی خستبوە دڵیان ، چونکە پیاو دەبێ ترس بخاتە دڵی پیاو ، یا لە رقا یا لە ترسا، یەکێک لەوانەی ئازاریان لە دەستی دیبوو (سان بوترس ئەدفینکۆ ، کولونا سان جیورجیو، ئەوسکانیو ) بون بەلام ئەوانەی دوژمانیەتیی دەکردن ئەو کەسانەبون کە ترسیان خستبوە دڵی ، جگە لە (روهان و کەردیلەکانی ئیسپانی ، چونکە روهان لە خزم و نزیکەکانی پادشای فرەنسا بوو پیاوێکی توند و زالم بوو ، ، دواتر پەیوەندیی خزمایەتی لە نێوان کەرادلە ئیسپانیەکان و ئەودا هەبوو بۆیە دەبوایە دۆقیە لە ئیسپانیەکان کەرادلە دابمەزرێنێ یا دەبوایە رەزامەندی پاپا روهان وەرگرێ نەک سان بوتروس ئەدفینکولا بکا بە پاپا ، ئەوەی وا بیر بکاتەوە کە چاکەی ئەمرۆ خەراپەی دوێنێ لە بیر پیاوە مەزنەکان دەباتەوە ، ئەو کەس بە هەلە دا چوە ، ئەم هەلە بیرکردنەوە بوو دۆقیەی لە ناو برد .

**یەکەی حەوتەم**
**ئەوانەی بە تاوانکاری و ناپاکی بون بە میر**

دەکرێ هەندێک جار هەندێک کەس دەستیان بە پۆستی میر بگا بە دوو شێوازی دور لە چاکەو پیاوەتی یا بە هۆی بەختەوە ، من ئەم شێوازە گەیشتنە بە پۆستی حوکمرانی فەرامۆش ناکەم ، یەکێکیان شایەنی باس و خواستە ، کە تایبەتە بە رژێم یا سیستەمی کۆماری ، بەلام دوو رێگایەکەی تر :
یەکەماین:
گەیشتنی مرۆڤ بە پلەی میر لە رێگەی ناپاکی و زولم و چەواشەکاری.
دووەمیان:
گەیشتنی کەسێک بە پۆستی میر بەهۆی ئارەزوو داخوازی هاولاتیانیەوە ، لەمێژوودا دوو نمونە بۆ شێوازی یەکەم هەن،
1- هی سەرەمی کۆن
2- هی سەردەمی ئێستامان ، لە خوارەوە لە سودی هەردوو نمونە دەدوێم چونکە من وای دەبینم هەریەک لەم نمونانە سودی خۆی هەیە .
نمونەی یەکەم /
نمونەی ئاجاکتۆی سقلی دێنمەوە، کە بوو بە پادشای سەرقوسە ، لە کاتێکا لە رەگەزێکی ئاسایی بوە خۆی کوری پیاوێکی دارتاش بوە ، لە هەموو قۆناغەکانی ژیانیدا کەسێکی سەرگەرم و ئاژاوە گێر بوە ، سەرسەختی وگەرمی کارە توندو تیژیەکانی بە هێز و بازوی خۆی ئەنجامی داوە ، ئەوکاتەی دەبێتە سەرباز ، هەموو پلەکان دەبرێ تا دەبێتە حاکمی سەرقوسە ، کاتیکیش بەم پلە دەگا هەولی گەیشتن بە پۆستی میر دەدا ، ئەم پۆستەی بە ناحەزی خەلک و لە رێگەی هەرەشەو توند و تیژی و بێ هاوکاری کەسانی تر وەدەست دێنێ ، ئیتر روو لە هلمقیاری قورتاجنی دەکا کە ئەوکات لەگەل سوپای سقلیە دەجەنگی ، دواتر داوا لە خەلکی سەرقوسە دەکا بەیانیەکەی کۆ ببنەوە بۆ وتووێژ لەسەر پرسێکی گرنگ ، لەو داوایەیدا ئەنجومەنی سانتوی شاری کۆکردەوە ، ووتی لە کارێکی تایبەت بە کۆمار دەدوێین ، پاش گردبونەوەکە فەرمان بەو سەربازانەی دەدا کە پێشتر بۆ ئەم کارەی ئاگادار کردبونەوە کە سەرجەم ئەندامانی ئەنجومەنی سانتۆ و پیاوە مەزنەکانی شار دەستگیر بکەن و لەبەر

چاوی ئەو خەلکە ملیان دەقرتێنن ، دوای ئەم کوشتارگەریە دەست دەگرێ بە سەر شاردا و بەمەش هیچ ئاستەنگێک لەبەردەمیدا نامینن ، خۆی کرد بە میری شار بەخۆشی بێ یا ناخۆشی .
دواتر قورتاجنیەکان دوو جار راوی دەنێن و شار گەمارۆ دەدەن بەلام ئەم دەتوانێ گەمارۆکە بشکێنێ و بەشێک لە سوپاکەی لەو شارە جێبێلێ ، پاشماوەی سوپاکەی بۆ هێرش بردنە سەر ئەفریکا بەکار هێنا ، گەرایەوەوە گەمارۆی سەرقوسەی شکاند ، ئەمجارەیان ئەو گەمارۆی خستە سەر قورتاجیەکان تا ناچاری کردن پەیمانی ئاشتەوایی لەگەڵدا مۆرکەن ، بە مولکەکانی ئەفریکا رازی بون و بۆخۆیان هێشتەوە وسقلیەیان بە جاتوکل سپارد.
ئەوەی سەیری کار وچالاکیەکانی ئەو پیاوە بکا ، بە رێژەیەکی کەم بەخت رۆلی تیا دەبینێ ، چونکە بەبێ هاوکاری هیچ کەسێک بە پۆستی میر دەگا ، لە سەربازیش بە بالاترین پلە دەگا ، ئەم پلەی سەربازی هیچ کەسێک وا بە ئاسانی پێی ناگا ئەگەر هەوڵ و ماندوبونێکی زۆری بۆ نەدا ، توانیویەتی بەسەر هەموو تەنگ و چەلەماکانی ژیانیدا سەرکەوێ ، تێچوی پاراستنی پۆستەکەی بەقەدەر تێچوی وەدەستهێنای بوە ، ئێمە گەیشتن و وەدەستهێنانی پۆستی میر بۆ چاکەو پیاوەتیی ناگێرینەوە ، چونکە هیچ چاکەو پیاوەتی کە مل قرتاندنی خەلکی هاونیشتمانیدا نیە ، خولقاندنی تورس لەدڵی خەلک وتۆقاندنیان بێبەزەیی هاتنەوە بەو خەلکە بێدەسەلات و سڤیلە چ چاکەو پیاوەتیی لێ بەدی دەکرێ ؟ ئەم تاوان و ستەمانە ئەگەر رەزامەندی پادشا وەدەست بێنێ بەلام دلخۆشی و دلسۆزی گەل وەدەست ناهێنی .
خەسلەتەکانی ئاجاتوکل کە بونە مایەی گەمارۆدانی مەترسیەکان و رەواندنەوەی هەرەشەو تۆقاندنی و زال بون بەسەر کاتە سەختەکاندا ، بونە مایەی خۆ بەزل زانین و هەست کردن بە غرور و لە خۆ دەرچون ، بەلام هەڵس و کەوتە نامرۆڤانیەکانی وتوندوتیژیەکانی کە دورن لە رەوشتی مرۆڤایەتی وامان لێدەکا کە ناوی لەگەڵ ناوی پیاوە ناودارەکانی دونیادا نەهێنین ، هەروەها هۆکاری گەیشتنی بەو پلەو پایانەش ناگێرینەوە بۆ بەخت و چاکەو پیاوەتیی .
ئا لەم کاتەمانداو لە ژێر حوکمی ئەسکەندەری شەشەم و لە سەردەمی جیوفانی فولجیانی فەرمان دەدا ئۆلیفرتو دوفورموی برازای پەروەردە بکرێ، ناوبراو دوای باوکی بەمنداڵی دەبێتە جێگرەوەی ، کاتێکیش دەبێتە مێردمنداڵ مامی دەینێرێتە بەر خوێندنی هونەری جەنگ لە ژێر سەرپەرشتی و فەرمانداریێتی

باولو فیتلی بۆئەوەی لە داهاتوو دەرفەتی وەرگرتن و گەیشتن بە پلەو پۆستی جەنگیی گرنگ هەبێ، کاتێکیش باولو تیا دەچێ ئولیفەرتو لە ژێر فەرمندایەتی (فیتلۆزو) برای سەرۆکە کۆنەکە درێژە بە خوێندن و راهێنانەکانی دەدا ، کاتێکیش ئەم مێردمنداڵە کەسێکی بەهێز و بەتوانای لێ دەردەچێ ، بەماوەیەکی کورت دەبێتە یەکێک لە سەرکردە بەتواناکان ، بەلام پێی شەرمەزاری بوو لە ژێر فەمانداریێتی کەسێکی تردا بمێنێتەوە ، بۆیە بریار لەسەر ئەوە دەدا کە فورمو داگیر بکا ، لەم کارەیدا خەلکانێک لە فورمو هەبون داگیرکاریان پێ لە ئازادی ولاتەکەیان خۆشتر بوو بۆیە هاوکاریان کرد ، لەم پرۆژەیدا فیتلیس لەگەڵی هاورا بوو بۆیە نامەیەک بۆ جیوفانی فوجلیانیی مامی دەنوسێ تیایدا دەڵێ :

( دوای ئەوەی ماوەیەکی زۆر لە دورەولات ماومەتەوە ،حەزم لە دیدەنی تۆو دیدەنی شارەکەم کردوە ، بۆیە دەیەوێ بگەرێتەوە بۆ فۆرمۆ لیری لای مام و شارەکەی، دەڵێ زۆرم ئەزیەت کێشاوە تا ئەم شەرەفە وەدەست بێنم ، دەمەوێ خەلکی ولاتەکەم لەو مەینەتانەی من کێشاومن ئاگادار بکەمەوەو پێزانینیان پێ بدەم ، دەمەوێ پێیان رابگەیەنم کە من کاتەکانی خۆمم بە بێبەرنامە نەبردۆتەسەرو بەفیرۆم نەداون ، دەخوازم وەکو کەسێکی سەرکەوتو بگەرێمەوە، بۆیە حەزدەکەم بە یاوەری سەد دانە پاسەوانی سوار لەوانەی هاوەڵ و دلسۆزی خۆمن بگەرێمەوە، داواشی لە مامی کرد کە پێشوازیەکی ئابرومەندانەی لێ بکرێ و داوا لە خەلکی فورمۆ بکا چاوپێکەوتنی لەگەڵدا بکەن و سەردانی بکەن ، چونکە ئەم هەلوێستە تەنها ئابرو بۆ ئولیفەرتۆ ناگێرێتەوە بەلکو بۆ مامی زیاتر دەبێ چونکە مامی راسپێردراوی بوەو ئەم ئەوی بەم پایە گەیاندوە ، جیوفانی هیچ کەم و کوریەکی لە داواکەی برازاکەی نەهێشت هەموو ئەوانەی داوای کردبون رەزامەندیی لەسەردان بۆیە فەرمانی بە خەلکی فورمو دا کە پێشوازیەکی شایستەی بکەن کە شایەن بێ بە کەسێکی پایە بەرز، لە خانوی خۆیدا هێشتەوە .

دوای مانەوەی ماوەیەکی کورت ئولیفەرتو ئامادە باشیی بۆ جێبەجێ کردنی پرۆژە ناپاکیەکەی کرد کە بریتی بوو ؛ داوای دانیشتنێکی لە مامی کرد، ئەمیش رەزامەندیی لەسەر دا، سەرەتا داوەتی جیوفانی فوجلیانیی مامی و چەند گەورە پیاوانی فورموی خوانێک کرد، لەم خوانەدا ئولیفەرتو چوە ناو باس و خواسێکی گرنگ ، باسی لە گەورەیی پاپا ئەسکەندەر و بورجیەی کورە بچوکەکە کرد ، دواتر چوە سەرباسی دەستکەوت و کارە باشەکانی ، دواتر

جیوفانی و هەندێک لە ئامادەبوان وەلامی ووتەکانی ئولیفەرتویان دایەوە ، پاش ئەوە هەلدەستێتە سەرپێ و دەڵێ: ئەم پرسانە دەبێ بە تەنیایی و نهێنی باسیان لێوە بکرێ، بۆیە بانگی ژورێکی تەنیاییان دەکا ، ئولیفەرتو دەچێتە ژورەکەو مام وهەندێک لە ئامادەبوانیش بەدوایدا دەرۆن ، هەرکە دەگەنە ناو ژورەکە بەر لە دانیشتن هەندێک لەو سەربازانەی پێشتر لەو ژورە شاردرابونەوە، لێیان دێنە دەست و سەرجەمیان سەردەبرن . پاش ئەم کوشتاگەریە ئولیفەرتو سواری ئەسپەکەی دەبێ وبەنا وشاردا دەخولێتەوە ، گەمارۆی کۆشکی دادوەرەکان دەدا تا ئەوکاتەی رەهبەرەکەیان لەگەڵیدا دەکەوێتە گفتوگۆ لەسەر پێکهێنانی حکومەت رێکدەکەون ، بەمەرجی ئەوەی بیکەن بە میر ، دواتر هەموو ئەوانەی لێیان دەترسا لەناوی بردن ، ماوەی حوکمرانیی یەکسالی خایاند ، لەو ماوەیەدا تەنها فورمولو ئارام نەبوو بەلکوو ئەو پادشا ومیرانەی دراوسێشیان بەهەمان شێوە بون ، روخانی حوکمی ئولیفەرتو کارێکی ئەستەم بوو، هەروەکو روخانی ئاجاتوکل وابوو ، ئەگەر فێلی قەیسەر بورجیە نەبوایە کە گەمارۆی خانەوادەی ئورسینی و فیتلیی لە سینیجا جیلیە دا ، دوای گەمارۆکە خۆی و فیتلۆزی مامۆستای دەستگیر دەکرێن و دەخنکێندرێن.

هەندێک کەس سەرسام دەبن لەوەی کەسێکی وەکو کاجا توکل ، ئەوەی بیکا لە کاری خەراپەو تێکدان و زولم و ستەمکاری کەچی وا بە ئارامی بتوانێ لە نیشتمانەکەی بکاو ژیانێکی ئاسودە بەسەر ببا ، پاش ئەوەی گەڵ شۆڕشی لە دژ بەرپا بتوانێ بەرەنگاری سەرجەم ناحەز و دوژمنە دەرەکیەکانی ببێتەوە ، لەکاتێکا گەلێک لە پادشاکان لە سەردەمی ئاشتی نەیانتوانیوە دەسەلاتی حوکمرانیان بپارێزن نەک لە سەردەمی شەر و ئاژاوەگێری ، ئەگەر جوامێری وتەندروستی حوکمرانی لە بەکارهێنانی توند وتیژیدا بێ ئەوا باشترین توند و تیژی بۆ وەدەستهێنانی دەسەلات بوە ، بەلام ئەمە درێژە ناکێشێ ، بەلکو بە کاری خزمەتگوزاری دەگۆردرێ ، توندو تیژیی بەربلاویش ئەوەیە کە وردە وردە دەست پێدەکاو پەرە دەستێنێ ، تا رۆژگار بەسەر بچێ ئەم درێژەی دەبێ بێ ئەوەی کەمکاتەوە ؛ ئەوانەی توندتوتیژی رەوا و ئاقلانە بەکار دێنن بەلکوو رەزامەندی خواو خەلکیش وەدەست بێنن ، وەکو چارەنوسی ئاجاتوکل ، بەلام ئەوانەی توند وتیژی بەربلاو بەکار دێنن ، ئەستەمە بتوانن دەسەلات لەدەستیان بهێلنەوەو لەدەستی نەدەن ، بۆیە داگیرکەری نوێ لە سەرەتای مامەلەکردنیدا دەبێ ئەو جیاوازیە نیشانی ئەو خەلکە بدا کە لە نێوان بەکار هێنانی توند وتیژی رەواو توندوتیژی نارەوا یا بەربلا دا هەیە و دایە ئەم لە کام توندو تیژی دایە،

بۆ ئەوەی هەموو جارێک بۆ ناساندنی ئەو دوو جۆرە توندوتیژیە نەگەرێتەوە خانەی سەرەتایی ، بەڵکو لە سەرەتاوە ئاماژەی پێبداو بیسەلمێنێ ئاخۆ کام لەو دوو توندو تیژەی مەبەستە . بەم شێوەیە گەل لە کارەکانی دڵنیا دەبێ ومتمانەی پێ دەبەخشێ ، ئەوەی ئەمە نەکا بەردەوام لە دلەراوکێ و ترس وگوماندا دەمێنێتەوە بێ ئەوەی رەزامەندی ومتمانەی خەڵک وەدەست بێنێ، دەبێ هەمیشە بە ئاگاو خەنجەر بەدەست بێ ، ئەمجۆرە کەسانە وێرای دلنیا نەبون لە هاولاتیان ، ناتوانن گرەویشیان لەسەر بکەن و بۆ بەرنامەکانی پشتیان پێ ببەستن ، ئەمە چونکە میللەتیش متمانەی بەو پادشایە نیە وگرەوی لەسەر ناکەن ، ئازارەکان با یەکجار روبدەن نەک رۆژانە لەبەر چاویان یا لە دڵیاندا بن بۆئەوەی ئەنجامەکانیش یەکجار چارەسەری بکرێن ، بەلام چاکەکان دەبێ رۆژانە بن بۆئەوەی رۆژانە خەڵک خۆشیان پێبدا وبەهۆیانەوە لە خۆشی ومتمانەییدا بژین ، سەرباری ئەمانە دەبێ میر لەسەر یەک ئاست لەگەل میلەتەکەیدا بژی و مامەڵە بکا نەک رۆژانە بە بەرنامەی جیاو شێوازی جیا هەڵس و کەوت بکا ، نابێ بە کردەوەیەک رەوشتی بگۆردرێ، بە چاکە یا خەراپە، ئەگەر چاکەیەکی کرد بە ئەرکی خۆی بزانێ نەیکا بە چاکە بەسەر خەڵکەوە دەبێ ئەمە لای میر ببێتە پیشەو ئەرکی سەرشان ، تا لە دڵان دور نەکەوێتەوە .

## یەکەی هەشتەم
## لەسەر میرنشینە مەدەنیەکان

ئێستاش با س لە کەسێک دەکەین کە خەڵک و دانیشتوی میرنشینە، بە زۆر و بە رێگەی توندوتیژی بە پلەی میر نەگەیشتوە، بەڵکو بە رەزامەندی هاونیشتمانیەکان بوە، ئەمەیە پێی دەوترێ میرنشینی مەدەنی ، وەدەست هێنانی ئەم پۆستەش بەندە بە بەخت یا بە توانا کەسیەکانەوە ، ئەوەی چاوی لە میرنشینە دەبێ ئەمە لە بەرچاو بگرێ یا بە رەزامەندی خەڵک یا بە رەزامەندی جوامێرو پیاوماقولان و تایبەتەکان دەبێ ، چونکە ئەم دوو توێژە دژ بەیەکە لە هەموو کۆمەڵگاو دەولەتێک هەن ، سەرچاوەکەشیان بۆ خۆ پاراستن لە زولمی گەورە پیاوان تەنها ئامێزی گەلە ، ئارەزوەکانی پیاوە مەزنەکانیش تەنها رسواکردنی گەلە ، بونی ئەم دژە حزبەش لە هەر وولاتێک یەکێک لەم سێ دەرەنجامانەی لێ دەکەوێتەوە:

1- یا حکومەتێکی رەها
2- یا ئازادی
3- یا یا توندرەوی لە ئازادی وگێرەشێوێنی دەبێ.

توندرەوی ئازادی لە یەکێک لەم دوو رەهەندانە دەردەکەوێ : یا لە گەل، یا لە ئەشرافەکان ، چونکە هەر یەک لەم دوو گروپە بەدوای دەرفەتێکدا دەگەرێن کە بتوانێ سودی لێ وەرگرێ و بەلای بەرژەوەندیەکانی خۆیدا بەرێ، کاتێک ئەشرافەکان دەبینن کە ناتوانن بەرگەی داخوازیەکانی گەل بگرنن ناچاردەبن یەکێک بۆ میرنشین بەرز دەکەنەوە تا پیلانەکانی خۆیانی پێ ئەنجام بدەن ، بەهەمان شێوە کاتێک گەل دەبینێ دەستەوەستانە بەرانبەر بە بەرگریکردن لە داخوازیەکانی ئەشرافەکان یەکێک لەوان بۆ میرنشینی بەرز دەکرێتەوە تا خۆیانی لە پەنا حەشار بدەن وپێی بپارێزن ، ئەوکاتەی لە ئەشرافەکان یەکێک بۆ میر بەرز دەکرێتەوە ئاستەنگی زیاتر دێنە رێگای لەوەی یەکێک لە چینی گەل بەرز دەکرێتەوە ، چونکە ئەوەی لە ئەشرافەکان بۆ میر بەرز دەکرێتەوە ئەوەی لە دەوری خۆیدا دەبینێ نمونە وهاوشێوەی خۆیەتی ، ئەوانیش لە بەرێوە بردن وکارە ئاساییەکان نەشارەزان بۆیە گرفتی زۆری بۆ دروست دەبێ ، بەلام کاتێک یەکێک لە چینی زۆرینەی گەل وبە رەزامەندی ئەوان دێتە سەر حوکم و دەبێتە میر ئەوکات خەلکە زۆرینەکە لە دەوری دەئالێنەوەو لە بەرێوە بردنی کاروبارەکان

هاوكاری دەبن ، جگەلەمەش رازی كردنی ئەشرافەكان كارێكی قورس دەبێ چونكە ئەوان بە دادپەروەری و كۆتایی هێنان بە ئازار دانی خەلك، رازی نین ئەگەر جیاوازیەك لە روی سودمەندی وتایبەتمەندیەوە نەیانبی ، یەكسانی لای ئەوان نادادپەروەریە ، بەلام دادپەروەری ویەكسانی و كۆتایی هێنان بە ئازاردانی خەلك و مەینەتیەكان بۆ زۆرینەی خەلك دەستكەوت و دادپەروەرین رەزامەندی ئەوخەلكە بە رەها وەردەگیرێ ولە حوكمرانی و بریارەكانیدا سەركەوتو دەبێ .

ئازاردانی خەلك نادادپەروەری زەوتكردنی مولكی خەلك لە داخوازیەكانی ئەشرافەكانە وبە پێچەوانەش داخوازیی زۆرینەی گەلە ، بۆیە میر ناتوانێ خۆی لە نەفرەت و تورەیی گەل بپارێزێ هەردەم بەر شالاوی تورەیی و نەعرەتەی ئەو خەلكە دەكەوێ، بەلام دەتوانێ خۆی لە ئەشرافەكانی تر بپارێزێ ئەمەش بەهۆی كەمی ژمارەیانەوە.

ترسی میر لەگەل، ئەوەیە كە پەراوێزی خەن وخۆیانی لێ وەدور خەنەوە ، بەلام ترسی میر لە ئەشرافەكان، بەرەنگار بونەوەی كردارەكانیەتی، چونكە ئەوان لە زۆرینەی گەل دوربین تر و مەكرزانترن ، ئەوان دەزانن كاتی گونجاو هەلبژێرن بۆ خۆ دەرباز كردن و لایەنگری كردنی كەسی سەركەوتوو لایەنی سەركەوتو هەلبژێرن ، دواتر میر ناتوانێ بەبێ گەل بژی، هەر ئەو گەلەیە كە میرەكان دەگۆردرێن و هەمان گەل دەمێنیتەوە بۆیە جگە لەو گەلە هیچ ئەلتەرناتیفێكی تری نیە بەلام بە گۆرانی بار ودۆخەكان ئەشرافەكان دەگۆردرێن ، دواتر میر لە دەسەلاتیدایە گەل بۆ ئاستی ئەشرافەكان بەرز كاتەوەو ئەشرافەكانیش بۆ ئاستی زۆرینەی گەل دابەزێنی .

بۆ ئەوەی زیاتر رۆشنایی بخەمە سەر بابەتەكە دەمەوێ بلێم:

( لە دوو دیدی جیاوە لە ئەشرافەكان دەروانێ ، هەندێكیان پشتیان بە بەختی میر بەستوە ، هەندێكیشیان دژی ئەون ، ئەوانەی پشتیان بە تۆوە بەستوە نابێ بەرانبەریان دەست گرتوبیت دەبێ پاداشت و دیاریان پێ بدەیت لەگەلیان بەخشندەو دلكراوە بیت.

ئەوانەی دژ بە تۆن و پشتیان بەتۆوە نەبەستوە ، دەبێ بە دوو روو حسابیان بۆ بكەیت ، هەندێكیان لە ترسا ئەم كارە دەكەن وئەم هەلوێستە وەردەگرن ، ئەوانە دەبێ سودیان لێ وەرگری كاتێك دێنە سەر ئەو رایە پشتگیریت بكەن سودیان بۆت دەبێ لە ئاستی ئەواندا شكست ناهێنی ، هەندێكیشیان بە تۆوە پەیوەستن و خۆیان بەتۆوە گرێداوە بەلكو سودت لێ دەبینن پشتیان بەتۆوە گەرمە ، ئەوان بەجیاواز سەیری نێوانی خۆیان و تۆ دەكەن جیاواز لەگەل سەیر كردنی ئەوانی تر

، ئەو جۆرە کەسە بە هەستیاری مامەڵەکانیان دەکەن دەبێ میر لەو جۆرە کەسانە بەئاگاو وشیار بێ ، ئەمانە بە دوژمنی شاراوە بزانە چونکە هەرکاتەی دەرفەتی بۆ رەخسا لە پێناو بەرژەوەندیەکانی خۆیدا درێغی لە خیانەت وناپاکی ناکا ، ئەو میرەی بە خۆشەویستی گەل گەیشتۆتە پادشایەتی دەبێ دۆستایەتی وخۆشەویستی گەل بپارێزێ ، ئەمەش کارێکی ئاسانە چونکە گەل داوای شتی زۆر ناکا جگە لە نەهێشتنی فشار و لابردنی زولم و زۆرداری نەبێ.

ئەوەی بە هاوکاری ئەشراف ودژی گەل بە پادشایەتی دەگا ، ئەوە دەبێ زوو خۆشەویستی گەل مسۆگەر بکا ، ئەمەش کارێکی ئەوەندە قورس نیە چونکە خۆشەویستی گەل ئەوکاتە بەدەست دێ کە ژیانیان بپارێزی و لە بەرژەوەندیەکانی ئەوان کار بکەیت چونکە مرۆڤ بە سروشتی خۆی ئەگەر چاوەروانی کارێکی چاک لە یەکێک بکا ئەوا خۆشیان دەوێ و خەراپەیان بۆی نابێ ، ئەوکات گەل زیاتر خۆشی دەوێی لەوەی ئەگەر بە رەزامەندی گەل گەیشتبێتە پلەی پادشایەتی ، ئەوکاتیش خۆشەویستی گەل بێ مەرج دەبێ کارێکی ئاسانە چونکە هیچ بنەما ویاسایەک نابن بۆ ئەو خۆشەویستیە.

لەکۆتاییدا دەڵێم : ئەرکی میرە خۆشەویستی ومتمانەی گەل وەدەست بێنێ ، ئەگەرنا کاتەکانی تەنگانە هیچ شوێنێکی نامینێ خۆی لێ بپارێزێ و ژیانێکی ئاەامی لێ بباتە سەر .

میری ئەسپارتا (نابیس) توانیی بەرگری گەمارۆی گریکەکان و سوپای رومانیا بگرێ و لە خاکی ولاتیان وەدەر نێ و لە تەختی پادشایەتیش بمێنێتەوە ، بۆئەو ئەوەندە بەس بوو کاتێک کەوتە تەنگانەوە بەشێکی کەم لە یاوەرانی هاوکاریان کرد توانیی شەر لە خاکی ولات دورخاتەوەو بەسەریاندا زاڵ بێ ، ئەم بەشە کەمەی بەرگریان لێی کرد وهاوکاریان کرد ئەگەر رۆژێک لە رۆژان میریان خۆش نەویستبایەو بە میری خۆیانیان نەزانیبایە ئەوا هاوکاری نەدەبون ولەم تەنگەتاوە بۆی نەدەبونە فریشتە، کەس دژایەتی راو بۆچونەکانی نەدەکرد بۆیە بێ سێ و دوو هاوکاریان کرد ، لەم حالەتەدا ئەو پەندە بەسەر ئەو کەسە جێبەجێ نابی کاتێک دەڵێن:

( ئەوەی لەسەر رەزامەندی گەل بنیاد دەنێ، هەروەکو لەسەر لم بنیادی ناوە ) ئەمە بۆ ئەو حالەتەیە کەسێک لە چاوەروانی دەربرینی نارەزایی گەل بێ تا فشار بخاتە سەر ئەو کەسەی زیندانیی کردوە، بەهۆیەوە ولە ژێر فشارەکانی گەل ئەم ئازاد بکرێ ، ئەم پەندە بۆ ئەو ئومێد و هیوایانە گوتراون کە بێ هودەو بێ سودن

. ئەگەر زۆر وشیار نەبین ئەم پەندە بە هەڵەماندا دەبا هەروەکو هەندێکی بەهەڵەدا برد وەکو (جراکسون لە رۆما و سنیور جۆرجیو سقالی لە فلۆرەنسا)
بەلام ئەگەر میر خۆی لەسەر ئەم بنەمایە دروست ببو ، کەسێک بوو خاوەن هێز و ئیرادە خۆی بریاری دەداو هەر خۆیشی جێبەجێی دەکرد گوێی بە هیچ ترس وهەرەشەیەک نەدەدا ، خۆی لە کارەساتەکان بێدەنگ نەدەکرد ، لە توانایدابوو لە کاتەکانی نەهامەتی وکارەساتەکاندا ورەی گەل بەرزکاتەوەو لە ئاستیان بگۆرێ ، ئەوا کاری ئەم جۆرەکەسانە ناتوانی بلێێ لەسەر لم دروست کراوە .
لە بنەرەتیشدا ئەو میرنشینانەی کە لە سەرەتای ئەم یەکەدا ناومان هێنابوو ( میرنشینی مەدەنی.و) دەکەوێتە مەتسری ئەگەر حاکمی ئەو میرنشینە لە حاکمێکی مەدەنیەوە ببێتە حاکمێکی رەها، چونکە ئەو حاکمە رەهایانە یا راستەوخۆ لەلایەن خۆیانەوە فەرمان دەردەکەن و حوکمرانی دەکەن ، یا لەرێگەی کرێکارەکانی خۆیانەوە حوکمرانی دەکەن ، لە حالەتی دووەمدا سەنتەری حوکمرانیەکەیان لاواز و بێ دەسەلات ددەبێ و دەکەوێتە ژێر هەرەشەی لەناوچون ، چونکە دەکەونە ژێر دلۆڤانی کرێکارەکان کە بونەتە حاکم لەو شارە ، چونکە ئەو کەسانە دەتوانن حاکمەکانیان بخەنە تەلەی هەلەکان وتوشی گرفت و کێشەیان کەن ، لەو حالەتانەشدا دەتوانن لە فەرمانەکانیان هەڵگەرێنەوەو بە گوێیان نەکەن ، ئەوساش حاکم ناتوانێ حوکمێکی رەها بکا وبەسەر ئەم گرفتانەدا زاڵ بێ ، چونکە ئەو خەلکە لەسەر ئەوە راهاتون گوێرایەلی میر و حاکمەکەیان بن، بەلام لەو کاتانەی حاکم پێویستیی پێیانەو گرەو لەسەر چەند کەسێک یا توێژیک دەکا ئەوکات رەتکردنەوەی فەرمانەکان و گوێرایەل نەبونیان ، حاکم توشی کارەسات دەبێ ، لە حالەتی ئاشتی و ئارامیشدا حاکم ناتوانێ ئەو خەلکە هەلسەنگێنێ و حوکم لەسەر داهاتویان بدا، چونکە ئەوانەی لەم بارو دۆخانە گفت و پەیمان بە حاکم دەدەن درۆی لەگەڵدا دەکەن ،راستە پەیمانی دلسۆزیی پێدەدەن ئەوان دلسۆزی خۆیان نیشانی میر دەدەن ، وا خۆیان دەردەخەن کە ئامادەن لە پێناویدا بمرن چونکە ئەم مردنە دورە تا ئەوکاتەی پێویستیی پێیان دەبێ، بۆیە لە پەیمانەکانی خۆیان ناترسن کە دڵنیان بەجێ ناگەیندرێن، ئەوکات دەردەکەوێ کێن ئەوانەی دەبنە خاوەن پەیمانەکانی خۆیان .
ئەوکاتانەی حاکم لە تەنگەتاوو پێویستیدایە بۆ روبەرو بونەوەی کارەسات وکێشەکان .پێویستی بەو کەسانە دەبێ کە گرەوی لەسەر کردون ئەوکات ئەوجۆرە خەلکانە دەردەکەون ئاخۆ خاوەنی پەیمانەکانیانن یان نا ، چونکە کاتی پێویست وکاتی تەنگانە میر ژمارەیەکی کەم لە دەوری خۆیدا دەبینێ ، بۆیە میری ئاقل

ئەوکەسەیە کە بەدوای ئەو ئامراز وپێداویستیانەدا دەگەرێ کە بەردەوام گەل بخاتە ژێر پێویستبون بە حوکمی میر، ئەگەر بەردەوام پێویستیان بە میر هەبوو ئەوکات دەکرێ گرەو لەسەر ئەوخەلکە بکەیت .

**یەکەی نۆیەم**
**چۆن هێزی حکومەتەکان دەپێوی ؟**

لەکاتی ئەنجام دانی توێژینەوە لەسەر دۆخی میرنشینەکان ، پێویستە لە دیدی ئەوە سەیربکرێ کە خاوەنی میرێکە دەتوانێ خۆی بەتەنیا لە کاتەکانی خەتەرناکدا خۆی لە مەترسیەکان بپارێزێ ، یا پێویستی بە هاوکاریەکانی کەسانی تر نەبێ ، بۆ زیاتر رونکردنەوە دەلێم:

من دەڵێم ئەو میرە دەتوانێ بەتەنیا و بێ هاوکاری لایەنانی ترخۆی لە مەترسیەکان بپارێزی ئەگەر لە رۆژە تەنگانەکاندا توانیی بەهۆی زۆری ژمارەی پیاوەکانی و هەبونی سامان و دارایيەوە کۆمەڵێک لە سوپا بۆ روبورەوبونەوەی دوژمنانی ئامادە بکا. ئەگەر رۆژانی تەنگانە هەر میرێک لەکاتی هێرشی دوژمندا خۆی لە پەنای شورەکان حەشاردا لە حالەتی بەرگری دابوو نەیتوانی هێرش بەرێتە سەر دوژمن ئەو جۆرە میرانە پێویستیان بە پاراستن هەیە . بەکورتی هەندێکمان باس لە حالەتی یەکەم کرد ، ئەگەر دەرفەت بوو زیاتری لەسەر دەدوێین .

لە حالەتی دوەم دا ، میر پێویستیی بە هیچ نابێ، تەنها قایم کردنی شارو پاراستنی نەبێ ، لەم حالەتە میر دەبێ بایەخ بە توند کردنی شورەی شار ودەستەبەر کردنی کۆگا و عەمبارە بۆ هەڵگرتنی کەل و پەلە پێداویستیەکانی سوپا ، هەموو ئەو پێویستیانەی سوپا دەبێ دابین بکرێن ، لەم روەوە دەکرێ ناوچەکانی تری ولات فەرامۆش بکرێن بەهۆی زیاتر بایەخدان بە شار، ئەگەر میر ئەمەی کرد ئەوا رەزامەندی گەلی وەدەست هێنا ، جا هاوار لەو کەسەی بتوانێ مەترسی بۆ ئەم جۆرە میرە پەیدا بکا ، چونکە میللەتەکەی لێی رازیەو شوێنەکەی قایم و پارێزبەند

کراوه دوژمنانی له هێرشبردندا دودڵ و رارا دەبن ، ناتوانن به دلنیاییەوه هێرش بەرن ، چونکه ئەوان وادەبینن ئەگەر هێرشی بکەنه سەر جگه له شکست خواردن ئەنجامەکەشی خەراپ دەبێ ، ئێستاش نمونەیەکتان لەسەر ئەم حالەته له شارەکانی ئەلمانیا بۆ دەهێنمەوه :

ئەوێ ولاتێکی ئازاده ، کاتێک ئیمپراتۆر پێویستیی پێیان بێ فەرمانەکانی جێبەجێ دەکەن وگوێرایەلی دەبن ، نه له دوژمن نه له هیچ پادشایەکیش ناترسن ، چونکه ئەو شارانه به شورێکی پۆلایین دەور دراون و دوژمن له توانایدا نیه بیبەزێنێ ، ئەم شوره پۆلایینه دوژمن دەترسێنێ ، بەهۆی ئەوەی بەشی خۆی له چەک وتفاق و خۆراک و وپێداویستیەکانی جەنگ عەمبار کردوەو کۆگاکانی پر کراون له خۆراک و خواردنەوه که بەشی ساڵێکی بکا ، بۆ وەرگرتنی رەزامەندی چینەکانی خوارەوه دەبینین که جەماوەر ئامادەیه بۆ ماوەی ساڵێک کارو خزمەتگوزاریەکانی رۆژانەی شار ئەنجام بدا بێ بەرانبەر ، ئەمەش دەبێته مایەی تۆقاندنی دوژمن وهێرشبەران ، دواتر تا ئێستاش مەشق وراهێنانه سەربازیەکان به چاوێکی ریزەوه سەیر دەکرێن ، بۆ پاراستن و راگرتنی ئەم یەکریزەش یاسای تایبەتی و هەمیشەیی هەن .

جا ئەو میرەی لەگەڵ میللەتەکەیدا خۆی له ناو شار بەو شوره و به دەوردانی جەماوەر پاراستوه له توانایدایه روبەروی دوژمن بێتەوه ، هێرشبەرانیش ئاماده نین هێرش بەرنه سەر ئەم جۆره میرانه چونکه دڵنیان که هێرشەکانیان سەرکەوتن وەدەست ناهێنێ و شکستخواردو دەبن ، دواتر ئەستەمه سوپایەک بتوانێ ماوەی یەک ساڵ گەمارۆی شارێک بدا ، هەندێک کەسیش هەن دەڵێن ئەو سەربازانەی له نێو شاره گەمارۆدراوەکان دەبن قەبولی ئەوه ناکەن مولک و سامانەکانیان له دەرەوەی شار بەدەست دوژمنەوه بێ، بۆیه ناچار دەبن خۆیان بدەن به دەستەوه چونکه ئەوان ئاماده نابن دەستبەرداری سامانەکانیان بن ، من دەڵێم نەخێر ئەو میرەی لەگەڵ گەلەکەی له نێو شورەی شاردا گەمارۆ دەدرێ توانای راگرتنی ئەو خەلکەی هەیه که ورەیان بەرزکاتەوەو له کاتێکا ئەو خەلکه زۆرینەیان میرەکەی خۆیان خۆش دەوێ ، دیاره میرێک بەو رێژه ئازاو بەجەرگ بێ دەتوانێ مەترسیەکانی دوژمن به وکەسانه نیشان بدا که نیازی خۆوەدەستدانیان هەیه ، ئەم کارانه بۆ ئەم جۆره میرانه کاری ئاسانن ، ئامۆژگاریان دەکا و دلنەواییان دەداتەوه که دوژمن ئەوەنده ناکێشێ وئەگەر کەسێک خۆی رادەستی دوژمن بکا تۆلەی لێدەسێنێتەوه ، ئەم جۆره مەترسیانه میر دەبێ بۆ خەلک رونکاتەوه تا بەرگەی ئەو گەمارۆیه بگرن و ئومێدێکیان پێ ببەخشێ که ئاستەنگەکه کاتیه ورۆژێک دێ

بەسەر دەچێ و ئەوان دەبنە قارەمانی ئەو داستانە . ئەم جۆرە ئامۆژگاری و رینماییانەی میر دەتوانێ ورەیان بەرزکاتەوە ، ئەوانیش کاتێک دەبینن میر بە دەسەلات و سامان و مومتەلەکاتیەوە لەگەل ئەوان بە یەکسانی روبەروی مەترسیەکان دەبێتەوەو لەبەر چاوی میر خانوو سەروەتەکانیان دەفەوتێ و لە بن دەچن ، دیارە مرۆڤیش بە سروشتی خۆی سامان و مومتەلەکاتی خۆی خۆش دەوێ بۆیە دلنیان لە کاتی رزگار بونیان ئەم زیانانە وون نابن و میر بۆیان قەرەبوو دەکاتەوە ، بۆیە میری ئازا ئەگەر بەشێکی باشی لە خۆراک و تفاقی سەربازی لەبەر دەستدا بێ دەتوانێ بەرگری بکا وخۆی لەو مەترسیانەی دوژمن بپارێزێ وگەمارۆکەی دوژمن هەرەس پێبێنێ .

**یەکەی دەیەم**
**قسە لەسەر میرنشینە ئاینیەکانە**

ئێستا باسی میرنشینە ئاینیەکان دەکەین و دەلێین :

ئاستەنگەکانی بەردەم ئەم جۆرە میرنشینانە هی بەر لە دروست بونیانە نەک هی دوای دروست بونیان ، ئەم میرنشینانەش یا بە توانا یا بە بەخت دادەمەزرێن ، دەکرێ بێ هیچ کامیشیان دروست بن، ئەمەش چۆن دەبێ ؟ بەهۆی داب و نەریتە کۆنە ئاینیەکانەوە دەبێ کە بەشی خۆی لە مەرج و تواناو زەمینە سازی هەیە ، دەبنە هۆکار و یارمەتی دەری دروست بونی ئەم جۆرە میرنشینانە، میری ئەم جۆرە میرنشینانەش پادشان بێ ئەوەی بەرگریی لێ بکەن ، گەلیشن بێ ئەوەی حوکمرانیان لێ ، ئبکرێ ، پادشایەتی ئەم جۆرە پادشانشینانە جۆرێکە ، پادشایەک

بێ بەرگری بێ و کەسێک نەبێ هێرشی بکاتە سەر ، ئەگەر گەڵێکیش بێ حاکم بێ و کەس نەبێ میر نارەحەت کا کەوابێ دەتوانین بڵێین ئەم جۆرە میرنشینانە لە هەموو میرنشینەکانی تر ئاسودەو ئارام ترن و بەڕێوە بردنیشیان ئاسانترە ، چونکە ئەم جۆرە میرنشینانە لە سەرەوە یاسا ورێنمای بۆ دێتە خوار پێویست ناکا کەسێک یاسای بۆ دارێژێ یا بۆ سیستەمی حوکمرانیی ئاژاوە بنێتەوە ، چونکە لە دەسەلاتی ئەقل دانیە باس لەم جۆرە کارانە بکا، ئەمە دەسەلاتێکی خواوەندیە بۆیە من هیچ لەسەر ئەم جۆرە میرنشینانە ناڵێم ، لەبەر ئەوەی خوا ئەم میرنشینانە دەپارێزێ شتێکی شێتیە ئەگەر دەست بخەیتە ئەم جۆرە کارو بارانەو هەوڵی گۆرینی بدەی .
بەڵام پرسیارێکم هەیە :
(چۆن کەلیسا گەیشتە ئاستی ئەو هێز و دەسەلاتە دونیاییە، لە کاتێکا لە سەردەمی بەر لە پاپای ئەسکەندەری شەشەم قەوارەیەکی بێ ریز و لاواز بوو لەبەر چاوی میرە ئیتالیەکان بە گەورەو بچوکیانەوە؟ ، کەچی ئەمرۆ دەبینین رۆژگار بەوە گەیشتوە بتوانێ پادشای فرەنسا (بترسێنێو ) لە ئیتالیا وەدەرنێ ، هەروەها توانیی بەسەر خەلکی بوندقیەشدا زاڵ بێ ؟ ئەگەر ئەمانە پێشتر زانراو بوبن کەواتە دوبارە بونەوەیان زیانیان نیە .
بەرلەوەی پادشای فرەنسا( شارلی)ئیتالیا داگیر بکا ئەوانەی سەرپەرشتی کاروباری فەرمانەکە یان دەکرد ، خەلکی بوندقیە و پادشای ناپۆلی و دوقیەی میلانو و خەلکی فلۆرەنسا بون ، ئەو بەرێزانەش بایەخیان بە دوو لایەن دەدا :

**لایەنی یەکەم /** هیچ بێگانەیەک بە رێگای هێزەوە نەچێتە ناو ئیتالیا .
**لایەنی دووەم /** کەس لەوانەی لەوێن نەبنە خاوەن دەسەلات ، مەبەستە سەرەکیەکەشیان خەلکی بوندوقیەو پاپا بوو ، بۆ بەرپەرچ دانەوەی خەلکی بوندوقیەش ،پێویستی دەکرد خەلکەکە بە ماندوو کردن و بەگەر خستنیان ئامادە بکرێن . هەروەکو ئەمە پێشتر لە بەرگری کردن لە (فرارە ) رویدابوو ، لە پێناو رێگەگرتنیش لە پاپا سیاسەتمەدارەکان پەنایان بۆ بارۆنەکانی روما برد، ئەشرافەکانیش بەسەر دوو حزبدا دابەش ببون ، حزبی ئورسینی وحزبی کولوناس ، ناکۆکیش لە نێوان ئەو دوو حزبە بەردەوام بوو بۆیە هەمیشە لە ترسی پاپا بە چەک وتفاق خۆیان بەستابۆوە و لە ئامادە باشیدا بوون ، بەم شێوەیە توانیان پاپا لاواز کەن، بەلام ناوە ناوە پاپایەکی بەهێز دەبیندرا وەکو پاپا (سیکستۆن)، ئەم پاپا بەهێزانەش بەخت و توانای ئەوەیان نەبوو لە کێشەو شەری ئەو دوو حزبەی ئەشرافدا خۆیان نەجات دەن یا بپارێزن ، هۆکاری ئەمەش بۆ کورتی تەمەنی

پاپاکان دەگەڕێتەوە کە ناوەندی تەمەنیان دەسال دەبوو ، بەم ماوە کورتە توشی ئاستەنگ و گرفتی زۆر دەبونەوەو لە روبەروو بونەوەیان لەگەڵ حزبەکاندا ، کاتێک پاپایەک دەیتوانی بەسەر حزبی کۆلۆناس دا زاڵ بێ کەچی پاپای دواتر دەهات دژایەتی حزبی ئوریناسی دەکرد کە دەبوە مایەی بەهێز بونەوەی حزبی کۆلوناس ولەلایەکی تریشەوە دەبوە مایەی پەرش و بلاو بونی تواناکانی پاپا و بێ بەرنامەییان لە روبەرو بونەوەی حزبەکان، بەم شێوەیە پاپاکان نەیان دەتوانی بەسەر هەردووک حزبدا زاڵ بن چونکە هەرجارەی یەکێکیان بێهێزدەکرا ئەویتریان بەهێز دەبوو، هۆکارێکی تریش ئەوە بوو کە ئیتاليا ریزێکی ئەوتۆی نەبوو بۆ پاپا دونیاییەکان.
کاتێکیش ئەسکەندەری شەشەم دێت لەهەموو پاپاکان زیاتر بەهێزتر دەبێ و بەم دونیایە نیشان دەدا کە پاپا دەبێ چۆن بێ و چۆن بە هۆی هێز و سامانیەوە دەتوانێ دەسەلاتەکانی بەسەر ولاتدا بسەپێنێ ، بۆیە روی لە (دۆقیەی فالنین) کرد، کردی بە ئامرازێک بۆ بە ئەنجام گەیاندنی مەرامەکانی ، کاتێکیش فەرەنسیەکان ئیتاليا داگیر دەکەن باسی لە هەموو ئەوکارانەی دۆقیە کرد ، هەرچەندە وای نیشان دەدا کە ئەو کارانەی کردبونی بەمەبەستی مەزن راگرتنی دۆقیە بون نەک کەلیسا تا دواجار کارەکان بەوە گەیشتن رۆلی کەلیسا بەرز راگیراو دۆقیەش پشتگوێ خرا ، بەرهەمی کارەکانی دۆقیەش لە دوای مردنی وەدەر کەوتن ، دواجار پاپا یولیوسی دوەم دێ کەلیسا دەکاتە بەرپرس لەسەر رۆماو هەرچی باروناتەکانی روماش هەبوون لەناوی بردن .
ئەسکەندەری شەشەمیش پالپشتی هێزەوە توانیی بەسەر حزبەکاندا زاڵ بێ ، زۆررێگای دۆزینەوە کە بتوانێ کەلیسای پێ ببوژێنێتەوە لە کاتێکا ئەم رێگایانە پێشتر لە سەردەمی پاپا ئەسکەندەر شاراوە بوون تاقی نەکرابونەوە، یولیوسی دوەم بەوە نەوەستا بەدوای هەنگاوەکانی ئەسکەندەردا برواو رێچکەی ئەو بگرێ بەلکوو هەنگاوی زیاتری نان ، بریاری گرتنی پولونیا و زال بون بەسەر خەلکی بوندوقیەی دا، هەروەها دەرکردنی فرەنسیەکان لە ئیتالياش یەکێک بوو لە بریارەکانی ، لەم هەموو بریارانەیدا سەرکەوتوو بوو بۆیە شایەنی ستایشە ، چونکە ئەوەی ئەنجامی داو پێی هەڵسا بۆ بەرز کردنەوەی ئاستی کەلیسا بوو نەک بۆ بەرز کردنەوەی ناوو پێگەی خۆی یا کەسێکی تری دیار بوبێ ، دەستی لە هەردوو حزبی (ئورسینی و کولوناس) نەداو وەکو خۆی هێشتنەوە، هەرچەندە هەندێک لە سەرکردەکان مەبەستیان بوو دۆخەکە بگۆرن بەلام بەهۆی دوو ئاستەنگەوە رێگەی پێ نەدان:

1- هێزی کەلیسا کە لێی دەترسان .
2- پێویستیان بە هاوکاری هەندێک لەو کەرادیلانە بوو کە هۆکاری ئاژاوە بون لە نێوان سەرکردەکاندا ، کاتێکیش کەرادیلەکان لەم کارەیان بەردەوام دەبن حزبەکان ئاسودە و بێخەم نابن ، بالۆنەکانیش دیارە ناچارن بیان پارێزن و بە هەموو شێوەیەک بەرگریان لێ بکەن بەهۆیەوە ناکۆکی دەکەوێتە نێوان بارۆنەکان لە ئەنجامی تەماحکاری قەشەکانەوە ، کاتێکیش پاپا لیون ی دەیەم دێت لەوکاتەوە پاپایەتی دەکەوێتە سەنتەرێکی پارێزراو ، هیوا دەخواستران کە بەهۆی کارە چاکەکانیانەوە پلەو پایەیان بەرزتر بکرێ هەروەک پێشتر پاپاکان ئەم بەرزکردنەوەیان بە پەنای هێز و شمشێر ئەنجام دابوو.

**یەکەی یانزەهەم**
**لەسەر جۆرە شەرکەرەکان و سەربازە بەکرێگیراوەکان**

دوای ئەوەی باسێکی تێرو تەسەلمان لەسەر میرنشینەکان وهۆکاری سەرکەوتن وژێرکەوتنەکان پێشکەش کرد ،هەروەها توێژینەوەمان لەسەر چۆنێتی وەدەستهێنان ودامەزراندنیان و پاراستنیان کرد، ماوە باس لە شێوازەکانی هێرش بردن وبەرگری کردن لەو میرنشینانە بکەم ، پێشتر باسم لە زەروریەتی دروست بونی میری بەهێز و مکوم کرد، چونکە بێ ئەو مەرجە مکومیانەی ، میر توشی هەرەس دەبێ ، گرنگترین ستونەکانی مانەوەو پاراستنی میرنشینە کۆن و نوێکان بریتیە لە : یاسای دادپەروەری کە ئێستا باسی لێوە ناکەم ، بەلکو باس لە چەک دەکەم و دەڵێم :

( ئەو چەکانەی میر بەهۆیەوە بەرگری لە میرنشینەکەی دەکا یا دەبێ چەکی خۆی بن یا هی سەربازە بەکرێگیراوەکان بن یا هی سەربازی هاوکاری یا تێکەلاو بن ، سەربازە بەکرێگیراوەکان و سەربازە هاوکارەکان مایەی مەترسین چونکە سودیان نیە ، هەر میر یا پادشایەک پشت بە سەربازە بەکرێگیراوەکان ببەستێ بۆ پاراستنی میرنشینەکەی، هیچ کاتێک دڵنیا نابێ ، چونکە ئەوان لەگەل سەربازەکانی میرنشین یەک ناگرن و خاوەنی بەرنامەو ئەجندای تایبەتی خۆیانن ، ئەوان چاویان لە سود وەرگرتنی تایبەتیە، خۆیان ناخەنە ژێر سیستەم و یاساکانی میرنشینەوە بۆیە جێگەی متمانە نین ، ئەوان لە بەرچاوی دۆستەکانیان ئازایەتی دەنوێنن و خۆیا وا نیشان دەدەن کە سەربازی شەرکەر و ئازان بەلام لەبەرەکانی جەنگ و لە بەردەمی دوژمن ترسنۆک و بێ ورەن ؛ ئەوان لە خوا ناترسن ، خاوەنی هیچ گفت و پەیمانێک نین ، ئەوەی پشتیان پێ ببەستێ با بزانێ ژێرکەوتن لە چاوەروانی ئەودایە ، لە نێوان ئەوو دۆراندندا ماوەیەکی درێژ هەیە کە ئەوان کورتی دەکەنەوە ، ئەوان لە ئاشتی تالانت دەکەن ولە کاتی شەرو جەنگیشدا روبەروی تالانکردنت دەکەنەوە ،واتە لە هەردوو حالەتدا تالانکراوی ، هۆکارەکەشی ئەوەیە کە هیچ پاساوێک نیە بۆ ئەوەی ئەوان لە مەیدانی جەنگا خۆراگر وپۆلایین بن و بەهۆیەوە روبەروی کوشتن ببنەوە ، ئەوان گیانی خۆیان بۆ ئەو کەمە پارەیە ناخەنە مەترسیەوە کە لە بەرانبەر کرێگیراویان وەری دەگرن بۆیە لە شەرەکان خۆراگر نین بێورەو بێ هێز و لاوازن دۆراندن هەمیشە لە پشکی ئەوانە . ئەوان هەردەم ئامادەن بۆ خۆبەکرێدان چونکە ئاشتی هەیە وبەهۆیەوە گیانیان پارێزراوە ، کاتێکیش شەر وجەنگ روو دەدا بەشی ئەوان یا راکردنە یا کۆچ کردن ، دەبوایە من لەمە زیاتر باس لە خەسلەتی ئەم جۆرە پێکهاتەیە نەکەم چونکە ئێستا کاولکاریەکەی ئیتالیا لەبەر چاوە کە پشتی بە سەربازە بەکرێگیراوەکان بەستبوو ئێستا دەبینین چی بەسەر هاتوە . ئەو بەکرێگیراوانە لە نێوا نخۆیاندا ئازایەتی خۆیان بەدەر دێخن و خۆیان وەکو قارەمان نیشان دەدەن بەلام لە راستیدا وانیە بەرانبەر بە دوژمن لاوازو ترسنۆکن.

پادشای فرەنسا کاتێک هێرشی کردە سەر ئیتالیاو گرتی توشی هیچ روبەروبونەوەو بەرگریەک نەبوو کە سەربازە بەکرێگیراوەکان دەیان پاراست ، ئەوکات هەندێک کەس هۆکارەکەیان بۆ گوناهەکانیان دەگێرایەوە ،هەندێک کەسیش بەم گوتەیە بروایان دەهات ، بەلام دیارە مەبەستیان ئەو گوناهە نەبوو کە حکومەتەکەیان سەربازی بەکرێگرتوە بۆ پاراستنی دەولەت بەلکو گوناهی تر بوو.

ئیتالیا لە سەردەمی نەمانی دەسەلاتی ئیمپراتۆریەت وهاتنی دەسەلاتی پاپا ، بەسەر چەند حکومەتێکدا دابەش ببو، زۆر لە حکومەتەکان دژی ئەشرافەکانی خۆیان چەکیان بەرزکردبۆوە چونکە ئەوان بە پالپشتی پاپاکان خورت و بەهێز ببون و دەستیان بەسەر کەنالەکانی حوکمدا گرتبو ، لە م میانە کەلیساکان هاوکاری شارەکانیان دەکرد بۆ ئەوەی دەسەلاتی دونیاییان زیاتر بێ ، لە زۆربەی شارەکان رۆلەیەکی ئەو شارە بوو بە میر ، بەهۆیەوە ئیتالیا کەوتە دەست کەلیسا و هەندێک کۆماری تازە لەدایک بون ، بەلام چونکە لایەنگرانی قەشەو کۆماریەکان لەسەر هەڵگرتنی چەک رانەهاتبون ناچار دەبن سەربازەکانی بێگانە بەکرێ بگرن ، بەناو بانگترین سەرباز کە لە نێو ئەو سەربازە بەکرێگیراوانە ناو دەردەکا (ئەلبر جیوداکومو) دەبێ کە رۆلەیەکی خەلکی رۆما بوو ، (براشیۆ و سوفوزاش) لەوێ دەردەچن بۆیە رۆژێک دەبنە کەسایەتیی بەنابانگی ئیتالیا ، دوای ئەوان هەموو سەرکردە وفەرماندەکانی ئیتالیا دێن کە فەرماندایەتی ئۆپەراسیۆنەکانیان کرد ، لە بەرهەمی ئازایەتیان هاتنی شارل و راونانی لویسی دوانزەهەم و ستەم لێکردنی فرناندو و زولم کردن لە خەلکی سویسرا بوو.

بەرنامەو ئەجندای ئەو فەرماندەی سەربازە بەکرێگیراوەکان بریتی دەبێ لە مەزن و بەرزکردنی پایەی خۆیان و سوکایەتی کردن بە سەربازە پیادەکان ، ئەمەیان بۆیە ئەنجام دا چونکە خاوەنی نیشتمان نەبون باکیان پێنەبوو ، ئەوان لەسەر کەسابەتی رۆژانەیان دەژیان ماوەیەک دەبونە پیادە ئیتر ناوبانگێکیان بۆخۆیان وەدەست دەهێنا ماوەیەکی زۆریان لەم پیادەییە نەدەبردە سەر بۆیە رویان لە ناپاکی وخیانەت دەکرد، بەدوای کرێی زۆردا دەگەران باکیان بە خیانەت نەبوو ، هەرچەندەی ژمارەیان کەم دەبوو ئەوان بە نرختر و بە بایەختر دەبون چونکە لە لەشکرێکی بیست هەزاری تەنها هەزاری لێ پیادە بوو بۆیە هەردەم نرخیان لە زیاد بوندا بوو ، خۆیان روبەروی هەلوێستی مەترسیدار نەدەکردەوە، لای ئەوان پاراستنی گیانیان گرنگترین شت بوو هەر ئەوەشیان لا مەبەست بوو، خۆیان روبەروی هیچ ئاستەنگ وناخۆشی و کاری قورس نەدەکردەوە ، لە شەرەکاندا خوێنی یەکتر و خوێنی کەسیان نەدەرشت ، یا دیلیان دەگرتن یا خۆیان دیل دەبون لەم میانە پارەیان وەردەگرت ، بەشەو هێرشیان نەدەبردە سەر قەلاو شورەو خێمە سەربازیەکان و سەربازگەکان، چونکە مەترسیدار بوو کوشتنی لێ دەکەوتەوە ، ئەوان چالیان لە دەوری سەربازگەکانی خۆیان هەڵنەدەکەند ، شەری هێرش بردنیشیان بۆ سەر چالەکان ئەنجام نەدەدا ، پێیان باش بوو بە زستانان هێرشی مەیدانی ئەنجام بدەن ئەمە ئەو یاساو رێنمایانە بون کە لای ئەوان قەبول و

کارپێکراو بون ، بەڵێ بەم شێوەیە دەجەنگین وبەرگریان لەولات دەکرد تا ئیتالیایان بەم ئاستە نزمە گەیاند.

**یەکەی دوانزەهەم**
**قسە لەسەر سەربازە هاوکار و تێکەڵاوو رەسەنەکانە**

سەربازە هاوکارەکان بە دووەم جۆری هێزە بێ سودەکان دێتە ئەژمار، ئەوە ئەو جۆرە هێزەیە کە میر بۆ هاوکاریکردنی سوپاکەی داوای دەکا ،ئەمەش لە یولیوسی دووەم رودەدا کە دوایین سەردەمەکانی حوکمرانیی دا دەبێ، ئەوکاتە روو دەدا کە یولیوس شکستی سوپاکەی کە لە سەربازە بەکرێگیراوەکان پێکهاتبوو بە چاوی خۆی دەبینێ، ناچارلەگەڵ فراندوۆی پادشای ئیسپانیا رێک دەکەوێ داوای سەربازی هاوکاری لێبکا، بەڵکو هەندێک جار سەربازی هاوکار سەربازی باش بن، بەلام هەمیشە مەترسیدارن بۆ ئەو لایەنەی وەریان دەگرێ ، چونکە ئەگەر ژێرکەوتی ئەوا سەربازەکان رادەکەن ، ئەگەر سەرکەوتی بەدیل دەگیرێن ، هەرچەندە دیرۆکی کۆن پرە لە نمونەی زیندوی تایبەت بەم بابەتە بەلام من بێ دوو دڵی نمونە لەسەر پاپا یولیوسی دووەم دەهێنمەوە ، چونکە هێشتا لەبەر چاوە و لەم روەوە ژمارەی پێوانەی شکاندوە ، کاتێک ویستی دەسەلاتەکانی فراوان بکاو (فرارە) بگرێ کەچی خۆی کەوتە دەست بێگانەوە، بەلام بەختە رونەکەی فریای دەکەوێ و نەجاتی دەدا ، ئەو کاتەی شکست دەهێنێ و سەربازە هاوکارەکانی لە مەیدانی شەر دەبەزن ئەم پەنا بۆ سویسرا دەباو لێی دادەنیشێ، سەرکەوتوەکان وەدەر دەنێن ، ئەمە ئەو هەڵوێستە بوو کە نە خۆی نە هاوشێوەکانی لە چاوەروانیدا نەبون ، هەر چۆنێکی بێ نەجاتی دەبێ و ناکەوێتە دەست دوژمنە سەرکەوتوەکەی ؛ کە بە ناچاری لەدەست سەربازە سەرکەوتوەکانی سویسرا رادەکا ، هەروەها نەکەوتە دەست سەربازە هاوکارەکانیشی ، خەڵکی فلۆرەنسا سوپایان نەبوو

10000 دەهەزار سەربازیان بە کرێ گرت تا هێرش بەرنە سەر (بیزە )، بەم هۆیە گەمارۆیەکی توندی ئەوێیان دا کە پێشتر ئەم جۆرە گەمارۆیەی بەخۆوە نەدیبوو، ئیمپراتۆریەتی قوستەنتینەش دەهەزار سەربازی تورکی لە گریکستان دانابوو بۆ بەرگری کردن ، بەلام ئەوان دوای تەواو بونی شەر ئامادە نابن بکشێنەوە ، ئیتر لەو رۆژەوە ولاتی گریکستان دەکەوێتە دەست تورکەکان .
ئەوەی نایەوێ ولاتێک ئازاد بکا دەبێ ئەم جۆرە سەربازانە بەکار بێنێ کە مەترسیەکانیان لە مەترسیی داگیرکەر زیاترە ، چونکە ئەوان بەدوای خۆیاندا کاولکاری دەهێنن ، دواتر ئەوان لە نێو خۆیاندا یەکگرن ، گوێرایەلی کەسانی ترن نەک تۆ ، بەلام سەربازە بەکرێگیراوەکان ئەگەر سەرکەوتی ئەوا کاتێکی زۆری دەوێ تا بتوانی دەرفەتێک وەدەست بێنی بۆ دەرکردنیان ، چونکە ئەوان یەکگر نین دواتر تۆ رۆژانەیان پێ دەدەیت ، مەترسیەکانی سەربازە بەکرێگیراوەکان لە ترسنۆکیاندایە ، لەوە لێیان دەترسی کە روبەروی کاری مەزن نەبنەوەو خۆیان لە زیانەکانی جەنگ دەپارێزن بەهۆیەوە ناتوانی سەرکەوتن بەدەست بێنی، بەلام مەترسیەکانی سەربازی هاوکار لە ئازایەتیان دایە ، بۆیە میری ئاقل خۆی لە قەرەی ئەم جۆرە سەربازانە نادا کە بێگانەن ، سەربازەکانی خۆی نەبن کەسیتر سودی پێنابەخشن، شکست خواردن بە سەربازەکانی خۆتەوە باشترە لە سەرکەوتن بە سەربازەکانی بێگانە لە هاوکار وبەکرێگیراوەکان ، من لێرە نمونە لەسەر بورجیە ی قەیسەر دەهێنمەوە :
ئەم دۆقیە بە هاوکاری سەربازە هاوکارەکان ئیتالیای داگیر کرد کە زۆربەیان فەرەنسی بوون ، هەر بەهاوکاری ئەوانەوە دەستی بەسەر (ئیمولی وفورلی) دا گرت، کاتێکیش مەترسیەکانی ئەوانی بۆ دەرکەوت ، روی لە سەربازە بەکرێگیراوەکان کرد ،( ئۆرسینی وفیتلیی) بەکرێگرت ، پاش شارەزابونێکی باش بۆی دەرکەوت جێی متمانە نین و مەترسیی لێیانەوە هەبوو بۆیە ناچار دەبێ پەنا بۆ سەربازەکانی خۆی بەرێ ، جیاوازیش لە نێوان ئەم سێ جۆرە ئەوەی شارەزایی هەبێ دەزانێ ناوبانگەکانی دۆقیە چین، ئەو سەرەتا سەربازە هاوکارەکانی بەرەو جەنگ بەڕێ دەکرد دواتر سەربازە بەکرێگیراوەکان و پشتی بە شمشێر وسەربازەکانی خۆی دەبەست ، بۆیە سەرکەوتنی بەدەست هێناو ناوبانگیشی ئەو کاتە دەرکد کە هەموو ئەو خەلکەی دۆست و دوژمنە بۆیان رون بۆوە کە دۆقیە پشت بە توانای شمشێری خۆی و سەربازەکانی دەبەستێ ئیتر یا لێی ترسان یا لێی دڵنیاو بە متمانە بوون .

مەبەستم بوو هەندێک نمونەی مێژوویی لەسەر ئیتالیا بێنمەوە بەلام لەم روەوە ناتوانم (جیرونی سەرقستی) کە پێشتر باسمان کردوە لەبیر بکەم و ناوی نەهێنم چونکە ئەو کاتێک لە سەربازە بەکرێگراوەکان بێ ئومێد دەبێ بیر لەوە بکاتەوە کە لێیان نەجاتی بێ بەلام لە هەمان کاتدا ترسی لێیان دەبێ لەوەی لێی هەلگەرێنەوە بۆیە پارچە پارچەیان دەکا وهەر پارچەی بەرەوە ئاراستەیەک دەنێرێ ئینجا بە پالپشتی سەربازەکانی دەست دەکا بە جەنگ ، دیارە لە تەوراتیش ئاماژەی بەو هەولێستانە داوەو پشت راستی کردون ، کاتێک (شاوول) داوا لە (داوود) دەکا بچێتە شەڕی (جولیات جالوت)ی فەرماندەی فەلەستین ، شاوول مەبەستی بوو هانی داوود بدا بۆیە بەچەک خەلاتی کرد ، بەلام کاتێک تاقیی کردەوە داوود ووتی:

(ناتوانم وەکو ئەوەی خۆی دەیەوێ شەڕی بۆ بکەم، ئەو پێی باشە خەنجەر وکەوانی ئەوم لەدەست بێ ، بەلام خەلک پێی باشە بە چەکی خۆی شەر بکا چونکە چەکی کەسانی تر یا لەدەستت دەکەونە خوار یا لەسەر شانت قورسن یا کارەکانت لێ بە کۆسپ دەکا).

شارلی هەشتەمی باوکی لاویسی یانزەهەم پادشای فرەنسا بە ئازایەتی و بازوی خۆی و بەختەکەی سەرکەوت و فرەنسای لە ژێر دەستی ئینگلیزەکان دەرهێنا ، بایەخ و ئەهمیەتی چەکی تایبەتیی دەزانی بۆیە لای گرنگ بوو خەلک لە شەرا خاوەنی چەک و ئیرادەی خۆی بێ ، هەربۆیەش سیستەمی سوپاو پیادەی لە ولاتەکەی دامەزراند ، کاتێکیش لویسی کوری جێی دەگرێتەوە دەستبەرداری سوپا پیادەکە دەبێ ، سەربازی کرێگرتەی لە سویسرا هێنا ، ئەوانەی لە دوای ئەو هاتن هەمان رێچکەیان گرتە بەر تا کار بەوە گەیشت پادشاکان ژیانیان کەوتە مەترسی و بەو حالە گەیشتن ، کاتێک فرەنسا یارمەتی دەر دەبێ لە وەدەر کەوتنی توانا وناوبانگی سەربازە سویسریەکان لە بەرانبەریشدا دلّی سەربازە پیادەکانی خۆی دەرەنجێنێ ، دروست بونی دیاردەیەکی نوێ لە دەستبەردار بونی سەربازەکانی خۆی و پشتبەستن بە هاوکاریەکانی سەربازە بێگانەکان ، کاتێک ئەم شێوازە بەردەوام دەبێ و پەیوەستیان بە سەربازە بەکرێگیراوەکانی سویسرا درێژەی دەبێ ، خەلکی فرەنسا دەکەونە ئەو بروایە کە ئەوان ناتوانن ولاتەکەیان بپارێزن دەبێ پشت بە سەرنازەکانی بێگانە ببەستن ئەمەش هەست و بۆچونێکی خەراپە ، ئەنجام وەرەنگدانەوەکەی لای خەلکی فرەنسا ئەوەیە کە ئەوان بە سەربازە سویسریەکان ناوەستن چونکە ئەوە لەبەر چاوە ناتوانن ولاتەکەی خۆیان بپارێزن چۆن دەتوانن بەرەنگاری ئەو سەربازانە ببنەوە کە ولاتەکەی ئەوان دەپارێزن ؟ بەم شێوەیە

سەربازەکانی فرەنسا بە شێوەیەکی تێکەلاو دروست بون : هەندێکیان کرێگیراو وهەندێکیان نیشتمانی ، بەلام هەرچی خەراپییەک لەم جۆرە سەربازانەی نیشتمانیدا هەبێ هەر لە سەربازە بەکرێگیراوەکان وهاوکارەکان باشترن .

**یەکەی سیانزە**
**ئەرکەکانی میر بەرانبەر بە سەربازە شەرکەرەکان**

نابێ میر جگە لە هزرو بیری شەر هیچ لە بەرنامەو هزرێکی تری لە مێشکیدا بێ ، چونکە ئەمە ئەرک و پیشەی ئەوەو هەر بەم هۆیەشەوە دەتوانێ فەرمان بداو فەرمان رەت کاتەوە ،سودەکەشی ئەوەیە دەتوانێ بەهۆیەوە پادشایەتی ئەو کەسە بپارێزێ کە بە میری لە دایک دەبێ ، هەروەها دەشتوانێ بەهۆیەوە هەندێک کەس لە چینەکانی تر پلەیان بۆ پلەی میر بەرزکاتەوە ، بینیمان ئەو میرانەی زیاتر بیر لە رابواردن دەکەنەوە لەوەی لە جەنگ ، ئەوان کورسی ودەسەلاتەکانی خۆیان لەدەست داوە ، هۆکاری ئەوەی کە میرەکان میرنشینەکانیان لەدەست دەدەن ئەوەیە کە ئەوان رقیان لە جەنگە ، چارەسەریەکەشی تەنها مەلە کردنە لە دەریای جەنگ.
دوای ئەوەی( فرەنسیسکۆ سفروزا ) کەسێکی ئاسایی دەبێ بەهەول و تێکۆشانی خۆی و توانا وئازیەتیی دەبێتە دۆقیەی میلانو ، بەلام نەوەکانی ویستیان خۆیان لە جەنگ دورخەنەوەو خۆیان لێی پاراست تا ئەنجامەکەی بوە لەدەست دانی پلەکەیان و ببنە کەسێکی ئاسایی ، دەبێ باسیش لەوە بکەین کە ئەو میرەی رقی لە جەنگ وخۆ پرچەککردنە، هاولاتیانی رقیان لێیەو بە دۆقیە یا میرێکی سەرکەوتوی نازانن ، چونکە چەکدار و بێ چەک هیچ کاتێک هاو شێوەو هاوتا نین ، کەسیش بروا ناکا کەسێکی چەکدار سەر بۆ کەسێکی بێ چەک دابنوێنێ ، یا وەکو دەڵێن

کەسانی بێ لایەن و بێ چەک پێیان خۆشە لەناو چەکداراندا بژین ، بێچەکیش هەمیشە لە ترس ودلەراوکێدایە بۆیە ناتوانێ هاوپەیمانی لەگەڵ چەکداران ببەستێ .
دواتر ئەو میرەی لە هونەرەکانی شەر شارەزایی نەبی لەلای سەربازەکانیشی ریزی نابێ و لیی ناترسن و لێی دڵنیا نین کە دۆخێکی ئارامیان بۆ دابین دەکا، بۆیە لە میر ناوەشێتەوە تەنانەت بۆ چرکەساتێکیش لە زانستی جەنگ دورکەوێتەوە ، لەهەمان کاتیشدا دەبێ لە کاتەکانی ئاشتیدا بەم دوو رێگایە شەر بکا :
**یەکەمیان /** کار.
**دووەمیان /** خوێندن
سەبارەت بە کار، دەبێ سەربازەکانی بە چەکداری پێشرەوی بکەن و لە ئامادە باشیدابن ، بۆئەوەی جەستەی تەندروست بێ و لە تەک سروشت بوەستێ و راو بکا ، دەبێ شارەزایی لە چۆنیەتی سەرکەوتنی چیاکان ورۆیشتن بەددۆلەکاندا هەبێ ،شارەزایی لە جۆرەکانی روبارو زێ کاندا هەبێ ، بزانێ چۆن لێیان دەپەرێتەوەو خۆی لە مەترسیەکانیان دەپارێزێ ، ئەم زانیاریانە دوو جۆرە سودیان هەیە :

1- شارەزای خاک و نیشتمانەکەی دەبێ و دەزانێ چۆن شەری تیادەکاو دەیپارێزێ ، شارەزا بون لە سروشتی خاک و چۆنیەتی دانیشتوان رێگای سەرکەوتنەکان نزیک دەکاتەوە ، ئەو میرەی ئەم شتانە نەزانێ کەواتە زانیاریەکانی کەم و کوریان هەیە ، هەر بەم زانیاریانەیە دەزانێ چۆن روبەروی دوژمن دەبێتەوە و چۆن شوێن و سەنگەری باش بۆ سەربازەکانی هەڵدەبژێرێ ، چۆن رابەرایەتیان دەکا ودەیان گەیەنێتە شوێنی ئەمان و شوێنەکانیان پێ داگیر دەکا و شوێن پێگەکانی خۆی قایم دەکا ، مایەی ستایشی نوسەرە رۆلی میری ئەخییەکان (فیلبومن) بەرز بنرخێنم کە لا کاتەکانی ئاشتی بیری لە هیچ شتێک نەدەکردەوە جگە لە جەنگ نەبێ ، ئەگەر کاتی پشوی هەبوایە لەگەڵ هەوالەکانی دەوەستاو دەیپرسی:
2- ئەگەر دوژمن لەسەر ئەم گردە بێ وئێمە لەسەر ئەو گردە بین دەبێ چی بکەین و چۆن چۆنی سوپاکەی دوژمن تێکبشکێنین؟ کامە خالە لاوازەکانی دوژمن دەبن ؟ ئێمە چۆن دەتوانین تێکیان بشکێنین ؟ دەبێ چی بکەین تا لە شکستەکان دور کەوینەوەو سەربازەکانمان لە کوشتن دورخەینەوە ؟

بەم شێوەیە لێی دەپرسین و گوێی بۆ وەلامەکانیان رادەگرت و گفتوگۆی لەسەر دەکرد ، ئەمە ئەو شێوازە بوو کە میر دەیگرتە بەر بۆ سود وەرگرتن لە کاتەکان ووەرزش کردن بە ئەقلی سەربازەکانی لە کاتە کانی پشودا و سود وەرگرتن لە بۆچون و توانا هزریەکانیان تا سەربازەکانیان پێ دەولەمەند و بە توانا کەن ،

خۆ دەولەمەند کردنیش زیاتر بە خوێندنەوەی ژیاننامەوئەزمونی پیاوە ناودارەکان دەبێ کە سود لە ئەزمون و بەسەرهاتەکانیان وەردەگیرێ ، هۆکارە نادیارەکانی گەیشتن بەو پلەو پایانە یان شکستەکان و خالە لاوازەکانیان هەمویان بۆ خوێنەر وسەربازەکان دەبنە بنەمای سەکەوتن و دەولەمەند بون بە ئەزمونی سەربازی ، بەم شێوەیە پەند وەرگرتن لە پیاوە مەزنەکان وهەنگاو نان بە جێپێی ئەوان ولاسای کردنەوەیان لە کارە مەزن و سەرەکوتوەکانیان بۆ سەرکردەکان مایەی سەرکەوتنە ئەوەتا دەبینین کە لەو فەرماندانەی رێچکەی فەرماندە سەرکەوتوەکانیان گرتوەو بە هەمان رێگادا رۆیشتون، سەرکەوتو بونە ئەوەتا دەبینین کە دەڵێن ئەسکەندەر ئەخیلی خەلات کردوەو قەیسەریش ئەسکەندەری خەلات کردوە ، سیبیوش قورشی خەلات کردوە ، ئەوەی مێژوی قورش بخوێنیتەوە کە ئەکزونوفون نوسیویەتی دەزانێ چۆن سیبیو لە کاتێکی خۆش و مرۆڤایەتی خەلاتی دەکا .

میری ئاقل دەبێ لەدوای رێچکەی ئەو کەسایەتیانە بروا و لە کاتەکانی ئاشتی نابی لە جولە بوەستێ و بێ چالاکی بمێنێتەوە ، دەبێ هەمیشە کارێکی وا بکا کە سود بەخش بێ تا لە کاتەکانی جەنگا بەرهەمی کاری ئاشتیی بچنێ ، ئەگەر لەم روەوە بەختی بوو دەستی خۆی دەوەشێنێ .

## یەکەی چواردەهەم
## قسە لەسەر ستایش ولۆمەیی کردنی پیاوان

ئەوە ماوە بلێین کە باس لەسەر ئەو بنەما ورێنمایانە بکەین کە میرلە مامەلە کردنیدا بەرانبەر بە هاولاتیانی و دۆستانی دەگرێتە بەر ، هەرچەندە گەلێک کەس لەسەر ئەم بابەتەی نوسیوە ، من لەوە دەترسێم لەسەر لایەنیکی بانگخواز بمدەنە قەلەم کە لەگەل راکانی ئەو ناکۆک بم، مەبەستم ئەوەیە ئەوەی بینەر بە چاوی خۆی دەیبینێ بنوسرێ و ئاماژەی پێبدرێ ، باشتر ئەوەیە من راستی بلێم نەک بەدوای خەیال بکەوم ، هەندێک کەس مەزندەی هەندێک کۆمار ومیرنشینیان کرد کە بونیان نەبوو ، چونکە جیاوازیەکی زۆر هەیە لە نێوان

ژیانی واقعی ئێمەو ژیانی بەچاو بینراو کە نمونەی زیندون ، هەرکەسێک بونەوەرێک لە پێناو مەرامێکدا پەراوێز بخا ، ئەوە کاولکاری وکارەسات بەسەر خۆیدا دێنی ، ئەوەی دەیەوێ لە هەڵس و کەوتەکانیدا لەگەل خەلک خۆشگوزەر و بە چاکە بێ ، ئەو کەسە ئەگەر رۆژێک لە رۆژان بکەوێتە دەست کەسانی درندە، دڵنیابە پەنجەی پەشیمانی دەگەزێ، کەوابێ ئەو میرەی دەیەوێ لەسەر پلەو پایەی بمێنێتەوە دەبێ هەندێک لە رەوشتە باشەکانی کەم کاتەوە ، دەبێ کاتەکانی بەکار هێنانی خێر وشەر بزانێ و لە کاتە گونجاوەکان ئەم کارانە ئەنجام بدا ، ئەگەر لایەنێکی ئەم رەوشتانەت بۆ میرە خەیاڵ گەراییەکان جێ هێشت ئەو کاتە من بە میرە راستەقینەکان دەڵێم :

(ئەو پیاوانەی لە پۆست و پایەو بەرپرسیارێتی بالا دان کاتێک باسیان دەکرێ یا دەڵێن کەسێکی باشە وخاوەن دڵێکی پاک و بێگەردە یا ئەوەتا دەڵێن کەسێکی خەراپ وبەدکارە ، یەکێکیان دەڵێ باش وئەویتریان دەڵێ خەراپ یەکیان دەڵێ میهرەبان، ئەویتر دەلێ توند وتیژ، یەکیان دەڵێ دەستپاک، ئەویتریان دەڵێ ناپاک، ، یەکیان دەڵێ ئازا ئەویتریان دەڵی ترسنۆک، یەکیان دەڵێ خۆشەویست ئەویتریان دەڵی دڵرەق وبێویژدان، یەکیان دەلێ داوێن پیس ئەویتریان دەلێ بێگەرد و پاک، یەکیان دەلێ ئیماندار ئەویتریان دەلێ بێ ئیمان ، بەم شێوەیە تا خەسلەتی ستایش ولۆمەیی مابن لە وکەسانە دەندرێن .

گومانی تیا نیە کە هەر کەسەو دەیەوێ میرەکەی بە خەسلەتێک لەو خەسلەتانەی سەرەوە ناو بنێ بەلام ناکرێ کەسێک ئەو هەموو خەسلەتە باشانەی سەرەوەی هەبن یا بۆی دروستکەن ، چونکە سروشتی مرۆڤ ئەو هەموو خەسلەتە باشانە هەلناگرێ ، دەبێ میر لەو خەسلەتە باشانە وشیار بێ کە دەیخەنە پاڵی ، وشیاری میر بۆ پاراستنی ناوبانگی دەولەتە بەلکو نەتوانێ هەموو کەم و کوریەکانی دەولەت داپۆشێ ، بەلام ئەو کەم و کوریانەی لەسەر خۆیەتی و بچوکترن دەبێ زۆر لێیان وشیار و بەئاگا بێ چونکە لەدەست دانی ناوبانگی خۆی کارەساتێکی مەزنە بۆی.

ئەو کەم و کوریانەی بەبێ بونیان ناکرێ پادشایەتیی بپارێزێ، نابی زۆر لێیان بترسێ بەلکو لە توانایدا نەبێ لایان بەرێ، بۆیە دەکرێ پادشا هەلگری هەندێک لە وکەم و کوریانە بێ ، چونکە هەندێک جار خەلک وا دەبینێ ئەگەر بەدوای چاکەدا برۆی کارەسات دەقەومێ بۆیە خەراپەکەیان لەبەر چەند هۆکارێکی نەدیار قەبولە ، چونکە هەندێک جار ئەنجام و بەدواکەوتنی کاری خەراپە ، چاکەی بەدوادا دێ و بەپێچەوانەوەش.

## یەکەی پانزەهەم
## لە سەر دەستکراوەیی ورەزیلی(چاوچنۆکی)

بەشێوەیەکی گشتی لەسەر ئەو کارە باشانە دەدوێم کەلە یەکەی پێشتر ناوم هێنان و دەڵێم:
( کارێکی باشە میر بەباشە ناوی بڕواو خەلک باس لە کارە چاکەکان و دەست کراوەیی بکا، بەلام ئەگەر ئەو دەستکراوەییە بەشێوەیەک بوو کە میر ترسی لە هیچ نەبێ ، ئەمە زیانبەخش دەبێ ، ئەگەر چاکەو دەستکراوەییەکەی لە پێناو کاری باش و ئەو ئەرکانەیدا بوو کە پێویستە لەسەر میر ئەنجامیان بدا ئەوکات بەدوای خۆیدا شەرمەزاری بۆ خاوەنەکەی ناهێنێ ، بەلام ئەو میرەی بۆ خۆدەرخستن تەخشان و پەخشانی سامانەکانی ولات دەکا تا بلێن پیاوێکی چاکەو دلکراوەو دەست کراوەیە بێ ئەوەی لە سودەکانی ئەو بەخشینەوە بکۆلێتەوە ، ئەوا بە دڵنیاییەوە دوای ماوەیەک میللەتەکەی بە قەرز وباجێکی زۆر بار دەکا ودەیخاتە ژێر بارێکی نەهامەتی و دەستکورتی ، بەم جۆرە دەبێتە کەسێکی زەوتکەر وتالانکەری خێرو بێری ولات ، بەهۆیەوە لە پێناو وەدەست هێنانی سامان وسەروەتدا بە هەموو شتێک رازی دەبێ ، ئەمەش دەبێتە مایەی تورەبونی گەلەکەی ، لە ئەنجامدا ریز وحورمەتی گەلەکەی لەدەست دەدا ،ئەوکات بەم رەوشت و رەفتارانەی لە تەخشان کردنی سامانی وولات سود بە ژمارەیەکی کەمی ئەو خەلکە گەیاندوە لەسەر حسابی زۆرینە ، واتە هەردەم پێگەی لاواز وبێهێز دەبێ لە بچوکترین لەرزین دەسەلاتەکان لەدەست دەدا ، جا هەر کاتەی بەو بەرنامە هەلەی خۆی ئاگادار بۆوە هەستی کرد کە ئەم دەستبلاویەی لەسەر حسابی زۆرینەو بێبەرنامەییە بێ سودە، ئەگەر گۆرانکاریی خستە ناو ئەو بەرنامەیدا، ئەوکات خەلک دەڵێ کەسێکی

ڕەزیل و پیسکەیە ، چونکە فێری ئەو دەست بلاویەی کردون بە شێوازێکی تر ڕازی نابن ، بۆیە ئەگەر میرێک نەیزانی بە شێوەیەکی دروست دەستکراوەیی بەکار بێنێ وبەخشینەکانی لە جێی خۆیان نەبون ئەوکات دەبێ بەوە ڕازی بێ کە پێی بڵێن کەسێکی ڕەزیل و چاوچنۆکە ، بەلام ئەگەر لە سەرەتاوە دەستکراوەییەکەی لە شوێن و کاتی خۆیاندا بون گەر ژمارەیەکیش بە ڕەزیل ناوی ببەن ئەوا بە درێژایی زەمەن و لە ڕۆژگاری داهاتودا خەلک شارەزای دەبێ بەهۆی سەرکەوتویی بەرنامەکانی ئابوری و پاشکەوت کردنی سامان و سەروەتی زیاترو بەکارهێنانی ئەو سامانەی لە بواری بەرگری ولات لە کاتەکانی جەنگدا ، یا ئەو سامانە لە پرۆژەی مەزن بەکار بێنێ بێئەوەی باری قورسی میللەت گران بکا، بەدڵنیاییەوە بەرانبەر بەو کەسانەی پێیان دەدا دەبێتە کەسێکی دەستکراوە بەلام بۆ ئەو کەسانەی هیچیان پێنادا دەبێتە کەسێکی ڕەزیل کە ئەو جۆرەکەسانەش ژمارەیان زۆر زۆر کەمن.

ئێمە لەم سەردەمە کاری مەزن و زەبەلاحمان تەنها لە وکەسانە دیوە کە ڕەزیل و دەست گرەوەن ، بەلام ئەوانەی دەستوالاو تەخشان کەری سامانی ولاتن ئەوان وێرانکەرو کاولکاری ولاتیانن ، یولیوسی دووەم بە دەستکراوەیی ناوبانگی دەرکردبوو، بۆ ئەوەی بە پلەی پاپا بگا تا ئەو کاتەی دەبێتە پاپا ئیتر ئەو نازناوەی دەستکراوەیی نامینی و بە کردەوەش دەبێتە کەسێکی تر بۆئەوەی بتوانێ روبەروی پادشای فرەنسا بێتەوە و بتوانێ شەری لەگەڵدا بکا ، دەبینین کە زۆرجار توشی جەنگ هات بێ ئەوەی میللەتەکەی توشی باجی زیادە بکا چونکە سەردەمی ڕەزیلیی پێشتری قەرەبوی ئەو مەسروفانەی کردەوە کە لە جەنگا دەبوایە بیکا ، هەروەها پادشای ئیسپانیا ئەگەر خەسلەتی دەستکراوەی هەبونایە ئەوکات نەیدەتوانی بەسەر ئەو جەنگانەدا سەرکەوێ کە هەلیگیرساندبون ، لەبەر ئەم هۆکارانە نابی میر بایەخ بەو تۆمەتانە بدا کە بە ڕەزیل دەیدەنە پاڵی ئەگەر مەبەست لە ڕەزیلیەکەی دزین نەبوو، ئەو لە کاتەکانی تەنگانەو پێویستدا بە پارە دەتوانێ بەرگری لە خۆی بکا ، ڕەزیل بونی بە سوکایەتیەوە هاوکارە بۆ مانەوەی دەسەلات.

ئەگەر ووتیان :

(یولیوسی قەیسەر بەرێگای دەستکراوەییەوە بە دەسەلات گەیشت، لە کاتێکا هاوەلەکانی لە رێگەی دەست و قامی خۆیانەوە بە دەسەلات گەیشتن یا لە رێگەی خۆدەرخستن و دەستکراوەییان) ،لەم روەوە دەڵێم :

(یا دەبێ میر بیت یا بەرەو میرایەتی برۆیت ، ئەگەر میر بویت ئەوە بزانە کە دەستکراوەیی کارێکی خەراپ و زیانبەخشە ، ئەگەر لە رێگەی بون بە میر بویت ئەوکات دەستکراوەیی بۆگەیشتن بە میرایەتی کارێکی باشە ، قەیسەر چاوی لە میرایەتی بوو ، ئەگەر تا ئەو کاتە لە ژیان بمابایە کە دەبوە میرو لە خەسلەتی دەستکراوەیی وازی نەهێنابایە ، بە دڵنیاییەوە میرایەتیی لەدەست دەدا و وڵاتی کاول دەکردو بەرەو بارێکی قورسی قەرزی دەبرد).

ئەگەر هەندێک کەس لەگەڵ ئەم بۆچونەمدا یەک نەبن و بڵێن زۆر کەس میر بوەو لە خەرجیدا دەستکراوە بوەو کاری مەزنیشی ئەنجام داوە ، من بەو کەسانە دەڵێم: میر یا سامانی خۆی و سامانی گەل دەبەخشێتەوە یا سامانی کەسانی تر دەبەخشێ ، جا لە :

**حاڵەتی یەکەم /** دەبێ ژمێریارێکی هەستیار و بەئاگا بێ .

**لە حاڵەتی دووەمیش/** دەبێ دەستکراوەیەکی بەخشندە بێ ، ئەم جۆرەی دووەم بۆ میرەکان زەرورە ئەوانەی بیانەوێ لەشکرەکانیان بەرەو دزی وتاڵان دەبەن ، چونکە ئەگەر میهرەبان و بەخشندە نەبێ دەبێ سوپاکەی بە رێچکەی خۆیدا ببا ، دواتر بەخشندەیی لەم حاڵەتەدا زیان بەخش نیە ، چونکە تۆ چاکە بە سامانی کەسانی تر دەکەی ئەمە وەکو ئەو حاڵەتە وایە کە قەیسەرو ئەسکەندەرو وقورش کردیان وایە ، دواتر بەخشینی سامانی کەسانی تر لە کەسایەتی و ناوداریت کەم ناکاتەوە ،بەڵکو گەورەت دەکا ، تەنها بە بەخشینی سامانی خۆت ئازارت پێدەگا .
لە کاری دەستکراوەیی خەراپتر هەرگیز نیە چونکە بە ئەنجام دانی ئەم کارە کار لە توانای ئەم کارە دەکەویت ، یا دەبیتە هەژارێکی سوک و چروک یا لە هەژاریا ناچار دەبیت روو لە گەندەڵی و کاری خەراپ بکەیت بەمەش دەبیتە دەستکراوەیەکی بێ ئابروو ، کەواتە هەر دەستکراوەییە مرۆڤ بەم ئەنجامە خەراپانە دەگەیەنێ ، کەوابێ مرۆڤ رەزیل بێ لە حیکمەت و چاکە نزیکترە لەوەی دەستکراوە بێ چونکە رەزیلی تەنها شەرمەزاریە بەڵام دەستکراوەیی و بەخشندەیی لە رادەبەدەر هەم شەرمەزاری هەم رق و کینەی خەڵک بەدوای خۆتدا دێنی .

**یەکەی شانزەهەم**
**لەسەر توندو تیژی و نیانی، جیاوازیش لە نێوان خۆشەویستی و ترسی خەلک بۆ میر**

هەموو میرێک مەبەستیەتی بە کەسێکی بەزەیی ومیهرەبان بناسرێ نەک کەسێکی دلرەق و بێبەزەیی، بەلام نابێ ئەم بەزەییە بە خەراپی بەکار بێنی ، بورجیە ی قەیسەر بە کەسێکی توند ناوی دەرکردبوو بەلام ئەم توندیەی ئەو رۆمای بێدەنگ وکپ و یەکگرتو کرد، ئاشتی و ئارامیی بۆ هێنا بوو، جا ئەگەر ئەمە بەرهەمی ئەو توند و تیژەی میر بێ ، ئێمە دەڵێین ئەوان لە خەلکی فلۆرەنسا میهرەبانتر بوون کە خۆیان لە دلرەقی و بێبەزەیی دەپاراست ، چونکە ئەوان بەم خۆپارێزیە فەرمانی کاولکردنی بیستونەیان دا ، میر لە پێناوی یەکگرتنی ویلایەتەکەیدا لەوە ناترسێ بە دلرەق ناوی ببەن ، چونکە ئەم دلرەقیەی ئەوان لە میهرەبانی و نیانی باشترە کە بەهۆیەوە لە رێگەی نانەوەی شەر وئاژاوە زیان بە ولاتەکەیان دەگەیەنن ، خەلک بە گشتی روبەروی کوشتار و تالان ودزی دەکەنەوە ، بەلام توندو دلرەقی میر تەنها چەند کەسێک دەگرتەوەو ئازاریان پێ دەگەیەنێ ، میری تازە ناتوانێ خۆی لە چەمکی دلرەقی و بێبەزەیی دەربازکا، چونکە میرنشینە نوێکە پرە لە کاری مەترسیدار ، ئەوەتا دەبینین کە (فرجیل لەدیدو) بەهۆی دڵرەقی و بێبەزەییەوە داوای بوردن دەکا چونکە تازە بۆتە پادشاو دەبێ دلرەق و بێ بەزەیی بێ، بەهۆیەوە دەڵێ :

(هەموو میرێک دەبێ روبەروی حالەتی تەنگەتاو بێ ، پێویستیەکانی پادشای تازەش لەو رۆژانە دەبێ بریاری گونجاو بدا بە دابین کردنی پاسەوانی تایبەتی بۆ پاراستنی گیانی پادشا.)

لەگەڵ ئەمەشدا میر دەبێ ووشیار و بەئاگا بێ لە بروابێکردن و هەلوێست وەرگرتن ، ئەگینا خۆی دەبێتە ئامرازی ترس و تۆقاندن ، دەبێ میانرەوو میهرەبان بێ لە کردارەکانیدا ، نابی لە ئەنجامی زۆری بروابون بە کەسێکەوە لە بەئاگابون بێخەبەر بێ ، هەروەها نابی بە بێئەندازە دڵ رەق و بێبەزەیی بێ .

لێرە پرسیارێکی گرنگ سەرهەڵدەدا:

کامیان بۆ میر بەسودترە خۆشیان بوێ، زیاتر لەوەی لێی بترسن، یا لێی بترسن زیاتر لەوەی خۆشیان بوێ ؟

وەلامەکە ئەوەیە کە دەبێ کەسێکی خۆشەویست و ترسناک بێ لە هەمانکاتا، هەرچەندە کارێکی ئاسان نیە ئەم دوو خەسلەتە لە یەککات و رەهەندا کۆ بکرێنەوە ، ئەگەر ئەمە نەکرا باشتروایە مەترسیداربێ لەوەی خۆشەویست بێ ، چونکە ئەوکات دەتوانی بەو خەلکە بڵێی کە بێوەفان و لە گۆڕانی خێرا دانە ، ئەو خەلکە هەریەکەو بە شێوەیەک و روخسارێک خولقاوەو هەلکەوتوە ، حەزیان لە روبەرو بونەوەی کاری مەتسریدار نیەو خۆیان لێی دەپارێزن ، هەوەستیان بە سامان دێ وحەز لە وەدەست هێنانی دەکەن ، چونکە تۆش سودیان پێ دەگەیەنی ئەوا هەردەبێ ئەوان لە خزمەتی تۆدا بن و لە پێناو تۆدا خوێن ببەخشن ، دواتر چونکە مەترسیەکانی سەریان دەماو دەم نین، دورن بۆیە هەردەم ئامادەن لەبەر دەست و لە ژێر فەرمانەکانت دابن .

ئەو میرەی گرەو لەسەر پەیمانەکانی ئەوان بکا هەردەم ماڵی وێرانە .، چونکە ئەو دۆستایەتیەی بە کین وەدەستی دێنی نابێ پشت بە ئەنجامەکانی ببەستی ، بەلکو نەبونی لە بونی باشتریش بێ ، دواتر خەلک بە سروشتی خۆی زیاتر حەز لە خەراپەی ئەو کەسانە دەکەن کە خۆشیان دەوێ نەک ئەوانەی لێی دەترسن ، چونکە خۆشەویستی لەسەر بنەمای سودبەخشین بنیاد نراوە ، هەرکاتەی ئەم سودە کۆتایی هات ئەوا خۆشەویستیش کۆتایی دێ ، بەلام ترس و تۆقاندن لەسەر بنەمای سزادان دروست بوە تۆقاندن و سزاش هەمیشە بەردەوام و کراوەیە .

بۆیە دەبێ میر کارلەسەر ئەم پرسە بکا چونکە دەترسێ لەوەی ئەگەر خۆشەویستی ئەو خەلکەش وەدەست نەهێنێ ئەوا لە رق و کینەی خەلک دوردەکەوێتەوە، چونکە ترس و رق لێنەبون دەکرێ کۆیان کەیتەوە لەو کەسەی ئەگەر دەستکاری سامانەکانی نەکرابێ ، یا دەست لە کاروباری ژنەکان نەدادرابێ. ئەگەر ناچار کرا یەکێکیان لە سێدارە بدا نەک بەو هۆیەوە بەلکو بەهەر هۆکارێکی تر ، بەر لە هەموو شتێک دەبێ دەست لە کاروباری سامانیان وەرنەدا ، چونکە ئەو خەلکە مردن و کوشتنی باوکیان زوتر لە بیر دەکەن لە لەدەستدانی سامانیان ، دواتر هۆکارەکانی لەدەست دان و لێ زەوتکردنی سامان زۆرترن لە هۆکاری کوشتن یا لەسێدارەدان ، ئەمەش کەم روودەدا ، بەلام ئەگەر میر فەرماندایەتی لەشکرێکی بەهێزی کرد ، ئەوا بۆ ئەو زەرورە کەسێکی دڵ رەق و بێ ویژدان وبێبەزەیی بێ چونکە بەبێ ئەم خەسلەتانە ناتوانێ بەهێزی و یەکپارچەیی و گوێرایەلی سوپاکەی بپارێزێ .

یەکێک لە خەسلەتە هەرە دیارەکانی هانیبال فەرماندایەتی سوپایەکی تێکەلاو لە هەموو نەتەوەکان دەکرد ، ئەم سوپایەش لە خاکی بێگانە دەجەنگی ، لەگەڵ

ئەمەشدا هیچ کاتێک ناکۆکی و دوبەرەکی لە کاتی سەرکەوتن یا ژێرکەوتنەکان لە نێو ئەم سوپایە روی نەدا ، هۆکاری ئەمەش تەنها ئەو توندو تیژی و بێبەزەییەی بوو کە لە رادەبەدەر پێیەوە دیار بوو و هەموو سنورەکانی مرۆڤایەتیان بەزاند بوو، سەرباری ئەمەش سوپایەکی بەبەزەیی و چاکە رەفتار بوو، بەردەوام سوپایەکی بەترس و بەرێز بوو لە بەرچاوی سەربازەکانی ، هۆکاری سەرکەوتنی ئەم سوپایە تەنها کارە چاکەکانی نەبوون ، دواتر تەنها بێبەزەییش نەبوو ، سیبیو کەسێکی پر لە چاکە بوو پیاوێکی دلرەق و بێبەزەیی نەبوو، لە ئیسپانیا بەهۆی ئەوەی کەسێکی میهرەبان بووهەندێک سەرباز لێی هەلگەرانەوە ، ئەوپەری ئازادیی بە سەربازەکانی دابوو بە ئەندازەیەک کە هیچ کەسێک ئەو ئازادیەی بە سەربازانی نەدابوو .

بەهۆی ئەم رەفتارەی (فابیوس مکسیموس) لە ئەنجومەنی سەناتۆ گلەیی لێ دەکرد ، بە گەندەلخانەی شەرکەرانی رۆمانیانی ناو دەبرد ، هەر لەو ئەنجومەنە یەکێک لەسەر ئەو کەسە ووتی: لە دونیا زۆر جۆرە کەس هەن ، کە هەندێکیان دەزانن چۆن خۆیان لە هەلە دەپارێزن باشتر لەوەی بزانن چۆن خۆیان لە هەلەی خەلک دەپارێزن ، ئەمەش ئاماژەیەک بوو بۆ سیبیو کە سزادانی ئەو ئەفسەرانەی پشتگوێ خستبوو کە سەربازگەکەیان تێکدا بوو، دیارە سیبیو تۆلەی لێ نەسەندبونەوە و سزای ئەو هەلانەی نەدابون ، ئەگەر ناوبانگی سیبیو بە نیان رۆیشتبێ لە سەردەمی ئیمپراتۆریەت بەهۆی نەرمی دەسەلات و لێبوردەیی بەلام بلاو بونەوەی ئەو دەنگۆیە، بوە مایەی خەلات کردنی لە سەردەمی سەناتۆ ،

لە کۆتاییدا دەڵێم:

ئەو خەلکە بە ئیرادەو هەوەستی خۆیان خۆشیان دەوێ و رقیان لێێ دەبیتەوە ، بەلام بە ئیرادەی خۆیان لە میر دەترسن ، میری زیرەکیش دەبێ پشت بە تواناکانی خۆی ببەستێ و لەسەر هێز و تواناکانی خۆی گرەو بکا ، نەک لەسەر هێز و توانای خەلکانی تر ، لە هەموی گرنگتر کە بیکا ئەوەیە خۆی لە رق و کینەی خەلک بپارێزێ .

**یەکەی حەڤدەم**
## وەفاداری میرەکان چۆن دەبێ ؟

لەکەس شاراوە نیە کاتێک سەرکردەیەک دەبێتە خاوەن پەیمانی خۆی ، چ ناوبانگ و چاکەیەکی بۆ دەگەڕێتەوە بەوەی پەیمان پارێزە و ریز لە وتەکانی خۆی دەگریٚ، بەلام ئەم سەردەمە ئەوەی فێرکردین و نیشانی داین کە ئەو میر وسەرکردانەی نەبونە خاوەن پەیمانەکانیان ، کاری مەزن و زەبەلاحیان ئەنجام دوە ، توانیویانە ئەو خەلکە بە مەکر و حیلەکانیان سەرسام کەن ، لە دواییشدا بەسەر ئەو سەرکردەو میرانەدا زاڵ بون کە خاوەنی گفت و پەیمانەکانیان بون ، ئەوانەی وەفاداری سومبول و هێمای ژیانیان بوو .
من دەزانم کە دوو رێگا بۆ شەڕکردن هەن:
**یەکەمیان /** بە یاسا .
**دوەمیان /** بە هێز .
یەکەمیان رێگای ئادەمیزادانەو دوەمیشیان رێگای ئاژەڵ و کێویانە، دیارە رێگای یەکەم هەمیشە بەردەوامبون بەس نیە یا چارەسەر نیە، بۆیە مرۆڤ ناچار دەبیٚ هەندێکجارپەنا بۆ رێگای دووەم بەریٚ ، کەوایە زەرورە شێوازی شەری ئادەمیزاد وئاژەلەکان بزانین ، ئەمەش پێشتر نوسەرو مێژوو نوسەکان بۆ میرەکانیان باس کردوەو شی کردۆتەوە، بینیان کە فەرمانی مەشق پێکردنی هەریەک لە ئەخیل و هەندێکی تریش شیرۆن گرتبویە ئەستۆ ، ئەو کەسە نیوەی ئادەمیزاد و نیوەکەی تری ئاژەڵ بوو ، ئەو مەشقی پێیان کرد و پەروەردەی کردن ، بۆ ئەم کارە نوسەرو ومێژوو نوسەکان ویستیان وەکو هێمایەک بەکاری بێنن کە گوایە میر پێویستیی بە بەکار هێنانی هەردوو مۆرال هەیە ، مۆرالێک بەبیٚ ئەویتر سودی نیە و ناتوانیٚ بەردەوامیش بیٚ ، بۆیە میر دەبیٚ هەردوو سروشت و مۆراڵی ئادەمیزاد و ئاژەڵی هەبی ،لە سروشت و مۆراڵی ئاژەلا لاسایی شێر و رێوی بکاتەوە ، بۆیە دەبیٚ میر رێوی بیٚ تا خۆی لە چاڵ و تەلەکان بپارێزی و نەکەوێتە داویانەوە ، شێریش بیٚ تا ترس بخاتە دڵی خەلک و بیان تۆقێنی ، ئەوەی بیەویٚ تەنها شێر بیٚ ئەوا ئەوکەس ئومیدی ژیانی کەمە ، لەم روانگەیەوە میر نابیٚ بۆئەوەی هەمیشە وەکو شێر بیٚ باک و خاوەنی گفتەکانی بیٚ ئەگەر جاروبار دژی بەرژەوەندیەکانی تایبەتیی خۆیشی بیٚ ، چونکە ئەو هۆکارانەی بەهۆیەوە پەیمان بەسترا بەسەر چون کەواتە هیچ پاساوێک بۆ بەجیٚ گەیاندنی پەیمان نیە ، ئەو

بنەمایانەی بۆتانم باس کردن بنەمای ناخۆش و نەخوازیارن بەلام هۆکارو گەرەنتیی مانەوەن ، دواتر میر ئەگەر پابەندی پەیمانەکانی بێ هیچ حیلە شەرعێک بۆ خۆ دزینەوە لە بریار و پەیمانەکانی نامینیتەوە ، لەم روەوە نمونە زۆرن کە هەمویان ئەوە دەسەلمێنن ئاشتی هەندێک جار دێتە لەرزین کە ئەمەش تاڵە ، زۆرجاریش پەیمانەکان بە میرەکانەوە بەستراونە تەوە نەک بە بریاری جێبەجێکردن ووەفاداریان ، ئەوانەی لە میرەکان توانیان لاسایی رێوی بکەنەوە بە دڵنیاییەوە سەرکەوتن ، بەلام زەروورە مرۆڤ ئەم خەسلەتە بشارێتەوە نەک بە ئاشکەرا بە روخساریەوە دیاربێ و بە ئاشکەرا جێبەجێیان بکا ، دەبێ لە هونەری خۆ گۆرین و خۆدەرخستن بە کەسێکی پاک و بێگەرد، شارەزا بێ دیارە ئەو خەلکە کەسانی ساویلکەن بۆ کەسی حیلەباز ئاسانە چەواشەیان کا .

من تەنها بە هێنانەوەی یەک نمونە لە مێژوی نوێ کۆتایی بە م بابەتە دێنم :

ئەسکەندەری شەشەم لە ژیانیا هیچ کارێکی نەکردوە جگە لە حیلەبازی نەبی ، جگە لەم شێوازەش هیچ کاتێک بیری لە هیچ نەکردۆتەوە ، لەم کارەیدا بە ئەنجامی پارچە بون گەیشت. هیچ کەسێک وەکو ئەو لە جێگیرکردن و هەلسانەوەدا بەتوانا نەبوو کەس وەکو ئەو گفت و پەیمانی بەو خەلکە نەدەداو هیچیشی جێبەجێ نەدەکردن ، کەس وەک ئەو بێ وەفاو بێ پەیمان نەبوو ، کەچی کەس وەکو ئەو لە حیلەکانیدا سەرەکەوتو نەبوەو بەردەوام لە حیلەکانیدا سەردەکەوت ، چونکە شارەزای سروشتی ئادەمیزاد بوو ، مەرج نیە میر هەموو ئەو خەسلەتانەی لە سەرەوە باسمان کردن تێیدابێ ، بەلام گرنگ ئەوەیە ئەو خەسلەتە باشانەی بخرێتە پاڵ و خەلکانیک بەم شێوە باسی بکەن ، من لێرە زاتی ئەوە دەکەم بڵێم: ( کەسێک ئەو هەمو خەسلەتە باشانەی هەبێ مایەی مەترسیە بۆی ، بەلام خۆدەرخستن و خەلک گەیاندنە بروا بە بونی ئەو خەسلەتانە کارێکی پر سودە ، کارێکی باش و پر بە سودە بە کەسێکی وەفادار و دلسۆز وئایندار و دەستپاک و مرۆڤ دۆست بێیە ناسین ، لە واقعیشدا ئەگەر واش بیت هەر باشە ، بەلام دەبێ لەوە بە ئاگا بیت ئەگەر ناچار بویت خەسلەتی تر بگریتە خۆ کارێکی ئاسان دەبێ .

دەبێ ئەوە بزانین کە میر ( بەتایبەتی میرە تازەکان) ناتوانێ ئەو هەموو خەسلەتە باشانەی لە یەککاتدا هەبێ چونکە بە هەموو حالەتێک ناچارە دەست بە پادشاوە بگرێ ، کەوابێ دەبێ دژی بروا بون و چاکەو مرۆڤایەتی و ئاین کار بکا، بۆیە دەبێ خاوەنی ئەقلێکی ئاسان بێ بۆ گۆڕان لە حالەتێک وئەقلیەتێکەوە بۆ حالەتێک و ئەقلیەتێکی تر بێ کێشە و بەپێی پێویستیەکانی ئەو قۆناغەو لەگەڵ هاتنەوەیاندا.

نابێ مەودا بۆ چاکەکان جێبیلی چیان کرد و چیان نەکرد بەهەر ئەنجامێک گەیشت لای تۆ گرنگ نەبێ، هەروەها دەبێ لە توانایدا بێ هەرکاتەی بیەوێ خەراپە بکا ، بیکا ئەگەر پێویستی پێی بوو.
دواتر نابێ میر هیچ ووشەیەکی لە دەم بێتەدەر کە دژی ئەو پێنج بنەمایانە بن کە لە سەرەوە ئاماژەم پێیان دا . نابێ هیچ بینەر وهیچ گوێگرێک لە چوار چیوەی ئەو ووتانەی سەرەوە لە میر ببینن و ببیستن کە دژی خواستەکانی مرۆڤ بن ، گرنگترین ئەو خەسلەتانەی لە میر چاوەروان دەکرێن خەسلەتی بروابونە بە رێبازەکەی و ورەی بەرزی، چونکە مرۆڤ بە دید و بۆچون حوکمدەدا نەک بە بسپۆری و شارەزایی ( رونتر واتە ئەقلیقن لە چاوانە نەک لە مێشک ،و) خەلک حوکم لەسەر روکەش ودیمەن دەدا دیکۆرو دیزاین رۆلی تایبەتی دەگێرن لە راو بۆچونی خەلک ، ئەوانەی راستیی تۆ بەدەست دەگرن کەمن ، ئەم ژمارە کەمیەش بەرگەی ژمارە زۆرەکە ناگرن کە لە ژێر دەسەلاتی میردان ، کەوایە گرنگ ئەوەی میر بژیێ گرنگ ئەوە نیە چۆن دەتوانێ بژی بە چ شێواز وبە چ رێگایەک ، مانەوەی میر بە ئابروو ستایشی ئەو خەلکە دەمێنیتەوە هەموو ئەو خەلکە مانەوەو ئەنجامەکانیان پێ لە هەموو شتێک گرنگ ترە کاتێکیش ئەنجامەکان و مانەوەی میر بەردەوام دەبێ ، میر هەمیشە بە ریز و بە ئابروو لەلایان دەمێنیتەوە ، ئەو کەمینەش هیچ کاتێک دەنگیان دیار نابێ تا ئەو کاتەی زۆرینە ون دەبن ئەوسا ئەوان بەدیار دەکەون ، یەکێک لە میرە بەناوبانگەکان کە پێمان باشە ناوی نەهێنین، لای ئەو هیچ شتێک بەقەدەر ئاشتی و ئارامی گرنگ نیە بۆیە جگە لەو دوو شتە هیچیتر بایەخی نیە ، لەراستیشدا ئەو دوژمنی ئەو دوو شتەیە ،چونکە ئەگەر یەکێکیانی پاراست ئەوا دەسەلات و ژیانی خۆی لەدەستدا.

## یەکەی هەژدەهەم
## خۆپاراستن لە رق و کینە

هاولاتی بەهۆی دەستگرتنی میر بەسەر ماڵ و مولک و سامان وژنەکانیانەوە رقیا لێیەتی ، ئەگەر میر سامان و مولک و کەسایەتیی هاولاتیانی پاراست ژیانیان لە ئارامی دابوو ئەوکات هەموو لایەک بە خۆشی و ئارامیەوە دەژین ، خۆ ئەگەر کەمینەیەکیش دژی وەساتنەوە ئەوا بە چەندین رێگا دەتوانێ رێگریان لێ بکا وبیان وەستێنێ، ئەگەر میر بە خەسلەتی ترسنۆکی ورارایی و بێوەرەیی ناوی دەرکرد ئەوکات میر دەبێتە کەسێکی بێ ئابروو لاواز و بێ کەسایەتی، بۆیە دەبێ خۆی لەو خەسلەتانە بپارێزێ ، سەبارەت بە حوکمرانی هاولاتیان و بریارەکانی ، دەبێ میر خاوەنی یەک هەلوێست و یەک بریاری خۆی بێ بۆ ئەوەی بتوانێ کاتێک بریارێکی دەرکرد بەرگریی لێ بکاو بریارەکەی خۆی جێبەجی بکا تا کەس لەم روەوە نەتوانێ حیلەی لێ بکا وکلاو بنێتە سەری و بریارەکانی جێبەجێ نەکا، ئەگەر ئەم خەسلەتە باش و جوامێریانە لەسەر میر بلاو بونەوە ئەوکات کەس زاتی ئەوە ناکا پیلانی لەسەر دابنێ و هەوڵی کلاو لەسەر نانی بدا، دیسان دوژمن ناتوانێ لە دەرەوە هێرشی بکاتە سەری ، چونکە زانیاری ئەوەیان لەسەری هەیە کە میر لە دڵی هاولاتیانیدا دەژی ، میر دوو جۆرە ترسی دەبێ :

**یەکەم /** ناوەخۆییە ، ئەویش لە هاولاتیانییەوە دەبێ.

**دووەم/** دەرەکی ، ئەم ترسەی لە هێزی بێگانەیە ، لەو حالەتدا دەتوانێ بەهۆی سوپای رێکخراوو مەشقپێکراوەکەی و چەکەکانیانەوە بەرگری لە خۆی بکا ، بەم شێوەیە بارو دۆخی ناوەخۆ ئارام دەبێ ئەگەر هیچ پیلانێکی لە دژ نە هوندرێتەوە ، ئەگەر دوژمنیش ئاژاوەیەکی بۆ خولقاند ئەوکات دەتوانێ بەرگەی هەموو کۆسپ و تەگەرەکان بکا ئەگەر حەکیمانە بەرنامەو رێنماکانی پیادە کردن کە لە پێشدا باسمان لێیانەوە کرد ، نمونەی ئەم حالەتەش( نەبیسی) میری ئەسپارتەیە وەکو نمونە .

بەلام هاولاتیش ترسی لەوە هەیە ئەگەر پیلانێکیان لە دژ ئەنجام بدرێ ، لە حالەتێکدا هێزەکانی بێگانە نەیانتوانی بەم رۆلە هەڵسن ، لە پێناو دورکەوتنەوە لەم مەترسیە دەبێ میر خۆی لە رق و کینەی هاولاتیان دورخاتەوە کار بۆ وەدەستهێنانی رەزامەندی ئەوان بکا ، باشترین دەرمانی لە ناوبردنی ئەم مەترسیەو

تریاکی لەناو بردنی پیلانەکان، وەدەست هێنانی خۆشەویستی زۆرینەی رەهای گەلە ، چونکە پیلانگێران وا مەزندەدەکەن کاتێک میر دەکوژن گەل خۆشحال دەبێ ، بەلام ئەگەر ئەم زانیاریانەیان هەبوو کە گەل میرەکەی خۆی خۆشدەوێ ئەوکات لەم بیرۆکانە دور دەکەونەوە ، چونکە کوشتنی میر گەل دلخۆش ناکا ئیتر بۆ بەم کارە هەڵسن کە سەرکەوتنی تیا نابینن ؟ ئەزمونەکان ئەوەیان سەلماندوە کە پیلانەکان زۆر بون بەلام سەرکەوتوەکان کەم بون ، چونکە پیلانگێر ناتوانێ بە تەنیایی بەم کارە هەڵسێ ، هەروەها ناتوانێ هەڤال و دۆست بۆخۆی پەیدا بکا ئەگەر لە نێو ریزی نارازیەکاندا نەبێ ، ئەگەر مەبەستەکانی خۆت بۆ کەسێکی نارازی باس کرد ئەوکات ئەویش گەیشتن بە مەبەستەکانی خۆی لە ناو ئەنجامەکاندا دەبینێتەوە ، بەو مەزندەی کە رێنیشاندەر دەیگەیەنێتە ئامانج و مەبەستەکانی ، ئیتر قازانجەکانی خۆی هەلدەسنگێنێ وبریاری خۆی لەم بارەیەوە دەدا ، کەسی پیلانگێر ئەنجامەکانی پیلانەکەی بەوە هەلدەسەنگێنێ کە بەشداری و قازانجەکانی دەخاتە ناو لەپی دەستێک ، گوێرایەلیشی بۆ داخوازیەکانی تۆ دەخاتە لەپی دەستەکەی تر ئەوکات هەڵیان دەسەنگێنێ لە کاتێکا ئەو دەزانێ ئەم رێگایەی پیلانگێران پرە لە ئاستەنگ بۆیە کامیان بە قازانجی خۆی ببینێ ئەویان دەکا.

هیچت پێ بروانەکەن ئەگەر دوژمنێکی سەرسەختی میر نەبی یا دۆستێکی گیانی بە گیانیی نەبی ، ئەو تەنها ترس وتۆقاندن و دلە رواکێ و دڵپیسی و سزای تۆلە سەندنەوە لەتۆ بەدی دەکا ، لە لایەنی میریشەوە دەسەلات و یاساو پارێزبەندی دۆستانی و دەولەت بەدی دەکا، ئەگەر خۆشەویستی ودلسۆزی گەلیش بخاتەسەری ئەوکات ئەی هاوار بۆ ئەو کەسەی زاتی ئەوە بکا دەستدرێژی بکاتە سەر میر .
چوونکە ترسی دەستدرێژکارو پیلانگێرانی سەر پادشای زالم و ستەمکار بەر لە ئەنجام دانی پیلانەکە دەبێ ، چونکە لەم کارەیدا ئەو رق و کینەی گەل وەدەست دێنی نەک پشتیوانی گەل ، ئیتر دوای ئەو کارەی هیچ پەنایەک بۆخۆی ناهیلێتەوە بۆیە لە سەرنەکوتنی ئەم کارەی دەترسێ ، نمونەی ئەم بابەتەمان زۆرن بەلام من لێرە تەنها یەک نمونە دەهێنمەوە کە باپیرانمان دەیگێرنەوە: سەنیور ئەنیپال بنتیفوجیی میری پولونیایان بە پیلانێک لەسەر دەستی (کانیش) دەکوژرێ ، لەدوای خۆی هیچ خزمێکیان جێ نەهێشتبۆوە تەنها سنیور جیوفانی نەبێ کە ئەوکات منداڵ دەبێ ، ئەنیپال لای خەلکەکەی خۆشەویست بوو ، بۆیە گەل هەلدەستێ بە کوشتنی کانیش ، گەل ئەوەندە خانەوادەی بنتیفوجی یان خۆش دەویست بەدوای یەکێک لە نەوەکانی ئەو خانەوادەیەدا گەران کە بیستبویان یەکێکیان ماوە لە فلۆرەنسا بەوە ناسراوە کە کوری پیاوێکی ئاسنگەرە ، بۆیە چون

بەدوایداو هێنایان کردیان بە سەرۆکی حکومەت تا ئەوکاتەی ئەو گەنجە مەزن دەبێ ئەوکات دەیکەن بە پادشای خۆیان ، ئەمە ئەوە دەگەیەنێ کە ئەگەر میرێک لای گەلەکەی خۆشەویست بوو پێویست ناکا لە حوکمەکەی بترسێ و خۆی توشی دلە راوکێ بکا چونکە ئەو لەلایەن گەلەکەیەوە پارێزراوە هیچ پیلانێک بۆ لەناوبردنی سەرناگرێ ، بە پێچەوانەوە ئەگەر لای گەلەکەی خۆشەویست نەبوو دەبێ لە هەموو کەس بترسێ.

لەم سەرهاتانە حکومەتە رێکخستوەکان و میرە ئاقلەکان پەندیان لەوە وەرگرتوە کە هەرگیز نابێ میللەت ئازار بدرێ ، دەبێ دڵیان رابگیرێ و داخوازیەکانیان بۆ چارەسەر بکرێ چونکە ئەمە ئەو پرسانەن کە میر دەبێ بایەخیان پێ بدا ، لە نێو حکومەتە رێکخستوەکان و میرە ئاقلەکان پادشانشینی فرەنسا بە نمونە دێت ، لە نێو ئەو پادشانشینە دەزگای حکومی و رێکخراوی رێک وپێک هەن کە هەمویان لەسەر بنەمای ئازادی پادشا رێکخراون ، لەو رێکخراوانەی لەسەر سیستەمی ئەنجومەنی پەرلەمان و دەسەلاتەکانیانن ، چونکە لە خەسلەتەکانی ئەو حکومەتە کە پێی ناسرابوو چاوچنۆکی پیاوە مەزنەکان بوو لە ئەشرافەکان ، ئەم رێکخراوانە دەمی ئەم جۆرە کەسانەیان بە یاسای مکوم گرتبوو و رێگەیان لێگیرابوو بۆ گەندەلی ، یەکێکی تر لە خەسلەتەکانی ئەم حکومەتە ئەوەبوو هەستی دەکرد کە زۆرینە رقیان لە کەمینە هەیە بەلام لە پێناو رازی کردنی زۆرینە رێگەیان نەدا کارێکی ئەوتۆ بکەن، پادشا چاودێریەکی تایبەتیی بۆ چینە زۆرینەکە هەبێ، لە ئەنجام رقی ئەشرافەکان لەم هەلوێستەی پادشا هەڵسێ ، بۆ ئەم چارەسەریە دادوەرێکی سێیەمیان دانا ،ئەرکیان راگرتنی مەرامەکانی ئەشرافەکان بێ لەم بوارە و سنورێک بۆ داخوەازیەکانیان دابنێ و لە هەمان کاتیشدا چینە زۆرینەکە رازی بکا ، بۆ چارەسەری ئەم کێشەیە لەم سیاسەتە باشترو لەم حوکمەش باشتر نەبوو بۆ پاراستنی سەلامەتی پادشاو پەرلەمان، لەم کارەشدا شتی تر بۆ میرەکان دەردەکەوێ ئەویش ئەوەیە کە میر و پادشا بۆ ئەوکارانەی کە گەل پێی خۆش نیە دەبێ ئەرکەکە بە کەسانی تر بسپێرێ تا گلەیی وگازاندەکان روبەروی ئەو نەبنەوە ، ئەوکارانەی تایبەتن بەو دەبێ ئەوانە بن کە گەل پێی خۆشە ، ئەگەر مێژوی ئیمپراتۆرەکانی رۆمانی بخوێنینەوە هەندێکیان کاری پێچەوانەی ئەم کارەیان ئەنجام داوەو ئەنجامە ناخۆشەکەیان چێشتوە ، چونکە هەندێکیان بە ئابروو ژیان بۆیە بە رەوشتێکی بەهێزەوە دیاربون بەلام لە پادشایەتی کەوتن یا کوژران یا وەلانران ، بۆئەوەی من رای خۆمتان بۆ ئەم حالەت و بابەتە پێبلێم من باس لە خەسلەتی هەندێک لە وئیمپراتۆرانە دەکەم تا بۆتان بسەلمێنم کە تێکچون و

روخانیان دژی ئەو بۆچونانەی من نەبون ، تا هەندێک وردەکاریش رونکەمەوە بۆ ئەوانەی بەدواداچون لەم بابەتە دەکەن ، ئێستا باس لەو ئیمپراتۆرانە دەکەم کە لە سەردەمی حوکمرانی مارکوس تا ماکسیمنوس و کومودوس و برتنکس و جولیانوس و ئەسکەندەر و ماکسیمنوسی و کورەکانیان حوکمیان کردوە ، ئەوەی من لەو هەموو ئیمپراتۆرانە دەبینم ئەوەیە کە هەموویان تەنها بەرژەوەندیەکانی ئەشرافەکان و گەمژەیی چینی گشتیان لا گرنگ بوە ، بەلام ئیمپراتۆرە رۆمانیەکان خەمێکی تریان لا گرنگ بوو ، ئەویش قبول کردنی توندی و دلرەقی و رەزیلی سەربازەکان بوو ، ئەمەش کۆسپێکە ناتوانرێ چاوپۆشی لێ بکرێ چونکە ئەو دلرەقی و چەوساندنەوەی گەل بوە کە تەختی چەندین پادشای هێناوەتە هەژان لەوکاتانەی نەکراوە چینی گەل و سەربازەکان لە یەک کاتا رازی بکرێ ، دیارە گەل پێویستی بە پادشایەکی ئاشتی خوازە ، بەلام سەربازو فەرماندەکان حەزیان لە پادشایەکی شەرکەرە بۆئەوەی لوت بەرزی میلەت بشکێنێ و دەست بگرێ بەسەر سامانەکانیانەوە ، وا رویداوە کە ئەو ئیمپراتۆرانەی نەیان توانیوە هەردوولا رازی بکەن ، روخاون ، لەنا وچون ، ئەوانەی بە هەر هۆیەکیشەوە گەیشتبێتنە دەسەلات وتەختی پادشایەتی ئەوا پشتیان بە سەربازەکان بەستوە ، بەهۆی ئەوانەوە توانیویانە لەسەر حوکم بمێننەوە دیارە لەم حالەتە دەبێ لایەنێک لەسەر لایەنێکی تر زال بکەیت ، بە پێچەوانەش لە لایەن هەردووکیانەوە روبەروی رق و کینە دەبیتەوە بۆیە هەردەم رق و کینەی گەل روبەروی پادشا دەبێتەوە ، ئەگەر لەمەیان سەرەکوتو نەبون دەبێ خۆیان لە شەری حزبە مەزنەکان دور کەنەوە ، هەر بۆیە ئیمپراتۆرە نوێکان پێویستیان بە چاکەی لە رادە بەدەر بوە و وەدەستهێنانی خۆشەویستی سوپایان پێ لە وەدەستهێنانی خۆشەویستی گەل باشتر بوە ، ئەنجامی ئەم کارانە ئەوە بوە کە پادشا توانیویەتی ئابروو کەرامەتی خۆی بپارێزێ .

ئەنجامی ئەمەش ئەوەی لێکەوتەوە کە هەریەک لە مارکوس وبرتنکس و ئەسکەندەر کە کەسانی خاکی وخۆشەویست ودادپەروەرو دوژمنی توندو تیژی بوون لای خەلک خۆشەویست بون کۆتاییەکەیان بە ناخۆشی وکارەسات هات، جگە لە مارکوس کە بە ریز و خۆشەویتی ژیاو مرد. چونکە بە جێماوی(ویراسی) لەسەر تەختی پادشایەتی دانیشت و حوکمی کرد خۆی بە قەرزاری سوپاو گەل نەدەزانی هیچکامیان ئەویان نەهێنابوە سەر حوکم ،جگە لەمە ئەو کەسێکی بەچاکەو ولاتپارێز بوو سنوری بۆ حزبەکان دیاری کردبوو بۆیە هەمولایەک خۆشیان دەویست کەسێک نەبوو رقی لێی بوبی .

بەلام برتکس بەهۆی سوپاو سەربازەکانی نەهاتبوە سەر حوکم کە پێشتر لە سەردەمی کومودس بە گەندەلیەوە خەریک بون ، ئەوان ئەو ژیانەیان پێ خۆش نەبوو کە برتکس بۆی دیاری کردبون ئەویش بریتی بوو لە لانەدان لە یاساکان بۆیە سەربازەکان رقیان لێی بوو دواتر بەهۆی مەزنی تەمەنیەوە خەلکیش رقیان لێی بوو ، بۆیە هێشتا حوکمرانیەکەی دەستی پێنەکردبوو کە کۆتایی پێهات ، لێرە دەبینین کە دوژمن لە کرداری چاکە دروست دەبێ ،هەروەک لە کرداری خەراپە دروست دەبێ ، ئەو میرەی مەبەستیەتی لە دەسەلات بمێنێتەوە گەلێک جار ناچار دەبێ کاری خەراپ یا دژ بە بەرژەوەندی هەندێک کەس بکا ، چونکە کاتێک ئەو حزبەی میر پشتی پێ دەبەستێ توشی گەندەلی دەبێ ئەوکات میر ناچار دەبێ هەندێک کاری وا ئەنجامبدا تا رازیی بکا ، لەم حالەتانە کاری باش بۆ لایەنێک، دەبێتە خەراپە بۆ گشت ، دەبا ئێستاش باسی ئەسکەندەر بکەین کە چاکەی گەیشتبوە ئەو ئاستەی لە میانەی چوارده سالی حوکمرانییدا تاقە کەسێکی بێ دادگایی کردن لەسێدارە نەدا ، ئەم ئیمپراتورە بە لاواز و پیسکە هاتە ناسین، بەهۆی ئەوەی دایکی دەستەرۆ کرد تا ئەو حوکمی ولات بکاو بەهۆیەوە ولاتی بەرەو هەلدێر برد ، بۆیە بە پیلانێک سوپا لەناویدەبا .
ئەگەر ئێستاش سەیری خەسلەتەکانی کومودوس و سیفیروس و ئەنتونیوس و قراقلا وماکسیمنوس بکەین دەبینین کە :
هەمویان لەو پەری توندو تیژی وستەمکاریدابون ، لە پێناو تێرکردنی حەز و ئارەزوەکانیان هیچ لاریەکیان نەبوو گەل ئازار بدەن و مافەکانیان بخۆن بۆیە جگە لە **سیفیرۆس** کەس دۆستایەتی سەربازەکانی نەدەکرد، ئەم بەهۆیەوە توانیی ئەو پەری ستەم و زۆرداری لەگەل میللەتەکەی بەکار بێنێ و لە حوکمرانیدا تاکرەوانە رەفتار بکا ، ئەوانیتر هەمویان ژیانیان بە کارەسات ونەهامتی کۆتایی هات ، سیفیروس کە بەو شێوەی سەرەوە حوکمرانیی دەکرد وێرای ستەمکاریەکانی ، بە چاکەو بەرهەمەکانی هەردوو لایەنی سوپاو گەلی دلخۆش و چاونوسای کرد بۆیە سەربازەکان بە برواوە ریزیان دەگرت وخۆشیان دەویست هەروەها گەلیش بە خەسلەتە چاکەکانی سەرسام بون ، لەوکاتەی کارەکانی ئەو پادشا نوێیە لە سەرەتایەوە کاری شیاوو باش بون دەمەوێ بزانم ئەم پیاوە چۆن توانیی هەردوو خەسلەتی رێوی وشێری هەبێ؟ ئەو پیاوە ئیمپراتۆر جولیانوسی ناسی کە فەرماندەی سوپای سلۆڤینیا بوو بروای پێهێنا کە هێرش بردن بۆ سەر رۆما بۆ تۆلە سەندنەوە سودی هەیە بۆ ئەوەی تۆلە لە برتکس بسێنێتەوە کە پاسەوانەکانی ئیمپراتۆر کوشتیان و بەهۆیەوە چوە ناو ئیتالیاو داگیری کرد، بێ ئەوەی مەبەستە

راسته قینەکەی لە دڵی دەرخا ، ئەمەیە خەسڵەتی ڕێویەتی و شێرایەتی ، کاتێکیش دەگاتە ڕۆما ترس و تۆقاندن دەخاتە دڵی ئەنجومەنی سەناتۆر بۆیە هەر بە سوک و ئاسانی بە ئیمپراتۆر هەڵی دەبژێرن ، کاتێکیش (جولیانوس) دەمرێ وبەر لەوەی (سیفیروس) دەست بەسەر ئیمپراتۆریەتی یەکەمی ئاسیادا بگرێ دوو تەگەرەی مەزنی دینە پێش ، ئەویش :

یەکەم/ فەرماندەی سوپای ئاسیا (نیفرنیوس) دەسەلاتەکانی خۆی لەسەر ئەم سوپایە ڕاگەیاند، خۆی کرد بە ئیمپراتۆر .

تەگەرەی دووەم/ لە ڕۆژئاوا بوو ، بەتەواوەتیش لە (ئەلبینوس) بوو ، کە چاوی لە ئیمپراتۆر دەبێ ، کاتێکیش (سیفیروس) هەست بە مەترسیەکان دەکا دوژمنداریێتی خۆی بۆ ئەو دوو کەسە ڕادەگەیەنێ ، بریاریدا هێرش بکاتە سەر (نیفرنیوس) و لەگەڵ (ئەلبینوس) یش تێکبدا ، بۆی نوسی (بۆ نیفرنیوس):

کە سەناتۆ بە ئیمپراتۆری هەڵبژاردوە ، بەلام دەیەوێ ئەم شەرەفەی لەگەڵدا بەش بکا ، دواتر نازناوی قەیسەری بۆ نارد و داواشی لە سەناتۆ کرد هەردوکیان بە ئیمپراتۆری ڕۆما هەلبژێری ، (ئەلبینوس) بەم فێلەی بروا کرد ، دواتر (سیفیروس) ڕاوی (نیفرنیوس) دەنێ و دەیکوژێ ، ئیتر دەسەلاتەکان لە ڕۆژهەلات بە ئارامی دەکەونە دەستی و پاشان دەگەرێتەوە ڕۆما، لە ئەنجومەنی سەناتو ڕادەگەیەنی کە (ئەلبینوس) چاکەو پیاوەتیەکانیی لەبیر نەماوە و ئەو چاکەی لەگەڵی کردوە بە پێدانی تاجی ئیمپراتۆری، وێرای ئەمە پیلانی کوشتنی بۆ دارشتوە بۆیە ناچار دەبم سزای بدەم لەسەر ئەو کارە نابەجێیانەی لە پیلانگێران وبێ وەفایی ، پاش ئەمە دەچێتە فرەنسا بۆ چاوپێکەوتن لەگەڵیدا لەوێ دەسەلاتەکانی لێ سەندەوەو ژیانی بە کۆتایی هێنا ، ئەوەی دەیەوێ پەند لەم ڕوداوە وەرگرێ بۆی دەردەکەوێ کە سیفیروس شێر بوە ڕێوییێکی حیلە بازیش بوە بۆیە لای میللەتەکەی بە هەیبەت و سام بوو ، لای سەربازەکانی ناشیرن نەبوو بۆیە ماوەی حوکمرانیی پادشایەتیی درێژە دەکێشێ و باری قورسی حوکمرانیشی سوک دەبێ ،

(**ئەنتونیوس**)ی کوری هەمان خەسڵەتی هەبون ، بەهۆی خەسڵەتە دیارەکانی ببوە مایەی سەرسامی گەلەکەی ، لەلای سوپاکەشیەوە بەهۆی ئەوەی کەسێکی شەرکەرو بەتوانا بوو لە مەیدانەکانی شەرا توند بوو بۆیە لای ئەوانیش کەسێکی خۆشەویست بوو ، کەسێک بوو لەروی دابین کردنی کامەرانی و سەرکەوتن و تفاق و خۆراک بۆ سوپاکەی بە توانابوو بۆیە خۆشیان دەویست چونکە متمانەیان پێی بوو .

له هەمان کاتا توند وتوشی و بێبەزەیی نمونەی نەبوو ، بەهۆی دەرکردنی فەرمانی کوشتنی گەلێک کەس له هەمان کاتا دەرکردنی فەرمانی له سێدارەدانی ژمارەیەکی زۆری خەلکی رۆما و ئەسکەندەریە ، بۆیە هەموو ئەوانەی له دەوری بون رقیان لیی بوو ، له نزیکترین کەسی خۆی دەترسا تا له ئەنجام له ناو سوپاکەیدا سەربازێک دەیکوژێ ، ئەم جۆرە کوشتنە هەلقولاوی ناخی تاکە کەسێکە هیچ کاتێک فەرماندەکان ناتوانن خۆیان لەم جۆرە کوشتنە دورخەنەوە ، چونکە هەرکەسێ له وەلامدانەوەو لێپرسینەوە نەترسێ هەموو کارێک دەتوانێ بیکا بە کوشتنیشەوە ،بەلام مەترسیی گەورە لەسەر میرەکان ، لەم کەسانە نیە چونکە ئەم حالەتانە کەم روودەدەن ، بەلام میر نابێ ئەو کەسە ئازار بدا کە لە خزمەت ئەودا دەبێ ، هەروەک (ئەنتونیوس) کارێکی لەم جۆرە دەکا کاتێک سەربازێکی خۆی دەکوژێ و براکەی دەهێلێتەوە ، کە هەموو رۆژ هەرەشەی کوشتنی لێ دەکرد ، لەگەڵ ئەوەشدا له ناو ریزەکانی دەستەی پاسەوانییدا هێشتەوە تا له ئەنجامی کوێر بونیدا تۆلەی براکەی لێ دەکرێتەوە .

دەبا ئێستاش باسی (**کومودوس**) بکەین که بەهۆی گەیشتنی بە تەمەنی بالق بون دەیتوانی ببێتە ئیمپراتور کە لە (ماکوس)ی باوکیەوە بۆی مابۆوە، ئەگەر تۆلەی باوکی بکرد بایەوە ئەوکات گەل و سوپا لێی رازی دەبوو بۆیە من دەڵێم :

میزاجێکی توندی ئاژەلیی هەبوو ، دەیویست سەربازەکانی بە کوشتنی گەل رابوێرن ، دواتر شکۆمەندی خۆی نەپاراست ، لەگەل سەربازە دیلەکان زۆرانبازێی دەکرد بۆیە له بەرچاوی خەلک بوبە کەسێکی سوک و چروک وگەلیش رقی لێی بوو ، تا بە پیلانێک بۆی دەرچون و کوشتیان .

ماوە قسە لەسەر (**ماکسیمنیوس**) بکەین ، ئەم پیاوە کەسێکی شەرکەری بەجەرگ بوو ، کاتێک سەربازەکان لە بێتوانایی ئەسکەندەر بێتاقەت و بێزار دەبن لە دوای ئەو ماکسیمنیوس بە ئیمپراتۆر هەلدەبژێرن بەلام بەهۆی ئەوەی لە دوو خالا خەلک رقیان لێی بوو ماوەی حوکمەکەی درێژە ناکێشێ:

**یەکەم/** له رەسەنێکی بێ رێز بوو ، لە (تراقیە )بە شوانی گەورە بوە ، ئەمەش لەو خەلکە رون بوو بۆیە بە سوکی سەیریان دەکرد .

**دووەم/** لە یەکەم سەردەمی حوکمرانییدا چونی بۆ رۆما بۆ دەستگرتن بەسەر تەختی پادشایەتیی دوا خست ، دواتر بە دلرەق بەناوبانگ بوو ، داوای له کرێکارو پیاوەکانی خۆی دەکرد لە ولاتەکانی دەرەوە کاری بێ ئابرویی ئەنجام بدەن ،بەمە دەنگی تورەیی له دونیا له دژی بەرز دەبێتەوە، بۆیە هەموو لایەک لەسەر روخاندنی رێک دەکەون ئەوەبوو ئیتر ئەفریکا دژی دەوەستێتەوەو لێی

هەڵدەگەرێتەوە دواتر ئەنجومەنی سەناتو و سەرجەم ئیتالیا لێی هەڵدەگەرێتەوە، دواتر سوپاش دێتە پاڵیان کاتێکیش سوپا دەبینێ دوژمنی زۆر دەبن ئەوانیش دڵنیا دەبن کە ناتوانن رزگاری کەن بۆیە ئەوانیش دێنە پاڵیان و بە پیلانێک دەیکوژن .
ئێستاش قسە لەسەر (هلیوجابلوس و ماکرینوس و جولیانوس) جێ دەهێلم، چونکە کەسانی ستەمکاری ناسراو بون ،ماوەی حوکمەکەیان درێژ نەبوو ، ئەم بەشە بەوە کۆتایی پێ دەهێنم کە بە میرەکان بڵێم حکومەتەکانی ئەم سەردەمە بۆ رازی کردنی سوپاکەیان توشی ناخۆشی و ئەزیەت نابنەوە، چونکە ئەگەر میرەکان ناچار بن ریز لە سوپا بگرن بەلام سوپا لەم سەردەمەی ئێمەدا بە حکومەتەکانەوە نەبەستراونەتەوە وەکو بەستنەوەی سوپا بە حکومەتی رۆما و بە کارو باری ئیمپراتۆری رۆماوە ، کارێکی ئەستەم بوو ئەوکات بتوانرێ سوپا رازی بکرێ زیاتر لە رازی کردنی گەل چونکە سوپا لە توانایدا بوو لە گەل زیاتر ئەنجام بدا، بەلام ئێستا ئەرکی میرەکانە گەل رازی بکا زیاتر لەوەی سوپا رازی بکا چونکە دەسەلاتەکان وتوانای گەل لە هی سوپا زیاترە ، تەنها لە دەولەتی تورک نەبێ ، من تورکیام لێ بەدەر کرد چونکە دوانزە هەزار سەربازی پیادە لە دەوری میرە هەروەها پانزە هەزار سواری تر ئەرکیان پاراستنی گیانی میرە یا پادشا یا سولتان بۆیە دەبێ رەزامەندی ئەوان لە سەروی رەزامەندی گەلەوە بێ .
هەمان شێوە لە مەملیکەتی سولتان؛ چونکە لەوێ حکومەت بەدەست سەربازەوەیە ، سولتانیش لەم حالەتەدا ناچارە دۆستایەتی خۆی و ئەوان بپارێزێ ، ئەم حالەتەش بە پێچەوانەی حالەتەکانی تری میرەکانە ، چونکە ئەم حکومەتانە لە حکومەتەکانی پاپا دەچن کە نە دروستکراوەیە و نە جێماوەشە ، لەم حکومەتانە منداڵەکانی میری کۆچکردوو شوێنی باوکیان یا براکانیان ناگرنەوە ، ئەوەی جێی دەگرێتەوە ئەو کەسە دەبێ کە زلهێزەکانی وولات هەڵی دەبژێرن ، ئەم رژێمەش کۆنە ، ناتوانرێ حکومەتی سولتان بە پادشانشینێکی نوێ ناو بنێی ، هیچ بەربەستێک نیە بۆ ئەوەی ئەم جۆرە حکومەتانە ببنە حکومەتی پادشانشینی نوێ و میری نوێ ، سیستەمی حوکمرانیی پادشانشینە نوێکان بە شێوەیەک دارێژراوە کە میر هەڵبژێردراو بێ و لە شوێن میری جێگرەوە ( ویراسی) بێ .
دەبا ئێستا بگەرێینەوە سەر بابەتەکەمان و بڵێین :
( ئەوەی چاو لەو نیشانانەی رابردوو بکا دەبینێ کە رق و کینە هەمویان یا یەکێکیان هۆکاری لەناوچونی ئیمپراتۆرەکانن کە پێشتر باسمان لێیانەوە کرد ، هەندێکیان کۆتاییەکەیان بە چاکە دێ ،هەندێکیشیان بە خەراپی کۆتاییان دێ ،کاتێکیش (برتنکس و ئەسکەندەر) هەردوکیان ئەو میرانە بون کە مەبەستمان

بوون ، بۆ ئەوان کارێکی باش نەبوو لاسایی مارکوس بکەنەوە کە میرێکی بۆ جێماوە بوو (ویراسی)، هەروەها (قراقلا و کومودوس و ماکسیمینوس) کە لاسایی (سیفیروس) یان کردەوە، چونکە ئەوان نەیانتوانی هەنگاو بنێنە شوێن هەنگاوەکانی ئەوو لەسەر رێچکەی ئەو برۆن ، میری نوێ لە دامەزراندنی دەولەتدا دەبێ پەند لە بنەما ورێنما گرنگەکانی (سیفیروس) وەرگرێ ، لە (مارکوسیش) پەند لە بنەماکانی پاراستنی دەسەلاتی دوای دامەزراندن وەرگرێ.

## یەکەی نۆزدەهەم
## سودو زیانەکانی قەلا سەربازیەکان

لە پێناو پاراستنی مولک و سامانەکانیان، میر و پادشکان هەموو رێگاکان بەکار دێنن ، لەوانە هەندێکیان هاولاتیانیان چەک دەکەن ، هەندێک لە پادشاکان ولات بەسەر چەند ویلایەتێکدا دابەش دەکەن ، هەندێکیان بەهۆی گرتنەبەری ئەم رێگا خۆپاراستنانە میللەتەکەیان لێیان هەلدەگەرێنەوەو دەبن بە دوژمنیان ، هەندێکیان هەولیان دا ئەوکەسانە بەلای خۆیاندا بکێشن کە گومانی دلسۆزیان لێیان هەبوو ، هەندێکیشیان قەلایان دروست کرد بۆ خۆ حەشاردان و پاراستنی سەرو مالّیان ، بەلام هەندێکی تریان ئەو قەلایانەیان روخاندن کە پێشتر دروست کرابون ، لێرە ئەو بوارە نیە باس لە وردەکاریی ئەم پرسە بکەین ، بەلام بە شێوەیەکی گشتی من ئەوە دەلّێم کە بروام پێیەتی :

(نەمان زانیوە هیچ میرێکی نوێی ئەم سەردەمە هاولاتیانی خۆی چەک کردبێ ، بە پێچەوانە ئەگەر بینیبێتی بێ چەک بوە ئەوا چەکداری کردوە، چونکە بە چەکدار کردنی ئەم چەکە دەبێتە هی خۆی ، هەر کەسێکیش ئەگەر دلسۆزیش نەبێ کاتێک چەکی پێدەدەیت دلسۆز دەبێ ووەلای بۆ میرەکەی دەبێ ، ئەوکات هەرکەسێک کە هاولاتی بێ دەبێتە لایەنگر.

هەرچەندە نابێ سەرجەم هاولاتیان چەکدار بکرێن ،سود وەرگرتنی میر لە چەکدارەکان ئەوەیە کە دەتوانێ بەسەر بێچەکەکاندا زالّ بێ ، ئەوکات پەیوەستی چەکدارەکان بە میرەوە زیاتر دەبێ ، ئەوانەی بێچەکن وا بیر دەکەنەوە کە چەکدارەکان لە میر نزیکتر و دلسۆز ترن بۆیە هەست بە کەم و کوری دەکەن و داوای بوردنی لێ دەکەن ، بەلام ئەگەر هاولاتیانت چەککرد ئەمە دەبێتە سەرەتای

سوکایەتی پێکردنیان بۆیە دەکەونە پرتەو بۆرەو دەربرینی نارەزایی ، ئەوان ئەم چەککردنە بە مۆری شەرمەزاری دەزانن بۆیە لێت دەبن بە دوژمن .
دیارە کە میر ناتوانێ بێ سوپا بمێنێتەوە ئەوسا ناچار دەبێ سوپای کرێگرتە بگرێتە خۆ کە پێشتر باسمان لە توانای ئەم سوپایە کردبو ، چەندەی ئەم سوپایە بەهێز بێت توانای پاراستنی گیانی تۆیان نابی لە دوژمنە دەرەکی و ناوەخۆییەکان ، بەلام مێژوو وامان پێدەڵێ کە میرە نوێکان هەر زوو هاولاتیانیان پرچەک دەکەن ، ئەگەر میر وێرای ویلایەتی خۆی، بوو بە میری ویلایەتێکی تری نوێ ئەوسا دەبێ هاولاتیانی ویلایەتە نوێکە لە چەک داماڵی ، جگە لەو کەسانەی کە خەلکی ئەم ویلایەتەن و هاوکاریان کردوە لە وەدەست هێنانی ئەم ویلایەتە نوێیە ، ئەگەر دەرفەت بۆ میر رەخسا دەبێ ئەوانیش بێچەک و بێ دەسەلات بکا، بە شێوەیەک دەبێ هێزی بەرگری لەو کەسانە بن کە لە تەنیشتەوەن لە هاولاتیانی ویلایەتە کۆنەکە بن .
باپیرە ئاقلدارەکانمان دەیان ووت:
لە (بیستویە )دەکرێ دابەش بکرێت( بیزە )ش دەکرێ بێ قەلا بێت، ئەوان ئاژاوەیان لە نێو خەلکی ئەو شارانە دروست دەکرد کە سەر بەوانەوە بوون بۆئەوەی پێیان بوەستن ، ئەمەش ئەو سیاسەتە بوو کە پێیان دەوت ( پەرت کە و زاڵ بە) ، دەبینین ئیتالیا بە شێوەیەکی دادپەروەرانە دابەش کراوە بەلام ئەم دابەش بونە سودی نیە بۆ ئەم سەردەمە چونکە هەر کاتەی هێرش کرایە سەر ئەم ولاتە ئەوکات حزبێکی لاواز زوو خۆی دەدا بە دەستەوە بەهۆیەوە حزبە بەهێزەکەش دەروخێ ، خەلکی بوندقیە ئەم سیاسەتەیان لەگەل ئەو ولاتە بەکارهێنا کە لە ژێر دەسەلاتی ئەواندا بوون ، هانی حزبی گولف وگبلین یان دەدا بێ ئەوەی ئەم حزبانە بتوانن شەر بکەن بەم شێوەیە خەلکی ئەو شارانەیان بە کێشەو ململانێی ئەم حزبانەوە خەریک دەکرد ، دیارە ئەم سیاسەتە زۆر بەردەوام نابی وسودی هەمیشەیی نابێ تا ئەو کاتەی (فایلە ) ژێر دەکەوێ پشتگیری لە بەرەی هاولاتیان دەکا تا ئەوکاتەی توانیان دەست بەسەر هەموو ویلایەتەکەدا بگرن ، دواتر ئەم سیاسەتە نیشانەی لاوازی میرە چونکە حکومەتە بەهێزەکان رێگە بە دابەش کردن و نانەوەی ئاژاوە لە نێو حزبەکان و دروست کردنی کێشە نادان لە نیو ریزی هاولاتیانیاندا ، ئەم کێشانە تەنها بۆ کاتی ئاشتی سودبەخشن چونکە بەهۆیەوە حکومەت دەتوانی حوکمی هاولاتیان بکا ، هەر کاتێکیش جەنگ دروست بوو ئەم سیاسەتان بەزیان بۆیان دەگەرێتەوە ، ئەوکات پێویستیان بە یەکریزی

وهاوهەلوێستی هەیە تا بەرانبەر بە دوژمن هێزیان هەبێ ولاواز نەبن بۆیە لە کاتەکانی شەردا ئەم سیاسەتانە دەبنە سیاسەتی ماوە بەسەرچوو.
ئەوکاتەی میرەکان بەسەر کێشەکاندا زاڵ دەبن خۆیان پێگەیان بەرز دەبێتەوە ، دەتوانن ئۆپۆزسیۆن دەم کوت کەن ، بۆیە ئەو میرەی بەهۆی جێماویەوە نەبوتە میر ، خاوەنی بەختێکی باشە ئەگەر دوژمنی بۆ دروست بێ و شەریان لەگەڵدا بکا، لەناویان دەبا ، بەهۆیەوە دەگاتە لوتکەی مەزنی و زال دەبێ بەسەر دوژمنانی، گەلێک کەس هەن وا بیردەکەنەوە کە دەبێ میر دەرفەتێک دروست بکا تا شەرێک بنێتەوە و بەسەریاندا زاڵ بێ بۆ ئەوەی شکۆمەندیی بەدەر کەوێ ، دەبینین کە هەندێک لەو میرە تازانە پشتیان بەو کەسانە بەستوە کە گومانی لێیان هەبوە زیاتر لەوانەی لە سەرەتای حوکمرانییدا متمانەیان پێی بەخشیوەو بۆی دلسۆز بونە ،( باندولفو بتروتشی) میری (سینە) یەکێک بوە لەوانەی ئەم رێگەی بەکار هێناوە بە پشت بەستن بەو کەسانەی لێیان بە گومان بوە ، بەلام ناتوانین زیاتر بچینە ناو ئەم لێکۆڵینەوەیە ، بۆیە من هەر ئەوەند ەدەڵێم :
ئەو پیاوانەی لە سەرەتای حوکمرانیدا دوژمن و ناحەز بون بەهۆی پێویستیان بە هاوکاریەکانی میر هەبوو تا پێگەی خۆیان قایم کەن ، ئەوان بۆ دەست گرتن بەسەریانەوە ئاسان بون ، دواتر ئەوان لە کارەکانیاندا رشت تر بون جۆش و خرۆشیان بۆ کارەکانیان هەبوو تا ئەو وێنەیەی لە هزر و مێشکی میردا هەیە لەسەر ئەوان لاکەوێ و وێنەیەکی نوێیان بۆ بکێشرێ کە دلسۆزی ووەلایانە بۆ میر بۆیە میر زیاتر سود لەم توێژە وەردەگرێ ، ئیتر ئەوان تەنها لە بەرژەوەندی میردا کار دەکەن .
من باس لە ویلایەتێک دەکەم کە خەلکەکەی بە نهێنی هاوکاری میریان کرد تا ویلایەتەکەیان داگیرکا بزانە هۆکارەکەی چی بوو، ئەوان لە خۆشەویستی پادشاوە ئەم هاوکاریانەیان نەدەکرد، لەبەر حوکمە ستەمکاریەکەی کۆنیان ئەم هاوکاریەی پادشا نوێیەیان کرد، دۆستایەتی لەگەل ئەم جۆرە کەسانە ئاسان نیە چونکە هەمیشە لە داخوازی وداواکاری زیاترن ، بە ئاسانی رازی نابن ، ئەزمونەکان وامان پێدەڵێن کە ئەو گەلەی پێشتر لە میر رازی بونە ، ئەوان ئاسانترن بۆ میری نوێ کە دۆستایەتیان لەگەڵدا ببەستێ ، ئەگەر لە سەرەتای حوکمیدا دوژمنیشی بوبن ، هەروەها ئاسانترە لە حوکمی گەلێک کە لە میرەکەیان نارازی بونەو گەلێکی بە ئازارو پر کێشە بونە .
لە دێر زەمانەوە هۆکاری دروست کردنی قەلاکان لە لایەن میرەکانەوە بۆ پاراستنی سەر وماليان و تۆقاندنی دوژمن و بەکارهێنانی وەکو پەناگە بوە ، من ئەم

رێگایەم پێ باشە ، چونکە هی کۆنە بۆ ئەو سەردەم خۆپاراستنێکی باش بوە ، لەگەڵ ئەمەشدا بینیمان کە (نیکۆلا فیتلی) دوو قەلای لە شاری( سیتە دی) کاستیلۆ خەراپکرد ئەمەشی بۆ ئەوە بوو تا بە ئاسانی بتوانێ دەست بەسەر ئەم شارەدا بگرێ ، هەروەها کاتێک (جیدو بالدو دوق ئەریبینو ) لە کۆشکی بورجیە دەردەکرێ و دێتەوە ولاتەکەی سەرجەم قەلاکان دەروخێنێ و دەڵێ:

( بەبێ ئەم قەلایانە دەکرێ باشتر بەرگری لە ولات بکرێ )

دواتر خەلکی (بنتیفولی) کاتێک دەگەرێنەوە پۆلۆنیا هەمان رێگەیان بەکار هێنا ، ئەمەش ئەوەمان بۆ دەردەخا کە دەکرێ قەلاکان سودبەخش بن و دەکرێ زیان بەخش بن کەواتە بە پێی کات وشوێن دەگۆردرێ ، بەلکو لە کاتێکدا یا لە شوێنێک بە سودە بەلام لە شوێن و کاتێکی تردا زیان بەخشە ، ئەمەیە شێوەی پرسەکە : ئەو میرەی لە گەلەکەی دەترسێ زیاتر لەوەی لە دوژمنی دەرەکی دەترسێ دەبێ قەلای هەبێ یا دروستی کا ، بەلام ئەوەی زیاتر لە دوژمن دەترسێ لەوەی لە گەلەکەی ، ئەوکەسە پێویستی پێی نیە ، (بورجی میلانو) کە (فرنسیسکۆ سفورزا) دروستی کرد سەرئێشەی بۆ خانەوادەی سفورزا دروست کرد بەهۆیەوە زۆرترین سامانیان لەدەست دا .

کەوابێ باشترین قەلا ئەوەیە کە لە دڵی پیاواندا دروست کراوە بە خۆشەویستی و دلسۆزی ، ئەو میرەی خاوەنی قەلایە ئەگەر گەلێکی ستەم لێکراوی هەبێ ئەم میرە لەدەست گەلەکەی نەجاتی نابێ ،ئێمە لەم سەردەمە نەمان زانیوە قەلاکان سودیان بۆ میرەکان هەبوبێ جگە لە( کونتیسە دی فورلی) نەبێ لەکاتی مردنی ( ئەلکونت جیرولامۆی) هاوسەری ، ئەوکات لەدەست گەلە ستەملێکراوەکە رادەکاو پەنا بۆ قەلا دەبا تا ئەوکاتەی هاوکاریی لە میلانۆوە پێدەگا و سامانەکەیان بۆ دەگێرنەوە، کات وساتەکان گونجاو نەبون تا هێزەکانی بێگانە بێن هاوکاری گەل بکەن لە دژی شاژن،دوای ئەوە ئیتر سودی قەلاکان نەما کاتێک قەیسەری بورجیە هێرش دەبات ئەوکات گەل دژی بوو لەگەل هێرشبەران هاوکاریان کرد ، بۆئەو باشتر وابوو کە بەر لە هێرشی دوژمن و دوای هێرش لەگەل ئەو خەلکە دۆست بێ ، ئەگەر ئەمەی بکردبایە پێویستی بە قەلا نەدەبوو.

کورتەی وتەکان ئەوەیە بونی قەلا و نەبونی وەکو یەکن ، بەلام لۆمەیی لەوکەسەیە کە دەڵی قەلا لە نەعرەتەی میللەتت دەپارێزێ.

## یەکەی بیستەم
## چۆن میر ناوبانگ دەردەکا ؟

هیچ شتێک بەقەدەر کاری مەزن وچاکە ناوبانگی میر بلاو ناکاتەوە و ریزی بۆ پەیدا ناکا و بەهۆیەوە ببێتە پیاوێکی تاک و ناسراو ، بۆ ئەم سەردەمەمان کەسێکمان هەیە بە ناوی( فردیناندو) کە پادشای (ئەرگون) بوو ئێستاش پادشای ئیسپانیایە ، دەکرێ میرنشینەکەی بە نوێ ناو ببەین و پیای هەڵدەین ، چونکە ئەم میرنشینە بوو میرێکی بچوکی بۆ مەزنترین میر بەرز کردەوەو پێگەی لە ولاتی نەسرانیەکان قایم کرد ، ئەگەر سەیرێکی کارەکانی بکەیت دەبینی کە هەمویان کاری زەبەلاح و مەزنن ، تەنانەت هەندێکیان سنوری نەریتەکانیشیان بریوە ، لە سەرەتای حوکمرانییدا هێرش دەکاتە سەر غەرناتە ، ئەمە بە سەرەتا و بنەمای مولکەکانی دادەنرێ چونکە ئەم کارەی بە دەمارێکی سارد ئەنجامدا ، بێئەوەی هیچ ترسێکی لەوە هەبێ کەسێک دەست لە کارەکانی وەردەدا، دواتر بارۆنەکانی قشتالەی بەم کارەوە خەریک کرد، هیچ مەودای بیرکردنەوەی بۆ نەهێشتنەوە جگە لە بیرکردنەوە لەم شەرە نەبێ ، بە خەیالیاندا نەدەچو کارێکی تر ئەنجام بدا ، بۆیە هێزی زیاتری لەو خەلکە وەرگرت ، ناوبانگی لە ناوبانگی ئەوان رەت کرد ، بێ ئەوەی هەستی پێبکەن ، توانیی بە سامان وسەروەتی کەلیسەو ئەو خەلکە پێش سوپا کەوێتەوە ، بناغەی هێز وناوبانگی بەو شەرە وەرگرت ، جگە لەمە ویستی بە ناوی ئاین و لە ژێرپەردەیەوە کارێکی مەزن ئەنجام بدا ، ئەوەبوو روی لە توندو تیژی ئاین کرد ، لەم روانگەیەوە هەرچی عەرەب هەبوو لەم ولاتە دوای ئەوەی دەستی بەسەر سامان وسەروەتەکانیانی داگرت دەری کردن ، لە مێژوودا هیچ کارێک بەقەدەر ئەم کارە سەیرو سەمەرە تر نیە ، دواتر بۆ هەمان مەبەست هێرشی کردە سەر ئەفریکا ، لە گەڵ ئیتالیاو فرەنسا جەنگی ، بەردەوام بیری لای کاری مەزن وزەبەلاح بوو ، تا ئەنجامیان بدا، گەلەکەی لەم کارانەیدا سەریان سورمابوو لە چاوەروانی ئەنجامەکانیاندا بوون ، بە هۆی ئەوەی کارەکانی یەک لەدوای یەک بەیەکەوە بەسترابونەوە ئەو دەرفەتە نەبوو لە پێش گەلەکەی تا بیر لە ئەنجامەکان بکنەوە و دژی بوەستن.

ئەوەی بۆ میر بە سود دەگەرێتەوە بەرێوە بردنی باشی کارو بارەکانی ناوەخۆی بون ، دواتر لە سەناتو( برناردو دی میلانو) دەگێرنەوە کە یەکێک بوە لە هاولاتیانی ، هەرکاتەی کارێکی باشی ئەنجام دابێ یا کارێکی خەراپ ئەوا لە

لایەن میرەوە سزاو پاداشتی دراوە ، ئەمە بوو کە ئەو خەڵکە باسیان لە کارەکانی میر دەکرد .
سەرەرای ئەمانە هەمووی ، ئەرکی میر بوو کە کاری وا بکا ناوو ناوبانگی باش بۆ خۆی پەیدا بکا ، میر کاتێک کەسێکی بناسیایە کە دۆستێکی راستگۆیە یا دوژمنێکی هەمیشەییە ئەوکات ریزی لێ دەنا ، چونکە پێی وابوو ئەم سیاسەتە باشترە لەوەی بێلایەن بوەستێ ، چونکە ئەگەر دوو دراوسێ کردیانە شەر ، یا سودی بۆتۆ دەبێ یا زیان ، لە هەردوو حاڵەتدا باشترە بۆتۆ رای خۆت بە رونی رابگەیەنی و شەر دژی لایەک رابگەیەنی ، ئەگەر ئەمە نەکەیت دەبیتە نێچیری ئەو شەرە و لە دیدی سەرکەوتوش دەبیتە کەسێکی شەرمەزارو رارا ، بەمەش سەرکەوتن لەدەست دەدەیت ، چونکە کەس دۆستی رارای خۆش ناوێ ، لە تەنگاویەکانیش هاوکاریت ناکەن ، ژێرکەوتیش دڵی خۆت بۆ ناکاتەوەو پێشوازیت لێ ناکا چونکە تۆ هاوکاریت نەکردوە، بەمە هەردوکیان لەدەست دەدەیت ، (ئیتۆلی)،( ئەنتیوکوس)ی ناردە ئەفریکا بۆ راوەدونانی رۆمانەکان ، ئەمیش لە رێگەی گوتارخوێنەکان پەیامی بۆ( ئاخی )وخەڵکەکەی نارد کە دۆستانی رۆمان بون ، ئامۆژگاریی کردن کە بێلایەن بمێننەوە ، دواتر رۆمانەکان داوایان لە خەڵکی ئاخی کرد شمشێرەکانیان بۆ بنێرن ، ئەم داواکاریە خرایە بەر دەمی ئەنجومەنی ئاخیەکان بۆ گفتوگۆلەسەر کردن ، باڵوێزەکانی (ئەنتیوکوس و رۆمانەکان) کەوتنە دیادر ، باڵوێزی رۆمانەکان ووتی:
( لەسەر ئەوەی کە گوتراوە سودی بۆ ئێوە هەیە کە لەم شەرەی ئێمە بەشداری نەکەن و بێلایەن بوەستن، ئەمە زۆر دورە لە راستی ، چونکە ئەگەر بێلایەن بمێنن ئەوکات دەبنە نێچیر بۆ لایەنی سەرکەوتو)
بەردەوام ئەوە دەگوترێ کە ئەگەر یەکێک دۆستت نەبێ داوای لێ دەکەی بێلایەن بێ، هەروەها دۆستت داوای ئەوەت لێ دەکا کە هاوکاریی بکەیت وببیتە یاوەری ، بۆیە میرە لاوازەکان لە رادەربرین لەم جۆرە کێشانە بێلایەن دەوەستن بۆ ئەوەی لە مەترسیەکانی جەنگ دور کەونەوە ، ئەمەش هەردەم دەبێتە مایەی کاولکاریان ، بەلام ئەگەر میر ئازایانە رای خۆی دەربری ولایەنگری لایەنیکی کرد ، ئەگەر ئەو لایەن سەرکەوت ئەوکات سودی بۆ ئەمیش دەبی ، ئەگەر لە ژێر دلۆڤانی ئەویش دابوو بەلام مەترسیی بۆ نابی ، چونکە دۆستایەتی بەرتەقای ئەوە دەمێنێتەوە کە سود بە دۆستانی بگەیەنێ ، تا ئێستا بێ وەفایی و سوک وچروکی نەگەیشتۆتە ئەو ئاستەی سەرکەوتو بەبێ هۆ لە دۆستەکانی هەڵگەرێتەوە ، تەنانەت

ئەگەر لەم جەنگەیدا سەرکەوتنیشی بەدەست نەهێنا بەلام وەکو وەفادارێک بۆ پاراستنت دەمێنێتەوە .
لە حالەتی دوەمیشدا کە ئەنجامەکانی جەنگ لە نێوان هەردوو لایەن یەکسان دەبێ ، دیسان بۆ تۆ لایەنگری لایەک بیت باشترە، چونکە بە هاوکاریەکانت تۆ هەوڵ دەدەیت لایەنێک تێکبشکێنی ، ئەگەر ئەو لایەنە سەرکەوت ئەوا کەوتە ژێر دلۆڤانی تۆوە ، لە کاتێکا ئەستەمە ئەگەر تۆ هاوکاریی بکەیت وسەرنەکەوێ ،لێرە دەمەوێ ئەوە بلێم کە میر نابی هاوکاری لایەنێک بکا کە لە خۆی بەهێز ترە تا کەسانی تر ئازار بدا تەنها لە حالەتە زەرورەکاندا نەبێ ، چونکە ئەگەر ئەو لایەنە بەهێزە سەرکەوت ئەوا تۆ دەکەویتە ژێر دلۆڤانی ئەو ، ئەرکی میرەکان ئەوەیە هەموو هەولەکانیان بخەنە گەر تا خۆیان لە دلۆڤانی میرەکانی تر بپارێزن و نەکەونە ژێر دلۆڤانی ومیهرەبانی هیچ کەسێک.
خەلکی بوندقیە لە دژی میلانو، لەگەڵ فرەنسا یەکیان گرت ، هەرچەندە لە توانایاندا بوو لەم رێککەوتنە دورکەونەوە کە ئەنجامەکەی بە لە ناوچونی ئەوان تەواو بوو ، بەلام ئەگەر خۆ دورخستنەوە لەم رێککەوتنە کارێکی ئەستەم بوایە وەکو حالەتی فلۆرەنسا ، ئەوکات پاپا و پادشای ئیسپانیا نەیاندەتوانی هێرش بەرنە سەر ولاتی لومبارديا بۆیە میر ناچار دەبێ لەگەل لایەنێک وەکو ئەوەی لە سەرەوە باسمان کردوە یەکبگرێ ، داوا مەکەن کە حکومەتەکان وا بیر بکەنەوە پاشەرۆژیان ئاشتی و ئارامی دەبێ ، بەلکو مەزندەی هەموو مەترسیەکان بکەن و هەموو ئەگەرەکان بخەنە سەر مێز چونکە سروشتی کارەکان ئاوەهایە هەردەم ناتوانن خۆیان لە سەرجەم مەترسیەکان دور خەنەوە ، بەلام هەرچۆنێکی بێ ووشیاری وئاگاداری توانای جیاکردنەوەو جیاوازیەکان زیاد دەکا .بەهۆیەوە کەمترین مەترسی و زیانەکان هەلدەبژێرێ ، هەروەها دەبێ میر بە روخسارێکی بەتوانا وبەهرەدار خۆی نیشان بدا ، ئەمەش بەوە دەکرێ ریز لە هونەرمەندە بەهرەداران بگرێ و هانی بازرگانی وپیشەسازی و پرۆژە زەبەلاحەکان بدا ، نابێ بازرگان لەوە بترسێ ئەگەر سامان و سەروەتەکەی زیادیان کرد روبەروی تالان بکرێ و دەستی بەسەردا بگیرێ ئەم مەترسیانە نابێ لای کەسی بازرگان وپیشەسازکار دروست بن ، هەروەها پیشەسازکار نابێ لە زۆری بەرهەمهێنان بترسێ لەوەی باجی زۆری لێ وەردەگیرێ کە بەهۆیەوە ئاستی بەرهەمەکانی دادەبەزن ، ئەرکی میرە هاوکاری بازرگان وپیشەسازکاران بکا لە سەلامەتی خۆیان و بەرهەمەکانیان دڵنیایان بکاتەوە مەترسیەکانیان لێ برەوێنتەوەو پاداشتی کارە چاکەکانیان بدا ، ئەمە بۆ ئەوەی کێبەرکێ لە نێوان بەرهەمکارەکان دروستبێ

وبەهۆیەوە ئاستی نیشتمان لە نێو مەحافلی دوەلی ولە روی ئابوریەوە بەرز بێتەوە ، هەروەها ئەرکی میرە هاولاتیانی لە چوار وەرزی ساڵ بە بۆنەو جەژنە نیشتمانیەکانەوە خەریک بکا و تێکەڵاوی لەگەڵ سەرجەم چین وتوێژە پیشەیی وئەتەنیەکان بکا.

## یەکەی بیست و یەکەم
## وەزیرو نهێنی پاراستن

دەست نیشان کردنی وەزیرەکانی میر کارێکی قورسە، یا دەبێ وەزیرەکان بۆ کارەکانیان دلسۆز بن یا بە پێچەوانەوە ، یەکەم حوکمدانی هاولاتی لەسەر ئەقلیەتی میر ئەو دەست نیشان کردنەی وەزیرەکانە ، پێکهاتەو کەسایەتیەکانی دەورو بەری میر کەسایەتی وئەقلیەتی میر دەردەخا .

ئەگەر ئەو کەسانە کەسانی زیرەک وپاک و بەتوانا بون ئەوا شارەزایی و لێزانی میر دەردەکەوێ ، ئەگەر بە پێچەوانەش بون ئەوا حوکمەکە بە دژی ئەو دەبێ ، چونکە یەکەم هەلە لە بژاردەی کەسانی خەراپدا دەردەکەوێ ، مرۆڤ بەوەی نەدەزانی کە (ئەنتونیو دی فنافرۆ)ی وەزیری (باندلفو بتریچی)ی میری (سینە ) بێ ئەوەی ستایشی میر بکا ئەوەندە وەزیرێکی چاکە کە میر دەست نیشانی کردوە. لەم روەوە سێ جۆرە ئەقلیەتی میر هەن:

**یەکەم/** ئەقلێک بێ هاوکاری دەرەکی زانیاری وشارەزایی پەیدا دەکا .
**دووەم/** ئەقلێک ئەوکاتە لێی تێدەگا کە هاوشیوەی دەبینێ .
**سێیەم/** ئەقلێک نە راستەوخۆ لێی تێدەگا نە بەهۆی لایەنێکی ترەوە.

ئەقلی یەکەم بەرزترین ئەقلە، دووەمیشیان باشە، سێیەمیان هەردەم بێ سودە .
ئەگەر (بوندولفو) لە ئەقلی یەکەم نەبوایە، بێ گومان لە ئەقلی دوەم بوو، تا مرۆڤ بتوانێ باشتر کارەکان لە یەک جیا بکاتەوە و پۆلینیان بکا ئەوەندە ئەقلیەتی ئەو وەزیرە لە ئەقلە باشەکان دەبێ، ئەوەندە راو بۆچونی خەراپ و باش لە کارەکانی وەزیردا چاکسازیی لە یەکمیان کرد و وازیشی لە دووەمیان هێنا .

وەزیر هیچ هۆکارێک بۆ چەواشەکاری نادۆزێتەوە بۆیە ناچارە چاکە بکا ، بۆئەوەی میر نهێنیەکانی وەزی بزانێ رێگایەکی ئاسانی هەیە ، ئەگەر وەزیر بایەخ بە خۆی دا زیاتر لە بایەخ دان بە میر ئەوە کارەکانی لە بەرژەوەندی خۆیدا دەبن نەک بەرژەوەندی میر ، ئەم جۆرە وەزیرانە کەلکی وەزیریان نیە ، یا هەر نەبێ ،نابێ گرەوی لەسەر بکەیت ، چونکە ئەو کەسەی ئەرکی بەرێوە بردنی کاروباری دەولەتی بەدەستە نابێ لە بەرژەوەندیەکانی خۆی کار بکا وتەنها تیە چاوێکی لە دەولەت بێ ، بەلکو دەبێ بە بەردەوام لە بەرژەوەندی میردا بێ ، لە هەمان کاتدا میریش دەبێ چاوی لە بەرژەوەندیەکانی وەزیر هەبێ تا بە ئەمانەت و دلسۆزیەوە کارەکانی ئەنجام بدا ، دەبێ ناوە ناوە پاداشت و خەلاتی بکا ، ئەرکی بەرپرسیارێتی مەزنی بخاتە ئەستۆ تا هەست بە متمانە بکا ، لە روی بەرژەوەندی وخەلاتکردندا نابێ بۆ وەزیرەکان میر قەرس و رەزیل بێ تا ئەوان چاویان لە سامان و بەرپرسیارێتی ئەوانی تر نەبێ و لە هەموو حالەتەکاندا بەرگری لە میر بکەن و لە هەلگەرانەوەو کودەتا خۆیان بە دور بگرن ، نابێ وەزیر هیچ کارێکی تری حکومی بێ پرس و هاوکاری میر لە ئەستۆ بگرێ ، ئەگەر پەیوەندیەکانی میر و وەزیرەکانیان بەم شێوەیە بون ئەوکات هەردوکیان دەتوانن گرەو لەسەر ئەویتر بکەن و پشت بە یەکرت ببەستن و لەیەکتر دلنیا بن ، ئەگەر ئەم پەیوەندی و دۆستایەتیە لار بون ئەوکات ئەنجامەکان بە نادلی هەموو لایەک دەبن .

## یەکەی بیست ودووەم
## پەراوێز خستنی ماستاوچیەکان

دەورو بەری پادشاکان پریەتی لە ماستاوچی ، چونکە مرۆڤ خۆی خۆش دەوێ بۆیە لەو کارانەی پەیوەندیی بە خۆیەوە هەیە ، فێل لە خۆی دەکا ،چونکە ناتوانێ خۆی لە پەتای ماستاوچیایەتی دور بگرێ ، ئەگەر هەولی ئەوە بدا دەبێتە کەسێکی رەزا قورس ، بۆ خۆ دورخستنەوە لەو جۆرە کەسانە تەنها یەک رێگا هەیە ، ئەو خەلکە تێبگەیەندرێ کە هیچ خەراپییەک بۆ تۆ نیە ئەگەر بە راشکاوانە راستیەکانت پێ بگوترێ ، ئەگەر هەموو کەسێک توانیی راستیەکان بە روتدا بلێن ئەوکات ریزی خۆیان لەدەست دەدەن ، چونکە میر رێگەی تری هەیە بۆ گەیشتن بە راستیەکان ، ئەویش لەخۆ ئالاندنی چەند کەسێکی ئاقلمەند تا لە رێگەی ئەوانەوە لە رەوشەکان بگاو پرس و راوێژیان پێ بکا ، ئەو جۆرە کەسانەش لەوانە بن کە راستگۆۆ جێی متمانە بن ، دوای گوێ گرتن لە راو بۆچونەکانیان و وەلامی پرسیارەکانیان، گوێ لە هەموو بۆچونەکانیان بگرێ بەلام بە گوێرەی هەلسەنگاندنەکانی خۆی رەفتار بکا ، وایان تێبگەیەنێ کە لە گوتەکانیان گەیشتوەو ووتنی راستیەکانیان بۆ ئەو پر سود بون ، هەروەها بیانگەیەنێتە ئەو بروایەی کە تا ئەوان لەسەر ئەم راستگۆییە بمێننەوە لای ئەو جێی متمانە و بروان ،ئەمەو جگە لەم کەسانە رێگە بە کەسێکی تر نەدات ، دوای بیرکردنەوە لە کارو کاردانەوەکانی بەردەوام بێ ، وا نیشان بدا کە ووتنی راستیەکان بۆ ئەو پر سود بون ، رێگە بەو راوێژکارانە نەدا جگە لەوەی ئەو بۆی دارێژراوە ، من لەم روەوە نمونەیەک دەهێنمەوە :

دەگێرنەوە (بریە لۆقە )یەکێک بوە لە یاوەرانی (ماکسمیلیانی ) ئیمپراتۆری ئێستا ، دەلێن ئەو ئیمپراتۆرە هیچ کاتێک راوێژی بە کە س نەدەکرد ، لەگەل ئەوەشدا نەیدەتوانی هیچ کارێک بە پشت بەستن بە فکری خۆی ئەنجام بدا ،چونکە راوێژکاری نەبوو ، چونکە ئەو ئیمپراتۆرە نهێنی پارێز بوو کەس لە کارەکانی بە ئاگا نەبوو راو پرسی بە کەس نەدەکرد بۆیە کەس لە کار و نیازەکانی نەدەگەیشت ، هەرکاتەی کارێکی ئەنجام بدابایە دەبوە دەنگ و دۆل و هەرای دەنایەوە ، کۆمەلێک کەس لێی قیت دەبونەوەو نارەزاییان دەردەبری ، دەبونە تەگەرە لەبەر دەم ئەنجام دانی کارەکەی ، ئەمەش دەبوە مایەی ئەوە ، ئەوکار وبەرنامەی دوێنی دایرشتوە ئەمرۆ لێی هەلوەشێتەوە ، کەس لە نیازەکانی بە ئاگا نەبوو هەروەها

کەس گرەوی لەسەر پەیمانەکانی ئەو نەدەکرد ، میر هەردەم پێویستیی بە مشوەرەو پرس ورا هەیە بەتایبەت ئەوکاتانەی ئەو مەبەستیەتی نەک ئەوکاتانەی خەلک مەبەستیەتی ، نابێ مشوەرەی کەسێک قەبولکا کە خۆی داوای لێی نەکردوە ، دەبێ زۆر بپرسێ و باش گوێبگرێ ، سینگ فراوان بێ بەرانبەر بەو کەسانەی زوو هەڵدەچن و تورە دەبن ، دەبێ لەوە تورە بێ ئەگەر کەسێک ئاگاداریی لەسەر ئەو کەسانە پێدا کە لە دەوری خۆیەتی ، ئەگەر میر کەسێکی ئاقل وژیر نەبێ نازانێ چۆن سود لە ئامۆژگاری و زانیاریەکانی دەوروبەر وەرگرێ ، دەبێ لەو مشوەرانە بەئاگا بێ و سودیان لێ وەرگرێ چونکە دەبێ ئەوە بزانێ ئەوانەی بەم کارە هەڵدەستن دورنیە چاویان لە شوێنەکەی بێ .

میری بێ ئاقلیش ئەوکەسەیە کە پرس بە زۆر کەس دەکاو لە ئەنجامی ئەو زۆری راو بۆچونانە ناتوانی رایەکی راست بۆ خۆی هەڵبژێرێ لە ئەنجام بە هەلەدا دەچێ ، چونکە هەموو ئەو کەسانەی پرسیان پێ دەکرێ هەر یەکەی لە بەرژەوەندیەکانی خۆیەوە وەلامەکان دەداتەوە ، ئیتر میر لەم نێوەندە ناتوانی رێگە گونجاوەکە هەڵبژێرێ .

ئەمەش حالەتێکی هەمیشەییە ، ئەگەر کەسانێک ناچار نەبن دلسۆزت بن ، چەواشەت دەکەن وسەرلێشێواوت دەکەن ، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە ئەو پرس و رایە باشانە سەر بە هەر سەرچاوەیەک بن دەبێ میر بە ئاگا بێ لێیان ، سەرچاوەی هەرەشەو ئاگادارکردنەوەکانی میر لە کارە بەشەکانەوە نیە .

## یەکەی بیست و سێیەم
## میرە ئیتالیەکان بۆ پیرنشینەکانی خۆیان لەدەستدا ؟

ئەو بنەماو رێنمایانەی لە بەشەکانی پێشو باسمان کردن ئەگەر میری تازە رەچاویان بکاو جێبەجێیان بکا ، پێگەی بەهێز دەبێ وەکو میرە کۆنەکە دەمێنێتەوە ، چونکە میری تازە لە میری کۆن زیاتر دەکەوێتە ژێر چاودیری ولە کارەکانی دەکۆڵدرێتەوەو بەچاوێکی هەڵسەنگاندن سەیر دەکرێ ، ئەگەر خەلک بۆی دەرکەوت کە کارەکانی روو لە چاکەن ئەوکات لە میرە کۆنەکە خۆشەویستتر دەبێ ، زیاتر لە میرە کۆنەکە بۆی دلسۆز دەبن و گوێرایەلی دەبن ، ئەمە چونکە ئەو خەلکە حالی حازریان لەبەر چاوە زیاتر لە رابردوو ، ئەگەر ئەمرۆ حال و گوزەرانیان باش بوو ئەوا نەهامەتیەکانی دوێنێ لە بیر دەکەن و بەرگری لە میرەکەیان دەکەن تا بتوانن ، چونکە ئەم میرەیان هیچ کەم وکوریەکی نیە ئەوا لە جیات ریز وستایشێک دوانی پێ دەبەخشن ، ئەگەر میرە کۆنەکەش بارو دۆخی ژیانی ئەوانی کردبێتە دۆزەخ ئەوا لە جیات یەک شەرمەزاری دوانی پێ دەبەخشن.

ئەگەر سەیرێکی بارو دۆخی ئەو پادشایانە بکەین کە پادشانشینەکانیان لەدەست داوە بە نمونە وەکو : پادشای ناپۆلی ، و دۆق میلانو و هیتریش، ئەوا یەکەم کەموکوریان لە سوپاکەیانەوە بوە ، ئەمەش ئەوەیە کە پێشتر باسمان کرد ، دواتر گەلەکانیان لێیان رازی نەبونە ، یا ئەشرافەکانیان لەگەڵیاندا نەبونە ، بەبێ یەکێک لەم سێ هۆکارانە پادشا تەختی پادشایەتی لەدەست نادات ئەگەر سوپاکەی لە مەیدان ئامادە نەبێ بۆ پاراستنی .

فیلیپ ی مەکەدۆنی واتە باوکی ئەسکەندەر مەکەدۆنی، ئەو بوو( تیتس کونتیس) ی تێکشکاند ولەناوی برد ، هیچ کاتێک پادشایەکی نەبوە بهۆی هێرشی کرانە سەری لەبەر پادشای روماو ئەغریق پارابێتەوە . بەلکوو شەرکەربووە ، لە سیاسەت کردن لەگەڵ گەڵدا شارەزا بوو ، لە ئەشرافەکانیش دڵنیا بوو بۆیە بە چاکی جەنگی و توانیی بەردەوامی بەو جەنگانە بدات کە ماوەی چەندین سال لەگەڵ رۆما بەردەوام بوو ، هەرچەندە لە کۆتاییا چەند ناوچەو هەرێمیکی لەدەست دان بەلام مولکەکانی خۆی گرتنەوە .

بۆیە نابێ ئەو میرانەی دەسەلاتەکانیان لە پادشانشینەکان لەدەست داون لۆمەیی لە رۆژگار بکەن ، بەڵکوو دەبێ گلەیی لە بێباکی وسستی خۆیان بکەن چونکە نەیانتوانی لە کاتەکانی ئاشتیدا دۆخەکان بگۆرن بە شێوەیەک کە لە بەرژەوەندیەکانیاندا بێ ، وەکو ئەو کەشتیەوانەی کە لە کاتەکانی سامالٌ دا حساب بۆ گەردەلولە ناکەن ، کاتێکیش کارەساتەکان دێنە پێشیان بیر لە هیچ بەرگریەک ناکەن جگە لە راکردن وخۆ دەرباز کردن نەبێ ،ئەوان وا بیر دەکەنەوە کە گەل تۆلە لە داگیرکەر دەسێنیتەوەو لە ولاتیان وەدەر دەنێ و ئەوان دەگێریێتەوە سەر دەسەلات ، گومانی تیا نیە ئەم رێگاچارەیە رێگایەکی باشە ئەگەر رێگای تر نەگرێتە بەر ، بەلام هەلەیە ئەگەر لە چاوەروانی ئەم رێگا چارەیەدا بیت و رێگاکانی تر پشتگوێ بخەیت ، چوکە کارێکی گەوجەییە مرۆڤ حەزبکات بکەوێ بەهیوای ئەوەی کەسانی تر پێیان ناخۆشە و زوو هەلێ دەسێننەوە ، هەلساندنەوەی سەرپێ بۆی هەیە ببێ و بۆشی هەیە نەبێ ، چونکە چاوەروانی کردنی ئەم جۆرە بەرگریانە نیشانەی ترسنۆکییە ، نابێ گرەوی لەسەر بکرێ ، کەوابێ هیچ جۆرە بەرگریەک سودی نیە تەنها ئەوەی بە دەستی خۆت نەبێ .

## یەکەی بیست و چوارەم
## بەخت و مرۆڤ

دەزانم کە گەلێک کەس وای دەبینن  ئەو رووداوانەی لە دونیا روو دەدەن پەیوەستن بە بەخت و لەسەر ئیرادەی خوا وەستاون ، بە شێوەیەک مرۆڤ ئەگەر هەرچەندەی بە توانابێ ناتوانێ ئاراستەی ئەم رووداوانە بگۆڕێ ، کارێکی گێرەشێوێنیە ئەگەر هەوڵ بدەیت خۆت لەم رووداوانە بپارێزی کە روونەدەن ، کەوابێ باشترین شت ئەوەیە وازیان لێبێنی چۆنی روو دەدەن با رووبدەن ، ئەم بۆچونە لە گوێی خەلک دەزرینگێتەوە کاتێک خۆیان بینیان ئەو رووداوانەی رویان دان کە لە مەزندەی کەسدا نەبون چۆن هاتن و چۆن رویاندا.
منیش ئەگەر بیرم لە هەندێک رووداو کردەوە دەبینن کە منیش بەلای هەمان راو بۆچوندا چوم  ، لەگەڵ ئەمەشدا نابێ مۆمی ئیرادەمان کز بێ و خۆمان رادەستی ئەو بۆچونانە بکەین بەلام من بروام وایە کە بەخت رۆلی لە 50% ی رووداوەکان دەبینێ  لەم دونیایە ، نیوەکەی تر بۆ ئێمە جێدەهێلێ ، یا کەمتریش کە خۆمان رۆلی تیا ببینین ، من بەخت بە روبار دە شوبهێنم ، ئەگەر هەلسا دۆلەکان هار دەبن و ژێرئاو دەکەون ودرەختەکان لە رەگ وریشە هەلدەکەندرێن و مالەکان دەروخێن ، هەموو کەسێک لە ترسی ئەم لافاوە رادەکان ، هیچ شتێکیش لەبەردەم ئەم لێشاوە پارێزبەندیی نیە ، ئەگەر ئەم روبارە داهاتەوەو ئارام بۆوە ئەوکات خەلکەکە دەتوانێ خۆیان لە کارەساتی لێشاوەکە بپارێزن ، ئەوکات پرد و بەنداو دروست دەکەن ، ئەگەر ئەمجارەشیان لافاوەکە هەلسایەوە ، ئەوکات یا بە سودی هەندێک کەس تەواو دەبێ یا ئەنجامەکەی خەراپ دەبێ ، ئەمە حال و رەوشی بەختە ئەگەر هەلسا هیچ شتێک بەری لێ ناگرێ و ناتوانێ رێگریی لێ بکا ، ئەو کارەساتەی روو دەدا کەس ناتوانێ پێشی لێبگرێ ورێگریی بکا ، ئەگەر سەیرێکی ئیتالیا بکەین کە مەیدانی رووداوەکانی بەخت بوو ، دەبینین هیچ رێگریەکی بۆ نەبوو ، نە بەنداو نە پرد ، ئەگەر وەکو فرەنسا و ئەلمانیا وئیسپانیا پارێزرابا ئەوکات توشی ئەو کارەساتانە نەدەبوو کە رویاندا ، خۆی رادەستی بەخت نەدەکر، ئەگەر ئەمە رویدابا رێگری هەبوایە ئەوەی رویدا لە کارەسات روو نەدەدرا، ئەمەندە بەسە کە دەبینین بەخت چەند یاوەری رووداوەکانە .
ئەگەر باسەکەمان لەسەر کەسەکان کورت کردەوە دەبینین کە میر هەیە رۆژێک کەیف خۆش ورۆژێک دلتەنگ، بێ ئەوەی بەهۆی کارەساتەکانەوە هیچ لە رەفتارەکانی خۆی گۆریبێ ، من وای دەبینم کە ئەمە هۆکارەکەی ئەوەیە کە باسمان

کرد واتە بەخت رۆلی تیا بینیوە ، ئەو میرەی خۆی و کارەکانی رادەستی بەخت دەکا ، ئەو بەختە توشی هەلاکەت و نەهامەتیی دەکا ، دیسان دلخۆشی ودلتەنگی میر پەیوەستە بەو سەردەمەی تیایدا دەژی وبەو رۆژگارەی تیایدایە ، لە بەرژەوەندیی دابوە یا دژی ، پیاوان بەهەر شێوەیەک بێ هەولی گەیشتن بە سامان و پێگەی بەرز دەدەن ، هەندێکیان بۆ ئەم مەبەستە بە پەلەن هەندێکیشیان بە هێواشی دەیکەن ، هەندێکیان بە توندی وهەندێکیان بە نیانی ، هەندێکیان بە خۆشی وهەندێکیان بە تورەیی وتوندو تیژی ، بەلکو هەمویان دەگەن بە مەرامەکانیان یا نایگەن پێی ، ئەم گەیشتنەش لە ئەنجامی وشیاری وخۆ ئامادەکردن بۆ گشت ئەگەرەکان دەبێ یان نابێ ئەمەش هۆکارەکەی بۆ کات وسەردەم دەگەرێتەوە بەلکو بەخت لەم بوارە رۆلی باشی دەبێ لە گەیشتن بە مەرامەکان ،
ئەگەر ئەو گەیشتن بە مەرامەی لە ئەنجامی ووشیاری میرەوە جارێکیان سودی هەبوو پێی گەیشت جارێکی تر بەلکو بەختەکە دەگۆردرێ و پێی ناگا واتە بێ سود دەبێ ، بێ ئەوەی هیچ لە رەفتارو شێوازەکانی کاری بگۆرێ کەچی شکست دەهێنێ ، پیاوەکان ناتوانن بەهۆی داب ونەریت یا بەهۆی ئارەزوەکانیان رەفتاریان بگۆرن ، بۆیە ئەگەر هەر کاتێک پێویستی بە وشیاربون هەبوو ئەوا روبەروی شکست دەبیتەوە ، چونکە ئەگەر وا پێویستکرا مرۆڤ رەوشتەکانی بگۆرێ ئەوکات ئەیهاوار ئەگەر بەختەکەی گۆرا چی بەسەر دێ .
پاپا یولیوس زۆر رشت بوو ، بەهۆی گونجانی بارو دۆخەکانی لە کارەکاندا سەرکەوتو بو ، سەیری ژیانی (جیوفانی بنتیفولی) بکە لە ئەوکاتەی جەنگی یەکەم لەسەر پۆلۆنیا رادەگەیەنێ ، ئەوکات خەلکی بوندقیە لەو جەنگە رازی نەبون ، بۆیە فرەنسا و ئیسپانیا دژی وەستانەوە ، بەلام لەگەڵ ئەوەشدا پاپا گوێی پێنەداو بە تەنیا ئاگرەکەی هەلگیرساند.
ئەم کارە رەنگدانەوەی لە ئیسپانیا و بوندقیە بەدی دەکرا ، لە یەکەمیان لە ترسا ، لە دوەمیشیان بەهۆی ئارەزوەکانی لە دەست گرتن بەسەر پادشانشینی ناپۆلیەوە ، دواتر فرەنسا ویستی ئەمە بە واژوی خەلکی بوندقیەو رەزامەندی پاپا ئەنجام بدا ، بۆیە نەیتوانی پاپا لە خزمەتەکانی سەربازەکانی بێبەش بکا ، بەم شێوەیە پاپا توانیی بەم رشتی و گەرمیەی کارێک ئەنجام بدا کە پاپاکانی پێشتری نەیانتوانی بوو ئەنجامی بدەن ، چونکە ئەگەر لە چاوەروانی ئەوەدا بن کە کارەکان بەر لە جولە پێکردنیان لە رۆما تەواو بن هەروەک پاپاکانی تر دەیانکرد ئەوکات ئەمەی کرا نەدەبوو ، چونکە پادشای فرەنسا لەوە گیری نەدەخوارد کە هەزار بیانو بێنێتەوە ، هەروەک ئەوانی تر کە دلی پاپایان بە هەزاران مەترسی پر دەکر ، من

کارەکانی تری کە هەمویان سەرکەوتن بون بۆ کورتی تەمەنی دەگێرمەوە، چونکە ئەگەر لە ژیان بمابایەوەو لەو هەموو مەترسیانە بە ئاگا بوایەو چاوی هەموو شتێکی بەدی بکردبایە پێم وایە ئەو سەرکەوتنانەی بەدی نەدەهێنا ، چونکە نەیدەتوانی شێوازی کارەکانی بگۆرێ ، دەرکەوت کە بەخت دەگۆردرێ شێواز ورەفتارەکانی مرۆڤ ناگۆردرێن، ئەوان بەهۆی سەرکەوتنی بەختەکانیان سەردەکەون ، ئەگەر پێچەوانەی بەختەکانیان جولانەوە ئەوا ژێردەکەون ، بەلام من پێم وایە ورەو سۆزی مرۆڤ لە ووشیاری وبەئاگابون و بینین باشترە بۆ سەرکەوتن ، چونکە بەخت مێینەیە ئەوکەسە بەسەریدا زاڵ دەبێ کە بەهۆی هێزەوە شکستی پێبهێنێ و ژێری بخا ،دیارە خۆیشی هەمیشە رادەستی کەسانی بەهێز دەکا ، لەگەل ئەو کەسانەدا دۆست نیە کە رارا و لە کارەکانیان سستن، دیارە وەکو هەموو مێینەیەک ئاشقی گەنجەکانن چونکە ئەوان کەمتر بەئاگا و وشیارن لە کارەکانیان و لە پیرەکان بەهێزتر وبە جورئەتتر وبە توانا ترن .

## یەکەی بیست و پێنجەم
## رزگارکردنی ئیتالیا لە دەستی بەربەرە بێگانەکان

دوای ئەوەی سەیرێکی ئەو هەموو پرسانەم کرد دەڵێم:
من بیر لەوە دەکەمەوە ئەگەر میری تازەی بە ئاگاو وشیار کاتی ئەوەی نەهاتبێ بچێتە ناو سیستەمێکی نوێی بە ئابروو کە سود بە هەموو گەل بگەیەنێ ، وا نیشانم بدا کە کاتەکان گونجاون ، لە کاتێکا ئەمە لە کۆمەڵگای ئێمە هێشتا روی نەداوە ،
ئەگەر ئەوە زەرور بێ بۆ نیشاندانی هێزی موسا بۆ بەدیل کردنی ئیسرائیل لە میسر و بۆ نیشاندانی ورەی قورش بۆ زەلیل کردنی میدس ی فارس و نیشاندانی پایە بەرزی هیمەتی تیسیوس بۆ لەیەک جیا کردن و پەرش و بلاوکردنی خەلکی ئەسینا و هەروەها بۆ ئەم سەردەمە بۆ نیشاندانی روناکی زانایی میری نیشتمانپەروەر، وا پێویستکرا کە ولاتەکەمان بکەوێتە ئەم دۆخەی ئێستا تێی کەوتوین ، بۆئەوەی ولاتەکەمان بکەوێتە دۆخێک لە دیلی بەنی ئیسرائیل خەراپتر بێ  ولە ژێر فشارێک لە فشاری فارس توندتر بێ و پەرش و بلاویەک لە پەرشو بلاوی رۆلەکانی ئەسینا بلاو تر بێ ، ولاتێک بێ بێ سەرۆک ، بێ سیستەم و رژێم ، بن دەست وداگیرکراوو ستەم لێکراوو مافخوراو، سوکایەتی پێکراو ، لە ئاست هەموو پێوەرە خەراپەکاندا بێ ، هەرچەندە هەندێک بە ئومێدەوە سەیری دەکەن ، ئومێدێک لە لای خواوەندەوە هاتبێ بۆ رزگار کردنی بەلام لە لوتکەی مەزنی خۆیەوە بێبەختە و تیا چوە زولمی لێکراوە ، ولاتەکەمان وەکو ئەوەی کە مردو بێ وایە ، لە چاوەروانی میرێکدایە لومباردیا لە ژێردەست رزگارکا توسکانە لە ستەمکاری وەدەرنێ ، چارەسەری ئیتالیا بکا ئەمانە هەمویان داوو دەرمانیان پێویستە بۆ چارەسەری برینەکانیان تیمارکردنی پێویستە.
سەیرێکی ولاتەکەت کە چاوەروانی یەکێک دەکا لەم دۆخەی رزگارکا ، سەیریکە لە چاوەروانی و ئامادەیی ئەوەدایە لە دوای هەر ئالایەک بروا کە بتوانێ بەرگریی لێ بکا ، هیچ ئومێدێکی نیە تەنها ئەوەنەبێ خانەوادەکەت هەڵسێ بە رزگار کردنی ، جا ئەگەر خانەوادەت بەم ئەرکە پیرۆزە هەڵسا و لە خۆشەویستی خواوە بۆ خانەوادەو خەلیفەکانتان ئەم کارەتان ئەنجامدا ، پێم وایە ئەم کارە لای تۆ ئەوەندە قورس نیە ئەگەر ناوی ئەو میرانە بێنیتەوە یادت کە ناوت هێنابون ،

چونکە کارەکانی ئەو پیاوانە کاری سەرسورهێنەر بون چونکە ئەوان کەسانی کەم وێنە بوون ، هەرچەندە ئەوان وەکو ئێمە ئادەمیزاد بون ،ئەوان دەرفەتی گونجاویان لە تۆ باشتر بۆ نەرەخساوە تا بە ئاستی تۆ بگەن ، خوا بەقەدەر تۆی خۆش ناوێن ، ئەو کارەی ئەوان ئەنجامیان داوە لە کارەکانی تۆ دادپەروەرترو بەرزترو هەروەها ئاسانتریش نین ، داخوازیەکی دادپەروەرانەت لە پێشە ئەنجامی بدەیت چونکە جەنگی زەرور جەنگێکی دادپەروەرە، سوپاش دلۆڤان و میهرەبانە ئەگەر ئێمە هیچ دەرفەت وئومێدێکی ترمان نەبێ جگە لەوان ، ئەمەش داخوازی و ئارەزوی نیشتمانە بە گشتی ، لەوە ئاسانتر نیە کە کارێک بە هەولی هاولاتیان ئەنجام دەدرێ ، چونکە تۆش هەمان رێگە دەگریتە بەر کە میرەکانی پێش تۆ گرتبویانە بەر لە ئەنجامدانی ئەم جۆرە کارانە ، جگە لەمانە هەموی ئەوانەن کە خوا ئەنجامیان دەدا، دەریای لەت کرد ، پێغەمبەری ناردنە خوار ، ئاوی لە بەرد دەرکرد، گەزۆی لە ئاسمانەوە باراندە سەر زەوی ، هەمویان هۆکار بون بۆ مەزنی مرۆڤ بۆیە ئەوانەی کە ماون دەبێ بە هۆی تۆوە ئەنجام بدرێن ، ئەگەر ئاگایان لە تۆبوو .
خوا هەموو شتێک ئەنجام نادا ئەمەش بۆئەوەیە ئازادی کارکردنمان بۆ جێبهێلێ ، تەنها لە نەمری بەشمان بۆ ناهێلێتەوە.
سەیر نیە کە تا ئێستا پالەوانێک بەم شێوەیە نەهاتوە لە شێوەی ئەوەی من باسی تۆم کردوە و داوام لێت کردوە ، ئەگەر لە جەنگ و شۆرشەکان ئەوە رون بوبێتەوە کە توانای جەنگ بونی نیە ، ئەمە تەنها لەبەر ئەوە بوە چونکە شێوازی شەرەکان کۆن و بەسەرچوو بوون ، کەس دەرنەکەوتوە کە رێگایەکی نوێ بدۆزێتەوە ، پیاوی نوێ وەکو یاساو رێنمای نوێ بەدەر ناکەون ، ئەگەر ئەو کەرەستانە شتی باش بن و کاری باش بەهۆیانەوە ئەنجام دەدرێ خاوەن گیانێکی بەرز و بەرێزن و لەسەر بنەمایەکی پتەو بنیات نراون ، لە بچوکەکانیش شتی چاک هەن هەروەک لە شتە مەزنەکان هەن.
خەلکی ولاتەکەمان بە کەسانی زیرەک و بەتوانا ناسراون ، ئەگەر جەنگ هاتە پێش لاواز دەبن ، ئەمەش نیشانەی لاوازی سەرکردەکان و بێتواناییانە، چونکە ئەوانەی دەزانن گوێرایەل نین، هەموو کەسێک وا خۆی نیشان دەدا کە دەزانێ ،کەس بەهۆی تواناکانیەوە سەر ناکەوێ بەلکو بەهۆی بەختەوە سەردەکەوێ کاتێکیش دەبنە خاوەن دەسەلات خەلکەکە ناچار دەکەن کە گوێرایەلی بن و لەژێر فەرمانەکانی بجولێنەوە ، لەم رەفتارانە ئەوە دەرکەوت  کە کاتەکان لە بەرچاوی خەلک درێژ دەبنەوە.

له هەموو شەرەکانی ئەم دوو سەدەی دوایی کە روبەروی ئیتالیا بۆتەوە ژێرکەوتن یاوەری ئیتالیای شورەبەندکراو بوە ، تاروو ئەسکەندەریە و کابوە وسەربازەکانیان و فایلەو پولونیاو مستری شایەدی ئەمەن ، ئەگەر خانەوادە بەرێزەکەتان دەیەوێ بە دوای رێچکەی ئەو قارەمانانەدا بچێ کە نیشتمانەکەیان رزگار کرد، یەکەم ئەرکی سەرشانتان ئەوە دەبێ لە هاو نیشتمانیانت هێزێکی شەرکەر دروست بکەیت ، چونکە لەوان دلسۆزتر و ئەمینتر نادۆزیەوە ، ئەگەر هەموویان چاک بون بە کۆم بونیان هێزێکی باش پێک دەهێنن کە لە پێش خۆیان میرێکی وەک تۆ میهرەبان دەبینن کە هاوکاریان دەکا ، کەوابێ زۆر زەرورە ئەم سوپایە لەم هاونیشتمانیانەت دروست بکە تا بتوانی هاوکاری ئیتالیا بکەیت ونیشتمانەکەت لە هێرشەکانی بێگانە بپارێزی .

دەڵێن گوایە پیادەکانی سویسراو ئیسپانیا بەهێزترین سەربازو پالەوانترینیانن ، هەریەکەیان کەم وکوریەکیان هەیە ، ئەگەر جۆری سێیەم دەرکەوت بە دڵنیاییەوە لێیان دەبەنەوە ، چونکە ئیسپانیەکان بەرگەی هیرشی شەرکەرە سوارەکان ناگرن ، سەربازە سویسریەکانیش کاتێک لەگەڵ سوپایەک روبەرو دەبنەوە ئازایانە هیرش دەبەن ودەجەنگن ئەوان بەرگە ناگرن وشکست دەهێنن ، ئەگەر ئەمە ئێستا روینەدابێ بەلام کاتی خۆی لە شەرەکانی رافتە ئەمە رویداوە و سەلمێندراوە ، کاتێک پیادەی ئیسپانیەکان بە نەخشەو پلانی سویسریەکان هێرشیان بردە سەر پیادەی ئەلمانەکان ، ئیسپانەکان ئەوکات توانیان هێلەکانی ئەلمانەکان ببەزێنن و سوپاکەیان گەمارۆ دەن بێئەوەی ئەلمانەکان بتوانن بەرگری لە خۆیان بکەن ، ئەگەر سەربازی سواریان بۆ نەهاتبایە کارەساتیان بەسەردا دەهات ، ئەگەر کەم و کوریەکانی هەردوو جۆر بزانین دەتوانین جۆری سێیەم داهێنین کە بەرگری سوار بکا بێ ئەوەی لە پیادەش ترسی هەبێ ، ئەمەش بە سەربازی نوێ ناکرێ بەلکو بە سیستەمی نوێ دەکرێ ، ئەم جۆرە چاکسازیە لە سیستەمی شەردا ئەگەر خرایە نێو سوپا ئەوکات بە توانایەکی بەرزتر خویان و میرەکەیان دەجەنگن ، جا ئەم دەرفەتە لەدەست نەدەیت تا ولاتەکەت بە ئازادی و رزگارکراوی نەبینی ، رزگارکردنێک بە هێز و بازوی ئێوە بێ ، من لەوە دەستەوەستانم کە بتوانم خۆشەویستی خەلکی ئەو ویلایەتانەت بۆ نیشان بدەم کە بۆتۆیان هەیە لە کاتی هێرشەکەی بێگانەکاندا ، نازانم بە چ زمانێک بە چ تینوێتیەک بە چ بروایەک ئەم خۆشەویستیە دەربرم ، چ گەلێک حەزدەکا تۆی خۆش بوی و بەرفەرمانەکانت بێ و چ چاوچنۆکێک بەرگریت بکا و چ نیشتمانپەروەرێک لێت هەلدەگەرێتەوە ، ئەم سەروەریەی بێگانە لوتی هەمومان دەشکێنێ ، جا ئایا ئەم ئەرکە مەزنە دەخەیتە ئەستۆی خۆت

و ئەم میللەتە لەم زەلیلیە رزگار بکەیت؟ ، ئومێدەکان زیندو دەکەیتەوە ولاتەکەمان بۆ ئاستێکی شایستە بەرز دەکەیتەوە؟ ئەمانە هەمویان لە شانی تۆ دەوەشێنەوە ئەوکات دەلێین گوتەکەی (بترارک) راست بوو کە ووتی :

(چاکە دوژمنی نەزانیە ، چەک هەلدەگرێ ، پەلە لە شەڕکردن دەکا ، شەڕەکە ئەوەندە ناخایەنێ، چونکە ورەو ویژدانی کۆن کە دڵمان دەجولێنێ هێشتا بە زیندویی ماوە).

تەواو

پێرست

-------------------------------------------------------------------

مکیافیللی ودەستەواژەی(مەبەست پاساوی رەفتارە)

بەشداریەکانی مکیافیللی لە هزری رۆژئاوایی

1- شۆرشی ئەقلی ئەوروپی
2- مکیافیللی و گلۆبالیزم
3- گلۆبالیزمی کۆمەڵ و رەوشت
4- مکیافیللی کۆمەلگای سڤیلی(مەدەنی)

مکیافیللی وەکو چاودێری رێنسانسی هونەری جەنگ

پەیوەندیی نێوان رێکخستنی سیاسی و رێکخستنی سەربازی

داگیر کردنی ئیتالیا لەلایەن فرەنساو سەرهەڵدانی جەنگی کت و پر

مکیافیللی و چاکسازی رێنما سەربازیەکانی ئیتالی

بونی هەمیشەیی هونەری جەنگ لە ناو نوسینەکانی مکیافیللیدا

گرنگی جەنگی دەرونی لای مکیافیللی

گیانی سەربازی بنچینەی هێزە

گرنگی رێکخستنی سوپا لە شەردا ، لای مکیافیللی

مکیافیللی لە کتێبی (هونەری جەنگ)دەبێتە مەرجەعێکی بنەرەتی

گرنگی ئەقل و زانست لە جەنگدا، لای مکیافیللی

مکیافیللیزم لە تەرازوی شەرعدا

لە نێوان مکیافیللی و کلیلە و دمنە دا

مکیافیللی و تەرتوش

مکیافیللی و مۆسۆلینی

ئەوانەی بەرگری لە مکیافیللی دەکەن

دەسەلاتدارە مکیافیللیستەکان

یەکەی سیانزە /ئەرکەکانی میر بەرانبەر بە سەربازە شەرکەرەکان
یەکەی چواردەهەم /قسە لەسەر ستایش ولۆمەیی کردنی پیاوان
یەکەی پانزەهەم/ لە سەر دەستکراوەیی ورەزیلی(چاوچنۆکی)
یەکەی شانزەهەم/ لەسەر توندو تیژی و نیانی، جیاوازیش لە نێوان خۆشەویستی و ترسی خەلک بۆ میر
یەکەی حەڤدەم / وەفاداری میرەکان چۆن دەبێ ؟
یەکەی هەژدەهەم /خۆپاراستن لە رق و کینە
یەکەی نۆزدەهەم/ سودو زیانەکانی قەلا سەربازیەکان
یەکەی بیستەم / چۆن میر ناوبانگ دەردەکا ؟
یەکەی بیست و یەکەم / وەزیرو نهێنی پاراستن
یەکەی بیست ودووەم / پەراوێز خستنی ماستاوچیەکان
یەکەی بیست و سێیەم/ میرە ئیتالیەکان بۆ میرنشینەکانی خۆیان لەدەستدا ؟
یەکەی بیست و چوارەم / بەخت و مرۆڤ
یەکەی بیست و پێنجەم / رزگارکردنی ئیتالیا لە دەستی بەربەرە بێگانەکان
سوپاس و پێزانین

سوپاس و پێزانین

بۆ هاوسەرم کە هاوکارو هاوسۆزم بوو لە بە ئەنجام گەیاندنی ئەم کتێبە